بەرهەمە ئەدەبییەکان

زنجیرەی (9)

# «دیوانی شیعر»

# محەمەد ساڵح دیلان





ئامادەکردن و لێکدانەوەی پەراوێز نووسین و پێشەکی

**دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین**

چاپی دووەم

**پوختە و زیاد کراوە**

هەولێر - کوردستان

دیوانی شیعر

# محەمەد ساڵح دیلان

ئامادەکردن و لێکدانەوەی پەراوێز و نووسینی پێشەکی

**دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین**

چاپی دووەم: پوختە و زیادکراوە

٢٠١٣

هەولێر – کوردستان

**بەرهەمە ئەدەبیەکان**

**زنجیرەی (٩)**

ناوی کتێب : دیوانی شیعر محەمەد سالح دیلان

بابەت : شیعر

ئامادەکردن و لێکدانەوەی پەراوێز و نووسینی پێشەکی: دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

نەخشەسازی : نووسینگەی هیوا

چاپ : چاپخانەی **چوارچرا**

چاپی دووەم، هەولێر / ٢٠١٣

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارەی سپاردنی ( ١٨٢٩ )ی ساڵی (٢٠١٣)ی دراوەتێ**

# محەمەد سالّح دیلانی شاعیر
# و
# ئەزمونی شیعریی نوێی خۆی



لە کاتژمێری ٤,٥ی سەر لە ئێوارەی رۆژی ١٩٨٣/٩/٢٩

لە کۆڕێکی ئەدەبیدا لە بارەگای یەکێتیی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی



عەبدوڵڵا ئاگرین        ١٩٨٣/٩/٢٩        محەمەد سالّح دیلان

# دوا شیعری دیلان

ئەی ژیلەمۆی فرمێسکی سەر گۆنای لۆچ
لە کێ پرسین خوێن هەڵمژین تاکەی؟ بۆچ؟
مـن مـەلێ بـووم بەڵێن فریـوی سـەردار بـووم
گــوڵ بــژێری بــەهاری ســەر چــنار بــووم
خۆشـخوانێ بــووم وەکــو بولبــولی بــەرەڵا
گوڵلـــەی کینـــە بەدوامـــەوە تـــێم ئـــاڵا
هــــەتا دارێ لــــە ناو باخــــا گــــوڵ بــــەربێ
خــوێنی مــن و هاوڕێی منــی لەســەربێ
سنگ شـەقارین لۆچـی روومـەت داکـەوتووین
گوڵ سوتاوین پشکۆی باخین هەر سوتووین[1]

***



(1) ئەمـە دوا شـیعری دیلانـی شـاعیرە لـەرۆژی چـوار شـەممە ١٩٩٠/٩/٢٨ بۆکۆچـکردی جوانەمەرگ سەردار کەمال مەولوی هۆنیوەتەوە.

# پێشەکی چاپی دووەمی
# دیوانی "شیعر"ی محەمەد ساڵح دیلان

عاشقانی شیعر و شەیدایانی بیری ناسك و هەستی بەسۆز و هەڵوێستی کوردانە و جوامێرانەی شاعیری بەهرەدار و هەڵکەوتووی کورد "دیلان" دەمێکە بەعەزرەتەوەن چاپی دووەمی دیوانەکە دیدە و دەروونیان رۆشنکاتەوە تاکو چێژی ئەدەبی و بزواندنی هەستی کوردایەتی شاعیر، دەمەزەردی بیرەوەریە سەربەرزەکان و یادەوەرییە تایبەتیەکانی بکەن. خاوەن زەوقی سەلیم و ئەوانەی پەرۆشن بەرەو گزنگی جوان و تیشکی خۆر بچن و ویژدانیان ئاسودەبکەن و روحی پاکیان لەبەردەم شنەی ئاوازی دەگمەنی ئاهەنگە سروشتی و رەسەنەکانی شیعری دیلاندا ماندوێتی رۆحی و جەسەدیان .. بحەوێنەوە، چاوەڕوانی سەرجەم شیعرەکانبن. ئەز بەوپەڕی نەوازش و شانازییەوە، بەختەوەری خۆم لەوەدا بینیوە داخوازی ئەو ئازیزانە بەم چەپکە گوڵە بەهارییەی شیعرەکانی دیلان بەدیبێنم، وەك ئەرکی سەرشانم و قەرزێکی پیرۆز ئەو داخوازیە بەشادییەوە جێبەجێبکەم .

ئەم چاپی دووەمەی "دیوانی شیعر"ە بریتییە لە سەرجەم ئەو شیعرانەی لە دووتوێی چاپی یەکەمدان و بە میوانی ئەو شیعرە ناوازە و

هەست و نەست بزوێنانەی ، بەرچاپی یەکەم نەکەوتن.. سا بەهەر هۆیەکەوە بووبێت، بەوەی سانسۆر مقەستی تیژی سەربڕینی ئازادی تیا بەکارهێنا یان بەو هۆیەی ئەو شیعرانە لەو ساتەدا دەستمان پێیان نەگەیشتوە، جگە لەچەند شیعرێکی نوێی دیلانی هەستناسك کە دوای چاپکردنی دیوانی شیعر لەدایکبوون وەك شیعری "ئازارشکێن". ئەبێت ئەو راستیەش بخرێتە روو و لەبەرچاو بگیرێت و بوترێت: هێشتا ناتوانرێ بوترێت: ئەمە سەرجەمی شیعرەکانی "دیلان"ن بەڵکو ئەشێت لە ئایندەدا لێرە یاخود لەوێ یان لەپێچی پریاسکەی لەبیرچوونەوەدا مەلأسدرابێت و هەندێك چوارین، کۆپلە و قەسیدەی شیعری دی هەبن و دەست ئێمە نەکەوتبن.

"دیلانی شاعیر" بەهەڵوێستی نیشتمانی و جوامێرانەی کردەیی لە شیعرەکانیدا باجی هەستی نەتەوەپەروەری و بەرگری لەخاك و نەتەوەی کورد داوە و لە لایەن دوژمنانی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستانەوە دوچاری راوەدونان و بەندکردن و ئەشکەنجەدان بووە .. شیعری "رەز" شایەتحاڵی ئەو راستییەیە و بیری پاك و ناسکی کوردانە و هەڵوێستی نەترسانەی شاعیر ئەسەلمێنێ. هیوادارم بەم بەخششە نەوازشانەی شیعری دیلان کە لێواو لێوە لە ئاوازی هەست بزوێن و ئاشنابوون بە وشەی مۆسیقی و زاراوەی نوێ .. چونکە زمانە شیعرێکەی دیلان بۆخۆی تەقینەوەی شۆڕشێکی زمانی نوێیە و خاوەن فەرهەنگێکی نوێی وشەی کوردییە بەوەش دڵ و دەروون و دیدی خوێنەری دڵسۆزی کورد و شەیدایانی شیعر و ئەدەبی ئارام و شاد و

رۆشـنکردۆتەوە .. مزگێنــی دیارییــەکی دڵخۆشـکەری بەنــەوەی نــوێی هۆشـیار و راچــەنیوی کـورد بەخـشیوە بەتایبــەت بـۆ ئــەو قوتابیــە جگەرسـۆزانەمان کـە بنیـاتی ئاینـدەی گـەش و درەوشـەداری کـورد و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانیان لە ئەستۆدایە.

ئەم دەقە شیعریانە ئەشێت لەلایەن ئەدیبان بەگشتی و بەتایبـەت قوتابیـانی کۆلێـژ وخوێنـدنی بـالاّ و توێـژەرە زانـستیەکان بـۆ " باسـی دەرچوون، نامەی ماستەر و دکتۆرا" سودی لێ وەربگرن و لەسـەرکەوتن و بە ئامانج گەیشتنیان هاریکاریان بێت. بەو مەبەستەی ئامـانجی بـیری بەرز و ناسکی کوردانە و هەڵوێستی مرۆڤانـەی کـورد لای هـەموان و لـە روانگـەی ئـەم شـیعرانەوە بـەدیبێت ئـەم چـاپە پوختـە و سەرچـنەمان پێشکەشکرد .

سەرکەتووبن ....

**دکتۆر عەبدوڵلاّ ئاگرین**

**هەولێر ـ زانکۆی سەلاحەدین**

**٢١ ـ ٣ ـ ٢٠١٣**



له راستەوە: مەلا ئەسعەدی مەلا خالدی مەحوی – مەلا خالدی مەحوی –
مەلا عەزیزی مەلا خالدی مەحوی



له راستەوە : کاك فایەقی سەعۆلی خەلفە کەریم – کاك حاجی دەروێشی قەساب
ک- اك کەریمی ئەحمەدی هۆمەر

# رووکردنەوەيەك

## ديلانم چۆن ناسی؟
## بيرەوەرييەکی پيرۆز لەسەر تابلۆدا

پـايزێکی درەنگـەوەختی سـاڵی ١٩٥٦، قـەدەرێك بەسـەر کۆچـی دوايی کەڵە پياوی جگەرسۆزی کورد شـێخ مـەحموود تێپـەڕيبوو، شـێخ لەگـەڵ باپيرمـا ﴿ مـەلا خالـدی مـەحوی ﴾ برايـەتی و دۆسـتايەتيەکی دێرينی منداڵيان هەبوو.

لـەو پـايزە درەنگـەی شـاری سـلێمانی و لەشـەوێکی تاريـك و دەيجووری دەم گەردەلوولی پيرە رەشەبا بەناوبانگەکەی شار، باپيرم لەباڵەخانە گڵينەکەی ماڵی ﴿مـەحوی﴾ باوکيـان بـوو کـە لـە تەنيـشت خانەقاکەيەوەيە.

(ديـلان) و کـاك فايـەقی کـاك سـەعيد (فايـەقی سـەعۆلی خەليفـە کـەريم) و خوالێخـۆش بـوو (حـاجی دەروێـشی قەساب)و کـاك کـەريمی ئەحمەدی هۆمەر، لەگەڵ خوالێخۆش بووی باوکم (عەزيزی مـەلا خالـدی مەحوی) کە ئەميش دۆستايەتی و برايەتی لەگەڵ کاك (محەممـەد سـاڵح ديلان)دا بەهێز بوو، لەو دانشتنەدا ((سۆران مـەحوی)) عومـەر عـەزيزی برام ئامادە بوو. هەر هەموويان لەخزمەت باپيرما ئامادەبوون ... منيش لەو تەمەنی منالی يەی خۆماو لەسەر دەستوور و نەرێتی باوانم ئامادەی

خزمەت کردنی میوانەکان بووم ... لەو ساتەدا و تەنیا بەلای منەوە یەکێ لە میوانەکان کە ﴿دیلان﴾ بوو.. یەکەمجار بوو ئەمبینی ، لە لاوە ناو و نیشانی کاری ئەو میوانەم لە باوکم پرسی ... بەئاسپایی وەلامی دامەوە ، کەدوایی لەهەموو شتێکم حاڵی ئەکات.

باپیرم بەهۆی نەخۆشی لەرزۆکی (بایەری)یەوە بە گۆچان نەبوایە خۆی بەپێوە نەئەگرت لەبەر ئەوە لە شوێنی خۆی بەگران ئەبزوا ، کەچی لەگەڵ ئەوەشا تا ماڵئاوایی لەژیان کرد مێشك و دڵی بەهێز بوو، چاوی لەکارو بینایی نەکەوتبوو ... ئەو ئێوارەیە لەلای خواری ژوورەکەوە دانیشتبوون... بەڵام دڵشاد و بەختەوەر بوون ، چونکە ئەوەی باپیرمی دیبێ و هاموشۆی کردبێ و لەگەڵیا ژیابێ، ئەو دەم راستی یە ئەدات کەلە بەردەم ژن و پیاو ، گەورەو بچوك، دەوڵەمەندو هەژاران چوون یەك بووە و بەدەم و پلێکی رێکوپێکی خۆش و پڕ لەرێزو نەوازشەوە بەپیریانەوە چووە، بۆیە یاد و بیرەوەری لەمێشك و دڵی ئەوانەدا ناسرێتەوە کە تەنانەت بۆ جارێکیش دیدەنیان کردووە.. ئەویش هەمیشە لەو دۆستانەی ئەپرسییەوە و هەواڵی ئەپرسین.. هەر بەپێی ئەم نەریتەی خۆی پەنجەی بۆ ﴿دیلان﴾ راداشت و رووی کردە باوکم و پرسی:

– کوڕم عەزیز... بەخزمەت ئەم برایانە نەگەیشتووم ؟ باوکیشم وەلامی دایەوە:

– ئەمە کاك محەممەد ساڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی دیلانە.

ئیتر خۆش هاتنێکی گەرمی (دیلان) ی کرد و بیرەوەری و

دۆستایەتی و خۆشەویستی نێوانیان زیاتر چەکەرەی کرد.. باپیرم دڵخۆشی خۆی بەوەچاخڕونی مەلا ئەحمەدی دیلان دەربڕی.

دوای ئەوەی کەمێك لەبارو دۆخی ئاڵۆزاوی ژیان دووان، برینی جگەربڕو کۆستی گرانی کۆچی دوایی شێخ خەمێکی گران و خەست بوو. ئالەم دەمەدا باپیرم بەکوڵ دایە پرمەی گریان و بەدەم هەنسك هەڵدانەوە ئەم بەیتە شیعرەی(مەحوی) بەئیقاعێکی شارەزایانە خوێندەوە:

**بەپیری مەرگەوە فرسەخ بە فرسەخ رۆیون مەردان**

**ئەوی باکی لە مردن بێ دیارە بڵح و نامەردە.**

دوای ئەوە فەرمووی:

پیاوی مەرد هەگیز سڵی لەمردن نەکردۆتەوە بەلام ئەو جۆرە وەفاتەی شێخ مەحموود داخ و کەسەرێکی گەورەی بەجەرگما نا ..

(دیلان) و باوکم هەردوو ئاوەڵەکەی دیار بوو بەنیازێکی تایبەت ئەو دیدەنییەیان رەخساند بوو، من ساتێ لەپەنا باوکمەوە بەپێوە وەستابووم هەستم بەوەکرد کە حاجی دەروێش سەیرێکی( دیلان)ی کرد و رووی کردە باپیرم:

– مامۆستا بفەرموو ئەم شیعرەی کاك حمە صاڵح دیلان ببیستە کە بۆ کۆچی دوایی شێخی وتووە...(دیلان)یش بەئیقاعێکی مۆسیقی و شارەزایانە شیعرەکەی بەم جۆرە دەست پێ کرد کەسەرەتای یەکەم بەیت و چەند شابەیتێکیم تا ئێستا لەیادەو تەلی هەست و هۆشم ئەبزوێنێ :

پایز..خەزانی تەماوی و سەنگە
گەلا لق و پۆپ خونچە بە ژەنگە
لەکێ بپرسین سۆراخی راستی
دیارە نزیکتر هەر بەرانانە

بەرانان دەخیل دراوسێی دڵسۆز
ئێستە ئەو بەرت کێی لامیوانە..؟

هەواڵێ پرسە لەداری کەلی
شێخ لەوێ ماوە یا لە سەیوانە..؟؟

ئێستە سێبەری سەر جەستەی کفنی
هەتاوی سوورە یا ئەرخەوانی؟

دیلان ئەو قەسیدەیەی ئەخوێنەوە هۆن هۆن فرمێسك بە روومەتە چرچەکانی باپیرما ئەهاتە خوارێ و سەری ئەلەقا و بە گەروویەکی پڕەوە:

— ئەی ئافەرم.

دوای خوێندنەوەو تەواوکردنی قەسیدەکە باپیرم دەم و دەست رووی کردە (دیلان) و فەرمووی:

— تائێستا تۆم بەهۆی باوکتەوە ویستوە، ئێستاو دوای ئەم زرنگی و لێهاتوویی و دڵسۆزیەت باوکتم بەهۆی تۆوە ئەوێت.

ئەو شەوی پایزی خەزانەی ١٩٥٦ یاد و بیرەوەرییەکەی هەمیشە زیندووەو لە تەختی مێشکما نەخشی هەڵکەنراوە، منیش لەو ساوە

(دیلان)م لا دڵسۆز و خۆشەویست و گەورەیە.. چونکە(دیلان) گۆرانی عەشق و جگەرسۆزی بۆ خاك و نەتەوەکەی و مرۆڤایەتی ئەڵێ.

- رۆژگار تێئەپەڕی و بەدەم مەینەتی و چەرمەسەریەکانی ژیانەوە خۆی پێچایەوە. رۆژهات و چوو. تیشکی شۆڕشی چواردەی تەمموزی ١٩٥٨ چاوی کونەپەپووی شەڕو کۆنەپەرستی کوێر کرد و هەتاوی ئازادی گزنگەکەی بەسەر خاکی عێراقی کورد و عەرەبا پەخش کرد... لەو رۆژانەدا واتە رۆژانی سالأنی ١٩٥٨_١٩٥٩ ، ئێمە لەشاری سولەیمانیا تینووی وشەیەك بووین کە بۆوبەرامەی ناوی خاك و نەتەوەکەمانی لێوە بێت و وێڵی تاسە شکاندنی ئەو عەشقە پیرۆزە بووین کە بۆ جاری دووەم بە دیدەنی (دیلان) شاد بوومەوە، ئەمجارەیان منیش لەو تەمەنە سەرەتاییەی ژیانما لەگەڵ (دیلان) لە تروسکەیەکی پیرۆزی زۆر کزی ئەو شەوە دەیجوورەیا، لەگەڵ کوڕوکاڵانی جوامێری گەڕەکی چوارباغ و بەرخانەقا لە نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩دا لە تووی مەلیك لەنزیکترەوە ناسیم، ئەمجارەیان دیلانم لەسەر ترۆپکی هەرەبەرزی خۆشەویستی خاك و یادە پیرۆزەکانی خۆمانا دیەوە!!..

ئاهەنگی رۆژی نەورۆز ئەگێڕین .. رژێمی (قاسم) بەلالووتەوە ئاوڕ لەکورد و ئەوجۆرە جەژنە نەتەوەییانە ئەداتەوەو تەنانەت تەگەرە لەبەردەم یادکردنەوەیان دائەنێ و تەقەلای سەرکوت کردنی هەستی نەتەوەیی ئەدات.. دیارەو گومان لەوەدا نییە گەورەیی و دەسەڵاتی میللەت گەورەترە لە قاسم و هەموو ئەو جۆرە تەقەلایانەی دژی میللەت

ئەدرێ.

هەر ئەو رۆژە لەتووی مەلیك یادی نەورۆز كرایەوە ، بەلام ئەو یادكردنەوەیە كەف و كوڵ و جۆش و خرۆشی كوڕ و كاڵانی چوارباغ و بەرخانەقای دانەمركانەوە ، بۆیە ئێمە لەگەڵ دەستە كوڕانی شار ئەوەندەی بۆ ئەو رۆژە بلوێ لەگەڵ (دیلان)دا یەكمان گرتەوە.. سات دەمە دەمی عەسر بوو ، نمە نمە بارانی بەهار دەنكە مرواریەكانی بەسەرمانا داكردبوو ، هەر دوای ئەو ئاهەنگگێرانە كەدەنگ و رەنگی جەژنی نەورۆزی كوردی سەلمان و چەسپان.

خەڵكەكە لەتووی مەلیكەوە رووە و شار كشان و شەقامە خوارەكەی پێشیان لوول ئەدا و ئەپێچایەوە ، ئێمەش لەتەك (دیلان)ی شاعیرو بەجەرگا یەكانگیر بووین ، لەسەرەتاو ، لەشێوەی سروود و مارسیزمی كوردا ، نەورۆزەكەی پیرەمێردی ئەخوێندەوە و ئێمەش لەدوایەوە ، لەگەڵ ئەوەی دڵۆپی دەنكە بارانەكە گەورەترو بەتاوتر ئەباری حیرسی ئێمەش زیاتر ئەكولا.. (دیلان) تا بەردەركی سەرا شیعری سرودی نەورۆزە بەناوبانگەكەی خۆی بەئیقاعێكی شیعری ئەخوێنەوە و ئێمەش لەگەڵیا بۆمان ئەسەنەوە .. دوا كۆپلەی ئەو سرودە بەم جۆرە بوو:

وا نەورۆزە جەژنی گەلە
ئاسۆ رازاوەی دەم كەلە

بانەورۆز و بەهاری كورد
پێگەیێنین بەدەست و برد

ـ دوای ئەو یاد و بەیەك گەیشتنە پیرۆزەی دووەم جار ، ئیتر دەرفەت و ڕێکەوت یارمەتی بەدیدار شادبوونی (دیلان)م بۆ نەڕەخسا .. منێك قوتابی ئامادەیی و دواتر لە بەغا ئەمخوێندو (دیلان)یش لە ململانێی ژیانی شارا ئەژیا، تا سالآنی حەفتا...

خوێندنم تەواو کرد بوو ، رووم کردەوە شار ...لەو ساتەدا بەگەرمی هاموشۆی کتێبخانەی گشتیم ئەکرد ، ئەمجارەیان لەگەڵ کتێبە هاوڕێکانما ، لەنزیك و نزیکترەوە ئاشنایەتی و دۆستایەتیم لەگەڵ (دیلان)دا بەتینتر بوو ، خۆشەویستیەکەی لام گەورەتر بوو ، لەنزیکەوە " لەناخی راستی و دڵسۆزیەکەی گەیشتم و مەنزڵێکی تایبەتی لام پەیدا کرد .. لەساتی ئەو هاموشۆیەدا جار و بار بەئارامی و دڵنیاییەکی تەواوەوە بەگشتی لە دنیای ئەدەبی کوردی و تایبەتی لە شیعرەکانی (مەحوی) ئەدواین و (دیلان) راستگۆیانەو بەوپەڕی پاکێتی و دڵسۆزیەوە باری سەرنج و بۆچوونی ئەدەبیانەی خۆی لەمەڕ خودی (مەحوی) و شیعرەکانی دەرئەبڕی و بەم جۆرە بۆی چووە :(... لەساڵی ١٩٤٣ و بەرەو ژوور تا پاش ١٩٥٤ بەهۆی ئەو پەیوەندیە خێزانییەی کەهەمان بوو لەگەڵ بنەماڵەی موفتی دا) زۆربەی کاتەکانی رۆژم لە خزمەت مامۆستای گەورە خوالێخۆش بوو (بێخودا) ئەبردەسەر .گفت و گۆی ئەم شاعیرە نەمرە ، دەروونی فراوانی ، نوکتەو وشە خۆشەکانی مرۆڤی واگیرۆدە ئەکرد ، کە هەرگیز نەتوانی تاوێ لێی دوور بکەوێتەوە.

خۆکە ئەهاتە سەر باسی شیعر و شیکردنەوەی ماناکانی ئەوە

هەروەك_مەحوی_ئەفەرموێ :(لەکن پشکوتنی خونچە دەمی وەك گوڵ سەراسەر گوێم) منیش هەموو ئەندامم ئەبوو بەگوێ!...

لەوکاتەدا بیروڕای مامۆستا (بێخود)م لەلا دەرهەق شیعرو ئەدەب بێ (موناقەشە) بوو چی بفەرموایە جێگای ورتەش ) نەبوو..

لەبەر ئەوە ... ئەو بیروڕایەی کەئەیدا بەرامبەر بەشیعری (مەحوی) بەجۆرێ کاری تێکردبوو جێگای هەڵوەشاندن و هەڵتەکاندنی نەمابوە.

بۆیە ئەوسا بیروڕام بەرامبەر بەشیعری (مەحوی) وابوو: (رەق و زۆر خۆخەریك کردنی ئەوێ تا ساغی ئەکەیتەوە) ... بەڵام ... پاش ئەوەی چەردەیە شارەزاییم پەیدا کرد لەزمانی "کوردی و عەرەبی و فارسی"دا کەوتمە خوێندنەوە کەئەمەش ماوەی دەساڵێك ئەخایەنێ ، بۆم دەرکەوت کە(مەحوی) یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی کورد ... یەکێکە لە (شاعیرە گەورەکانی سەدەی نۆزدەو بیستی کورد) کەبە گەشەدارترین چەرخ ئەژمێردرێ لەمێژووی نەتەوەی کوردا چ لەبارەی (گەورەیی) شیعری کوردا هەر لە(حاجی) یەوە بگرە تا(سالم و نالی و کوردی) ...١٩٧٣.

هەر لەو هاموشۆکردنەی (دیلان)دا و لەساڵانی حەفتا بەدواوە کەڵکەڵەی ئەوەم کەوتە سەرەوە کەلەگەڵ شیعرەکانی (دیلان)دا بژیم ... شەیدای واتاو دەستی هونەروەری بووم .. بۆیە دەرفەت بەختەوەری کردم و پێشەکی بەرکولی کۆمەڵێ شیعری (دیلان)م بەناوی (پایزی جاران)ەوە نووسی .. لەڕاستیا ئەو چەند وشەیەی لەو

پێشەکیەدا نووسیومە تەنیا بەڕوونکردنەوەو ئاشنابوونی دنیای شیعری (دیلانی) دائەنێم و شێوەی لێکۆڵینەوەی شیعری لەئامێز نەگرتووە ، ئەگەرچی تائێستا تەواوی ئەو پێشەکیە بە شانازیەکی گەورە و سەربلندییەکی هەمیشەیی ئەزانم و خۆمی پێوە بائەدەم ... لەویا وتوومە : (..... بەلام بەداخەوە کاتی داوای ئەم نووسینەی لێکردم کە (پایزی جاران) بەهەڵە داوان رووە و چاپخانە ملی ئەنا ، ماوەو کاتەکەش هێندە کەم بوو کەناتوانم ئەم چەند دێرە نووسینەم لەشێوەی روونکردنەوەیەك بەولاوە بترازێ .. بەم نیازەی رازی دڵی پەنگخواردووم لەدوو تۆی نانێکی گەرما هەڵگرم بۆ کاتێکی تر ، ئەگەر دەرفەتێکی باش رەخسا لێیان بدوێم.

بەڵێ ئابەو جۆرە کارونی شیعری (پایزی جاران)م بەڕێ کردو دۆستایەتی هەمیشەییم لەگەڵ هونەروەری و شیعری (دیلان)دا بەهێزتر بوو، چونکە لای من شیعرەکانی داهێنانی نوێی شیعری کوردین بۆیە لام خۆشەویست و گەورەتر ئەبێ.. دیارە نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کەپەیوەندی بنەماڵەی (دیلان) و (مەحوی) هەر لە باوانەوە بۆمان ماوەتەوە.

*****

**عەبدوڵلا ئاگرین**

**سلیمانی - ١٩٨٦/٧/١٤**

# بەسەر کردنەوەیەك

هـەروەك لەسـەرەتاو پێـشەکی دیـوانی (کامـەران مـوکری)دا روونم کردەوە ، باکەمێك گوێ شلکەین بۆ چرپە بەنرخەکـەی مـەلا نەجمـەدین کە ویـردی سـەرزمانی بـوو ، هەمیـشە ئـەیووت و ئەیووتـەوە : (بـامردو پەرستی حازر کوژ نەبین).

چەندە شادی و کەیف خۆشی یە ، مرۆڤ تالـە ژیانـا مـاوە قـەدر و رێزی شیاوی خۆی بزانێ ... هـەر لەبـەر ئـەوە بـۆ دیـوانی شـیعرەکانی (کامەران موکری) هـەوڵی کۆکردنـەوەی تێکـرایم لـە بەرگێکـدا بـۆ چـاپ ئامـادەم کـرد ... رۆژنامـەو گۆڤارەکـانی، ئـەو سـەردەمەم پـشکنی کـە(کامـەران) شـیعری تیـا بڵاوکردونەتـەوە و لەگـەڵ شـیعری نـاو دیوانـەکانی و لـەناوخۆیانا بـەوردی و هێمنـی بـەراوردم کردوونەتـەوە و پەراوێزم بۆ هەندێ زاراوە یـان بەیتـە شـیعر دانـاوە ، ئەوسـا سـەرەتاو لێکۆڵینەوەیـەکی شـیاوم بـۆ نووسـی و دوای رەزامەنـدی (ڕەقابـەی) چاپەمەنی پێشکەشم بەخۆی کردەوە....

ئـەوەی کردوومـە هـیچ بەچـاوادانەوەدا نییـە و مـن هـەرگیز نـاڵێم چاکەم لەگەڵ کردووە، چونکە ئەوەی من هەرگیز بەقەرەی ئەو خزمەتە

گەورەیەی (کامەران) ناگات کە بارمبەر زمان و ئەدەبی کوردی کردوویەتی ... هەر لەو روانگەیەوە ئەڵێم : رەنجەکەم بەفیڕۆ نەڕۆیشتووە و نەك لێ ی پەشیمان نیم بەڵکو یەکێکە لەو کارە ئەدەبیانەی هەمیشە شانازی پێوە ئەکەم.

سەبارەت بەشیعرەکانی (دیلان)یش مەبەستم لەو شیعرانەیە کەتا نووسینی ئەم چەند دێڕە بڵاوکراونەتەوە سائەوە چ لە رۆژنامەو گۆڤارا بوبێت یا لە دیوانە چاپکروەکانیا ، هەموویانم کۆکردۆتەوەو ئامادەم کردوون ، دیارە بەم کارە خۆم زۆر بەسەربەرز و بەختەوەر ئەزانم کە شەرەفی ئامادەکردن و نووسینی پێشەکی و لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی (دیلان)م پێ براو زیاد لەوەش بەختەوەرم کەتا ئەدیب و رۆشنبیر و کەڵە پیاوە مەردەکانمان لەژیانا ماون دەستی رێزیان بۆ بەسنگەوە بگیرێ و بەچاوی خۆیان قەدرزانینیان لە ژیانا ببینن و دیدەیان پێ رۆشن بێتەوە.... بۆ ئەم بەرهەمە شیعریانەی(دیلان)وام بەچاك زانی" هەردوو پێشەکی دیوانی (دیلان و پایزی جاران) بە ئەمانەتەوە لەدوو توێی ئەم چاپە نوێیەی بەرهەمە شیعریەکانیان بپارێزم...

**عەبدۆڵلا ئاگرین**

## وتەیەکی پێویست:

راستە شاعیر مرۆڤێکی ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتییە و لە ئەستێرەیەکی نامۆوە نەهاتۆتە خوارێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا (ئەدیب و رۆشنبیر _ زانا و فەیلەسوف) بەتایبەتی ئەدیب لەبواری ژیانی خودی خۆیا لە هەموو روویەکی ژیانەوە ..(هەست ناسکی ، بیروڕای قوڵ و ورد ، بەهرەی داهێنان و سەلیقەی تێر ....تادوایی) تیاشك ئەبرێ و بەچاوی مرۆڤێکی ئاساییەوە سەیری ناکرێ ، بەڵکو بەپێی بەرهەمەکەی شوێن و مەنزڵگای لەناو نەتەوەکەی خۆی و میللەتانی دنیایا بۆ تەرخان ئەکرێ بەقسەی رووت و قوتی پف هەڵدراویش نەهیچ مرۆڤێك رووە و حەوتەبەقەی ئاسمان بەرز ئەکرێتەوەو نەبە تیر و تەشەر و پلار و توانجیش مرۆڤی گەورە لەچاڵی بیرچوونەوەدا دەنگی کپ ئەکرێ و ژیانی دیزە بە دەرخونە ئەکرێ ئەو بۆچوونە بمانەوێ یا نەمانەوێ لەق و لەنگ ناکرێ و هەڵناوەشێتەوە.

بەهرەو لێهاتووی (دیلان) لەسەرەتای ژیانی ئەدەبیەوە دەرکەوتووە ، تەنانەت یەکەم هەنگاوی (دیلان) لەم بوارەدا سەرنجی شاعیری نیشتمان پەروەری کورد بێکەسی بەلای خۆیا راکێشاوە ، ئەوەتا (دیلان) لەمانگی مارتی ١٩٤٨ هەوڵ و تەقەلای ئەدەبی خۆی لەمەڕ بواری شیعریا پیشانی بێکەس ئەیا و ئەم شیعرەی ئەداتە دەست کەبە ناونیشانی (سکالایەکی کورت)ەوەیەو بەم جۆرەیە:

مـــنم بەدەســـتی چـــەرخەوە ، وا گێـــژ ئـــەخۆم و ئـــەڕۆم
مـــنم کـــە بوومـــە خوێنـــەخۆر ، خـــوێنی خـــۆم ئـــەخۆم

مــــنم لەبـــــەحری خــــەیاڵاتی بـــێ وچـــانی ماتـــــەما
هــەر پــەل ئــەگێرم نەکــەڵك و نــە _ ســوود_و علاجــە بــۆم

زامــدارە بولبــول و لــە دەوری گــوڵ ئــەکا رەقــس و ســەما
بە کەیلی ئەشکی سوور و سوێر و ئەسەف دەست و چاو ئەشۆم

بێکەس لەخوێنـدەوەی شـیعرەکە ئەبێتـەوەو لێـی ئەپرسـێ: ئەمـە هـی کێیە ؟

وەڵامی ئەداتەوە: شیعری خۆمە.

بێکەس ئەڵێ: شتی وانی یە.

(دیلان) وەڵامی ئەداتەوە: ئەڵێم شیعری خۆمە..!

شــایەتی بێکەســی شــاعیر بــۆ ئــەو شــیعرە ســەرەتاییەی ژیــانی ئــەدەبی(دیــلان) لەهــەر دوو رووی هونــەری و ناوەرۆکــەوە بەڵگــەی لێهاتوویی و بەهرەی شیعری (دیلان) نیشان ئەدا.

شاعیرێتی (دیلان) هەر لەخۆوە نەهاتۆتە کایەوە ، بەڵکو گەلێ هۆ و هــەل و مــەرجی شــیاوی بـۆ رەخـساوە و لـەبار و دۆخێکـی تایبــەتیا زەمینەیەکی لەباری بۆ گونجاوە و لەلایەك ژیانی ئەدەبی و رۆشنبیری و

خێزانیی بەتایبەت باوکی لەم رووەوە وەك رۆشنبیرێکی سەردەمەکەی خۆی دەورێکی باڵای لە شاعیرێتی (دیلان)ی کوڕیا بینیووە، خوالێخۆش بوو مەلا ئەحمەدی دیلان یەکێکی خوێنەواری شیعر دۆستی ، شیعر زانی بەجۆرێك بووە کە زۆربەی مەلا خوێنەوارەکانی ئەوسای سولەیمانی ئەگەر شیعرێکی فارسیان لێ (بەهەڵە) یان (بەقینا) بچوایە روون نەبوایە لایان ، ئەهاتن بۆی و ئەو بۆی روون ئەکردنەوە.

(دیلان) زیرەکانە کەڵکی لە شارەزایی و ژیانی رۆشنبیری باوکی وەرگرتووە و لەپێناوی عەشقە پیرۆزەکەی ناخی دەرونیا گۆشی کردوەو خەملاندویەتی باوکی بە راوێژدانەر و دەرس دادەر و مامۆستایەکی وانەی ژیانی ئەدەبی خۆی داناوە..

چونکە وای لێ کردووە شیعری خۆش بوێ (.... مەلا ئەحمەدی دیلانی باوکم راوێژ کەرێکم بوو، بۆ روون کەرەوەیەکم بوو ، داران و دەستێکم بوو ، بۆئەوەی کە بتوانم لەم رێبازەدا شیعرم خۆش بوێ ، شیعر بڵێم ، شیعر بکەم بەوەی لەجیاتی نووسین هەتا رادەی دوور شیعر بڵاوبکەمەوە .....)

ئەمەو سەرەڕای ژیانی سیاسی سەردەمەکەی خۆی چاو و رووی شاعیری کردۆتەوە کە راستەوخۆ بە بزوتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانییەوە بەستراوەو ئاسۆی فیکری شاعیری فراوان کردوە ، چونکە هەرلە سەرەتای ژیانیەوە پێی وابووە کەئەبێت شیعرو بەرهەمی ئەدەبی راستەوخۆ لەخزمەت بزوتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانیا بێت .... هەر بۆیە (( دیلان)) دەنگی رەسەنی شیعری نوێی کوردیە و

خاوەنی کەسایەتی و بەهرەی شیعری خۆیەتی و کاروانی وشەی شیعرەکانی ناخی راستی ئەم بۆچوونەم رۆشن و یەك والاّ ئەکاتەوە.

بەلای منەوە سەردەم و سالانی دوای جەنگی جیهانی دووەم و تێکشکانی و چۆك دادانی بەرەی شەڕخوازی نازیەت لە ئەلّمانیا و فاشستیەت لە ئیتالیا . لەبەردەم هێزو ئیرادەی میللەتانا، کاری گەورەیان لەسەر بیروباوەڕی شاعیر کردوە، بەتایبەتی ئەو دەم و ساتەی بزوتنەوەی نەتەوەیی و نیشتمانی لە ولاّتەکەمانا لە هەلّچوون و گەشەکردن و گوڕو هێزی سروشتی خۆیا بوو ، دەستەو یەخە دژی رژێمی پاشایەتی کۆنەپەرست و ئەلّقە لەگوێیەکانی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا بەتایبەت ئیمپریالیزمی (( بەریتانیا و ئەمەریکا )) وەستا ... ئەو بارو دۆخە تەواو ئاسۆ و هۆشی روناکبیرانی فراوان کردبوو دیارە (( دیلان)) لە حالّ و بارێکی ئاوایا کە رۆلّە نیشتمانپەروەرەکانی ولاّت خوێنیان قولّپ ئەدا پێویستە ئەدەبێکی ریالیزمی شۆڕشگێڕانەی نەتەوەیی لەسەر دەستی یەکێکی وەك (( دیلان )) بڕسکێ و رەسەنایەتی خۆی بسەلمێنێ و رۆلّی گرنگی خۆیی و ئەرکی سەرشانی بەجێبێنێ و ئاوێنەی بالاّنمای راستی سەردەمەکەی بێت و جەربەزانە شایەتی خۆی بدا....

شاعیر قالّبووی دەرد و دوو ، ژان و سوێی نەتەوەکەیەتی ، تێرمۆمەترێکی راستەقینەی ناخی رووداو و کارەساتەکانی سەردەمە ، خۆی لەناخۆشی گەلەکەی دوورە پەرێز نەگرتووە و لەو سنوورەش ئەترازێ کەتەنیا (چاودێری) وردی بارو دۆخ بکا و راستەوخۆ لە

خۆشکردنی ئـەو زەمینەیـەی گـەرەکێتی هاوبەشـی ئـەکا و بـەزمانێکی تەڕو پاراوی کوردانە هونەروەری شیعر خۆی ئەنوێنێ:

ئـەی هەورەکـە .. داڕێـژە سـەری تـشرینە
وادەی پەڵـە و ناشـتنی تـەرمی هاوینـە

نـۆرەی تۆیـە بگـری بەسـەر هـەموومانا
بەسـەر ئێـسك و پروسـكی رابردومانـا

بیـشۆرەوە بـا سـەر لـەدەس دیـاری بـێ
با قوڕ خەست بێ بۆ سەری شـەرمەزاری بـێ

لـەو کۆپلـە شـیعرەدا مرۆڤـ حـەیرانی ئـەو ئـاوازە مۆسـیقییەی شیعرەکە ئەبێ کە چۆن لەڕووی سەلیقەی ورد و هەستی ناسك و روانی زمان و گونجانی هێزی وشەکان و پێکهاتنی بەیتە شیعریەکەوە هەست بەوە ئـەکرێ چ دەسـتێکی هونـەروەری هـەرە بـەرزی شـیعری سـازی کـردوە و رسـکانویەتی ... مەگـەر ئەمـە تـەنیا لـە ((دیـلان))ێـك بوەشێتەوە.

بەلای منەوە ناوەڕۆکی ئەو کۆپلەیە بەشێکە لە شاکاری شیعری(( راپەڕین)) کە (( دیلان )) لە سەرەتای ژیانی هـەرزەیی و ئاسـاییەوە تـا ژیـانی کـاملی ئـەدەبی و نیـشتمانی لـە سـالانی ١٩٤٣ بـەرەو ژوورەوە تامـەزرۆ و پـەرۆشـی بـووە .. ئـەو شیعرە بـا لـە رووی تەمـەنی ژیـانی

شیعری شاعیرەوە درەنگ لەدایك بوبێت ، بەڵام دڵنیام کەپایەیەکی بەرزی لە خانەی هۆشیارکردنەوەی گەلا بینیوە و ئەبینێ .. ئەوەتا لە شیعری (( رەن))دا بەشێکی رەنگدانەوەی قۆناغێکی تری ژیانی (( دیلان)) لە واقیعی سەردەمەکەیەوە هەڵێنجاوە و بەم جۆرە روومان تێئەکات:

**ئـــەی داری مـــەمك پـــڕ لـــە شـــیلەی ئـــاڵ**
**کۆرپـــــەی مێـــشکی برســـی شـــیری تـــاڵ**
**گـــرێزە بـــۆ یـــەك مـــژ و یـــەك دڵـــۆپ**
**بـــۆ شـــەوی خـــەیاڵ ببـــێ بـــەگڵۆپ**

**ڕۆشـــن کـــا دونیـــای هەســـتی مـــن هـــەر وەك**
**چـــرایە بـــۆ نـــاو (بیرێکـــی) نوتـــەك!..**

بیری رووناکی پێشکەوتوخوازی(( دیلان)) لەئاکامی ئەو بار و ژیانە نالەبارەوە هاتووە کە ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی جیهانی دروستیان کردوە لەساتی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم تەواو رەنگی داوەتەوە و ئەنجامە نامرۆڤانەکەشی دوای تەواو بوونی جەنگەکان سەری هەڵداوە، کەدەیان نەتەوەی زەبوون و چەوساوەی ژێر چەپۆکی ئاغا شەڕفرۆشەکان بەنیازی ئەوەی ئاواتیان بێتەدی ، لەناو گڕی تەنووری ئەو شەڕە تۆقێنەرەیا کراونەتە سووتەمەنی و نێڵە نێڵی گڕەکەیان پێخۆش کردوە، کەچی ئاکام لە بریتی ئەوەی لەلایەن ئەو دەوڵەتە گەورانەی شەڕەکەیان بەرپاکرد ... پاداشتی خەبات و باجی ئەو خوێنە

رژاوانە بدەنەوە کە لە پێناوی سەرفرازی و یەکگرتنەوەی نەتەوە و خاکەکەیانا رشتبوویان، لە لایەن ئیمپریالیزمی نوێی جیهانیەوە بە جۆرێکی ترو لە بەرگێکی جیاوازا ئەو نەتەوە ژێردەستانە چەوسێنراونەتەوە.

ئیمپریالیزمی ئاغا لە رێگای کۆمەڵێ نۆکەرو بەکرێگیراوی خۆیانەوە ئاکامی مەبەستەکەیان بەجێهێنا و ستەمیان لەو نەتەوانە کردوە و سامانیان بەتالآن بردوون و دژی رۆڵە بەجەرگەکانیان وەستاونەتەوە، هەروەك چۆن ئیمپریالیزمی ئینگلیزی لە رێگای رژێمی کۆنەپەرستی پاشایەتییەوە دژی مرۆڤێکی کوردپەرستی وەك شێخ مەحموود وەستایەوە و مرۆڤی ساویلکەیان هان ئەدا لەکەداری بکەن و بەگژ ئەو (مەجدە) هەرە پیرۆزەی کوردا بچن و بەڵگە بدەنە دەست نەیاری بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بۆ بەگژا چوونی. ئەوە بوو تەنانەت نەك هەر بەزیندوویی ئازار و ئەشکەنجەی گیانی و جەستەیان ئەدا بەڵکو لەو کاتەی تەرمەکەشیان بۆشاری سولەیمانی سەربەرز هێنایەوە، گوللەباران کرا .. ((دیلان)) دەروونی شیعری بۆ ئەو کەڵە پیاوەی کورد ئەهەژێنێ:

بەرانان دیارە قورگت گیراوە
چاوت لیخنی خوری گریانە

سەرت چەپۆکی کۆچی بێ وادەی
شێخ خولی داوە سستی فغانە

بـــــەڵام ... بـــــەرانان گـــــوێم لێ راگـــــرە
مــــن کــــوردم کــــوردیش گەلــــە ، ئینــــسانە
هـــــەزار ئەوەنــــــدە بخرێتــــــە بینــــــی
دەســــــتی گــــــەردوون و چــــنگی زەمانــــــە
کــــورد شــــۆڕە ســــواری وەك شــــێخی بووبــــێ
ســــــەر نــــــەوی ناکــــــا لــــــەبۆ بێگانــــــە

شاعیر هۆشیارانە هەستی بەمەسەلەو خەمە گەورەکەی کردوە .... شێخ کەڵە پیاوێکی ئەوەنە بەجەرگ بوو هەمیشە سەربڵند ژیاوە و عیزەتی نەفسی بەرز بووە ، تاکۆچی ماڵئاوایی کرد سەری بۆ بێگانە نەوی نەکرد .. ئەمە لە کاتێکدا تەنیا (سووکە مەرحەبا یان لایەکی لێ بکردنایە و روویەکی خۆشی بدانایێ ) تاجی مەلیکی لەناوچەکەیا چەسپاو بوو .. بەڵام شێخ هەرگیز بە پەرێزی بەخشینەوە و پاداشتی سەرشۆرانەی بێگانەیا نەچوو ، بێزی لەو جۆرە هەڵوێستانە ئەهاتەوە.
(( دیلان)) ئیحای شیعرەکانی لە گەوهەری بێ چاوو راوی خەون و خەم و ئاواتی نەتەوەکەیەوە هەڵئەهێنجێ ، هەرشتێ دژ بەو خواستانە بوو بێت ، ئەم بەتوندی بەگژیا ئەچێ و ئەوەنەی پێی بکرێ سەرکوتی ئەکا .. دیارە خەون و خەفەت و هیوای ((دیلان )) خەونی پەرت و بڵاوی خۆزگەو یادگاری لەدەست دەرچووی شاعیرە رۆمانسیەکانی قۆناغی دەرەبەگایەتی ئەوروپا نییە .. بۆیە لێرەیا ئەمەوێ کەمێك لەو بیروڕا لنگەو قوچ کراوانەی لەمەڕ بابەتی بواری (( رۆمانسیەت))

بەچەواشەیی دەربڕاوە لێیان بدوێم و بە قەناعەتەوە چەنم بۆ بکرێ لەشوێنی شیاوی خۆی بیگێرسێنمەوە! ..

ئێستا بووە بە باو وەك سەمەرەی (( پێشکەوتن خوان))ێکە وشە و زاراوەی ((رۆمانسیەت)) بەتەشەرو پلار و توانجی هەست روشانن بەکاردێت و تەنانەت گەلێ جار مرۆڤی رۆشنبیر و هۆشمەنی کورد خۆی لائەدا بەو بیانووەی گوایە ئێستا لەوێنەی لەکەیەکی نەنگی بەتەوێلی شاعیرا ئەنووسێنرێ .. ئەوەی گوایە شاعیری رۆمانسیەتی کوردیش بەزمی شاعیرە رۆمانسیەکانی ئەوروپایان لێ بەسەر هاتووە.

دیارە لای شارەزایانی بزوتنەوەی ئەدەبی تەواو چۆنیەتی و هاتنەکایە و دروستبوونی قوتابخانە ئەدەبییەکانی ئەوروپا ئاشکرایە و روون و پێویست بە پیاچوونەوە ناکا ، کە دوای قوتابخانەو رێبازی ئەدەبی کلاسیکی ، ئەدەبی رۆمانسی لە بارودۆخێکی دیار و تایبەتیا سەری دەرهێنا .. ئەم بەرهەمە ئەدەبییە تازەیە ئەوسا هەر لە سەرەتاوە هەوڵی ئەوەی دا تەنگ بە قوتابخانەکەی بەر لەخۆی هەڵچنێ ، بەڵکو بتوانێ جێی ئەو بگرێتەوە ، ئەمەش دیاردەیەکی سەیر و سەمەرە نی یە و یاسایەکی سروشتییە و بێ چەندو چۆنە و ئەبێت هەر دیاردەو هەنگاوێکی نوێ کەگیانی ململانێی تیا پەیدابووبێت و بڕیاری بەربەرەکانێی هاوچاخەکانی خۆی دابێ ، پێویستە توانایەکی بەهێزترو گوڕ و تەوژمێکی تونتری هەبێ و کۆمەڵێ هۆ و ئاکامی نوێی باشتر و لەبارتری پێ بێت تا هیچ نەبێ هەر زوو بەلێدانی بایەخی سەر رووی زەمین جوانەمەرگ نەبێ ... بەڵێ ئەو بارودۆخەی ئەدەبی

رۆمانسیەتی ئەورووپا سەری تیا هەڵدا تەواو بەپلەو قۆناغەکانی (پەرەپێدان و گۆڕانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی )یەوە بەسترا بوو ... هەر ئەو قۆناغ و پلە مێژووی پەرەپێدان و گۆڕانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەو بەرهەمە ئەدەبییەی هێنایەکایەوە.

بەڵێ ئەدەبی کلاسیکی لە سەردەمی قۆناغی دەرەبەگایەتیا بەو شێوەیەی خۆی چوزەرەی دەکرد و چینی دەرەبەگی ئەورووپا لە قۆناغە گەشەکەی خۆیا بەشی هەرە زۆری نەتەوەکە (جوتیار و پاڵە و وەرزێر) بوون ئەچەوسێنرانەوە و ئەو دەرەبەگانە بەری رەنجی چەوساوەکانیان بەفیڕۆ و تالاّن ئەبرد.

ئالەو ساتەدا ئەدەبی رۆمانسیەت لەسەر دەستی ئەدیبە بلیمەتەکان لەدایکبوو، دیارە ئەو ئەدەبە (ڕۆمانسیەت) لە رووی ناوەرۆکەوە هەر پێ بەپێی حەتمیەتی (( پەرەپێدان و گۆڕان ))ی قۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتی لە قۆناغی دەرەبەگەوە بۆ قۆناغی سەرمایەداری .. ئا لەو ساتەدا شاعیری ئەو قۆناغە شیعرەکانی رەنگانەوەی واقیع و بار و دۆخی ژیانەکەی بووە .. هانی جەماوەریان ئەدا بۆ هەڵتەکانی رژێمی رزیوی دەرەبەگایەتی کە دژ بەخواستی گەلەو لە شوێن ئەو پێشوازی قۆناغی نوێ بکەن (قۆناغی سەرمایەداری شار _ بۆرژاوا) کە گوایە ئەمان مافی گەل ئەبەخشن کەچی هەر لەگەڵ رمانی قۆناغی دەرەبەگایەتی و هاتنی قۆناغی سەرمایەداری و بۆرژوا نەك هەر باری شانی رۆڵە چەوساوەکانی نەتەوە سوك و ئاسان نەبوو ، بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاتر لە جاری جاران کۆڵ و باری زەبوونی و زوڵم

و ستەم و چەوسانەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی چەندین جار قەبەتر و گرانتر ئەبوو...

دیارە ئەم حاڵەتە بەلای ئەو شاعیرانەی گفتی بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی بەختیار و سەربەستیان بەگەل دابوو ، وا دەرنەچوو ، لەبەر ئەوە رووبەرووی واقیعێکی ئێجگار تاڵ و نالەبار بوونەوە ، تەنانەت روویان نەیە سەریان لەناو خەڵکەکەدا بەرزکەنەوە.

هەر بۆیە لەئاکامی ئەو کۆست کەوتنە فیکرییە و تێکۆشانە سەختەی مەیدانی کردەیی ، پاشەکشەیان لە خەڵکەکە کرد و پشتیان تێکردن ... بەو نیاز و مەبەستەی خۆیان لەو خەمە گەورەو ئەندێشە سەختە چاوەڕوان نەکراوە بدزنەوە روویان لە دنیای زاڵی خودی خۆیان کرد و لەباوەشی سروشت و جوانییەکەیا ئارام و لەنگەریان گرت!!..

هەر بەو شێوەیە ، باڵی نائومێدی و بەرچاو تاریکی فزەو تقەی لێ برین پرزەیان نەما ... بۆیە ئێستا شاعیری رۆمانسیەتی ئەو سەردەمە دیاری کراوە زەینیان بەهەڵە دائەنرێ و لەئاکامیشا خۆیان لەبارو دۆخێکی بێئۆقرەیی و ئالۆزی دەروونییا بینیەوە و نائومێدی و فرمێسك رشتن ، ئاخ و ئۆف هەڵکێشان و پەنا بۆ خەیاڵ و ئاواتی لەدەست دەرچوویان پیشەو هەڵوێستی ژیانی دواییان بوو .. ئا ئەوە

حاڵی شاعیرە رۆمانسییەکانی سەردەمی رووخانی رژێمی دەرەبەگایەتی و هاتنە کایەی رژێمی سەرمایەداری ئەورووپا بوو ، ئاخۆ ئەشێ ئەو لێکدانەوەیە بەچاویلکەی سیاسی ئەمڕۆ کێشانەو پێوانە بکرێ ؟.. بۆیە حوکم و بڕیاردان بۆئەو پێوانەو کێشانە کۆنە نەك هەر

بۆ ئێستا کارێکی زانستانەو دروست نیە ، بەڵکو بۆ سەردەمی قۆناغی سەرمایەداریش نیشانەی مەبەستە دروستەکە ناپێکی و سەرئەکا یانیش ژێر ئەکا.

چونکە هەرگیز ناشیٚ بۆ قوتابخانە و قۆناغە ئەدەبیەکان بەزۆرە ملیٚ ئەو جۆرە بیروڕا دیکتاتۆریانە بسەپێنریٚ و خۆ گەر پەناش بۆ ئەو حوکمە ناڕەوایانەش ببریٚ ئەوا زوڵم بەرامبەر مێژو ئەکریٚ و راستیش لنگەو قوچ هەڵئەواسریٚ.

بۆیە ئەپرسم : ئاخۆ بارودۆخی شاعیرانی رۆمانسی کورد بەهەمان قۆناغا تێپەڕیوە تا خەوش و لەکە و عەیب و عاری شاعیرانی رۆمانسی ئەو قۆناغە دیاری کراوەی مێژووی ئەوروپایان بەسەرا بسەپێنن ؟ ...

نەخێر بەلای منەوە ئەوانەی بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەدەبەکەمانا ئەکەن و هەڵوێستی وا ئەنوێنن تەنیا مەبەستیان ئەوەیە چاوبەست لە جەماوەر بکەن و لە خەسڵەت و هەل و مەرجەکانی ئەو ئەدەبە بەرزەی ئێستا بیانسڵەمێنەوە و لە جەماوەر دوورە پەرێز رایانگرن و لەبۆو بەرامەی خاك و سروشتی نەتەوە بێبەشیان بکەن.

دیارە ئەوانەی هەڵوێستی ئاوا نابەجیٚ و دوور لە تیووری زانستی و پێشکەوتوخوازی ئەنوێنن گەرەکیانە شاعیری رەسەن و جوامێر سەرکوێر بکەن لە دوایشا (( سەرەو ژێری )) پیٚ بکەن و لەو لاشەوە جەماوەر بەهەڵەیا بەرن.

کەچی هەست ئەکەین ((دیلان)) بە پێچەوانەی چاو و راوی ناڕەوا و تێك شکێنەری ئەوانەی بەئانقەست خۆیان لەڕاستی لائەدەن ، شینی

خۆشەویستی بۆ هەموو بەهایەکی بەنرخ و جوانی سروشت خاکەکەی ئەکات..

لەشیعری ((شیوەن))دا هەستی ناسکی دەروونی وەك پوورە هەنگێکی وروژاو باوەش بەسروشتی خاکەکەیا ئەکا ، بەڵکو لەباوەشی گەرم و نەرمی سروشتی خاکەکەیا گۆرانی عاشقێکی جگەرسۆز بۆ خاك و سروشتەکەی ئەڵێ .. بەڵام ئاخۆ عەشقی ((دیلان )) لە دەریای فرمێسك و هەنسك هەڵدان و گریانا نوقم بووە؟، وەك شاعیرە رۆمانسییەکانی سەردەمی روخاننی رژێمی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپا چونیەکن؟... ئەوانێك دوای ئەو نوشستییە دووچاری نائومێدی هەرەس هێنان بوون و ئەدەبەکەشیان رەنگدانەوەی ژیانەکەیان بوو .. ئاخۆ (( دیلان ))یش وایە؟،.. نەخێر بەلای منەوە گەر بەچەپەری ئەو جۆرە بیرەڕا ناقۆڵا و حوکمی وانابەجێیا بچین ئەوا چاوبەست لە خۆمان ئەکەین و جەماوەریش هەڵئەخەڵە تێنین و ستەمێکی ترسناکیش بەرامبەر بەشاعیرو شیعرەکەی ئەکەین.

((دیلان )) لەو شیعرەی کە ناونیشانێکی خەستی رۆمانسیانەی بۆ هەڵبژاردووە ، بەرەنگاری ئەو حوکمە ستەم دیدەیە بۆتەوە کەئێستا لە شاعیری کورد ئەکرێ.

ئەو گوڵانەی دەشت و کێوانە بەرەو سامانی دڵ

رەنگی ئاڵی هەڵمژیوە سەر هەتا دامانی دڵ

شاعیر لە باوەشی سروشتی خاکەکەیا خۆی ئەبینێتەوە بەڵکو ئەو لەناو سروشتی کوردستانا و سروشتی کوردستانیش لەناو شیعرەکەیا یەك تەواوکەری ئەوی تریانن .. ئەمە نەك بەو مەبەستەی لە دنیای خەیاڵات و یادگاری رابوردوو و هیوای لەدەست دەرچوویان شل و خاو و سڕ و بێجوڵە بێت ، بەڵکو گەشەیەکی تەواوی بەدنیای ئەدەبی ریالیزمی شۆڕشگێرانەی نەتەوەیی داوە و نەتەوە و خاکەکەی بەو بابەتە شیعرییەوە خۆشەویست ئەکات:

**ئەرخەوان سوورە ، شەڕابی کۆنی خوێنی چێشتوە**
**بۆیە (( یاقووتە )) هەموو بەردێکی گۆڕستانی دڵ**

سەیرکەن بزانن شاعیر چ ئیلهامێکی بەهێز و پێز و پیرۆزی لەخاکی نیشتمانەکەیەوە بۆ هاتوە، ئەئاوا وێنەیەکی شیعری جوان و ناسکی لە بەهرەیەکی زگماکی چاك و سەلیقەیەکی ورد و قووڵی هونەری خۆی بۆ پێك هێناوین ، ئەرخەوان ، نیشانەیەکی پیرۆزە نەك هەر لەلای دانیشتوانی شاری سولەیمانی بەڵکو شوێنێکی مەزن و گەورەی لای هەموو کوردێکی بەشەرەف و سەربەرز هەیە ، نیشانەو نموونەی خوێنی بەجەرگترین و جگەرسۆزترین رۆڵەی ئەم خاکەیە..

دڵنیام ئەم وێنە شیعرییە بەرزە کە تۆوی پیرۆزترین بیروڕای نەتەوەیی و مرۆڤپەرستی لەمێشکی خوێنەر و بیسەرەکەیا ئەچێنێ ، بۆیە لەلای ((دیلان)) سروشت و جوانیەکەی خاکی نیشتمان هەروا بەسادەو

ساکاری مامەڵەی لەتەکا نەکراوە، بۆ ئەو نیازە نیە وەختی پێ ببرێتەسەر ، چونکە جوانی سروشتی خاکی نیشتمان تەنیا بۆ جوانیەکەی نیە و بەس لای ((شاعیر )) جوانی و دیمەنی رەنگین و دڵفرێنی خاکی نشتمان لە لایەن خاوەنەکەیەوە بە ئازادی ئەبینرێ هەرگیز دڵی پێخۆش ناکرێت:

**دەك نمەك گیربی بەهار وەك ئەو گوڵەت زوو هەڵوەران**
**خۆت لەبەر پێدا بنێژە کوشتنە دەرمانی دڵ.**

((دیلان)) قاڵبووی خەبات و بەسەرهاتە سەختەکان و تاقی کردنەوە تاڵ و ترشەکانی ژیانی نەتەوەکەی خۆیەتی و هەر لەو بنارەوە هەنگاوی رووە و هەڵکشانی چیا سەرکەشەکانی شیعر و دنیای ئەدەب ناوە ، بۆیە هەرگیز ناتوانین و ناشێ واتای گوزارە و زاراوەی رۆمانسیەتی ئەوروپایی سەردەمی گواستنەوەی قۆناغی دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری بەسەر شاعیرانی کوردا بسەپێنین ، چونکە لە راستیا ئەدەبی کوردیش وەك بار و دۆخی قۆناغە سیاسیەکەی بەو دوو قۆناغە کامڵ و تەواوەی (( دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری )) ئەوروپایا تێنەپەریوە .. ئیتر (گەزی چی و جاوی چی)؟...!

***

# دیلان و عەشقێکی پیرۆز

شیعرەکانی ((دیلان)) پشکۆی داگیرساون ، سۆز و خۆشەویستی خاك و نیشتمانەکەی ئەوینێکی بێوێنەی پاکێتییەتی ، هەرلە ئاسۆی بەختەوەری ، سەرفرازی نەتەوەکەیەوە ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوە ژێردەست و چەوساوەکانی دنیا ئەبینێ و بەشیعر و کردەوە هەڵوێستی خۆی بەرامبەر مێژوو تۆمار ئەکا ، ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و بەرەی شەڕخوازی لەهەر لایەکی دنیایا بێت بەیەك چاو و چونیەك تەماشا ئەکات.

شاعیر شیعرەکانی وەك چەکێکی گوشندە ئاڕاستەی سەرسنگی شەڕخواز و چەوسێنەر و داگیرکەرانی دنیا ئەکات.

سالانی ١٩٥٤ کە وڵاتەکەمان لەلایەن رژێمێکی کۆنەپەرستی سەربە ئیمپریالیزمی رۆژئاواوە حوکم ئەکرا ((دیلان)) بەستەی نەبەزین و ئازادی بۆ ((گواتیمالا)) ئەڵێ و هەستی مرۆڤی کورد بەرامبەر بزوتنەوەی ئازادیخوازانی دنیا دەرئەبڕێ:

ئەو وڵاتە هەرچەن دوورە
بەڵام ئێجگار پشت ئەستوورە

سا ئیمڕۆ بێ یاخود سبەی
کەچاوەی(ڕق) هاتەوە پەی

لەبن هەرداری ، بن بەردێ
لەسەر هەر هەردەیێ ، وەردێ

گولانی به خوێن ئاودراو
ملانی به دارا کراو

ئەو (پرشنگە) دێننەوە ، جۆش
ئەکەونە جۆشش و خرۆش

منیش لەم خاکە دیلەوە
بەدەم ئاوازی زیلەوە

ئەڵێم نیشتمانی خەڵکی
خێر و بێر و فەڕ و کەڵکی

ئەبێ بۆ خەڵکەکانی بێ
بەری بۆ رەنجی شانی بێ

دەروونی شیعری((دیلان)) بورکانێکی ئاگرینە و تائێستا هەر کڵپە ئەسێنێ ، ئەوەتا دیسان بە هەمان بیروڕای پتەوی گیانی کوردپەروەرانەی خۆیەوە ئاوێتە و تێکەڵی دەریای گیانی مرۆڤایەتی ئەبێ ... لەساڵانی ١٩٦٠ هاوبەشی تێکۆشانی گەلی ((کۆنغۆ)) ئەکات ... جەربەزەیی و جوامێری ((لۆمۆمبا)) وەك نیشانەی تێکۆشانێکی سەخت و پیرۆزی گەلێکی ژێردەست و چەوساوە دەرئەخات ... لە کوردستانەوە ئەچریکێنێ:

ئــــەی لۆمۆمبـــای هـــەموو گـــەلان
ئێمــــەش لــــە خـــاکی کوردســـتان
ئەتکـــەین بـــە بەســـتەی ســـەر زمـــان
ئەتکـەین بەپەیکـەرێکی بـەرز بـۆ تێکۆشـان
بــــــۆ... رزگــــــار بــــــوون
بــۆ... بەگــژ داگیرکــەرا چــوون... !!...

بەلای منەوە (دیلان) هەموو گەوهەری ئەو بابەتانەی هەڵیبژاردون وەك (تۆ) و (هەوین)ێك بـە جـەرگی شـیعرەکانیا وەشـاندویەتی " ئاکـامێکی بـەهێز و گـەش و رۆڵێکـی دیـاریکراوی لـە مەیانـدنی داهێنـانی نـوێی شیعرەکانا بینیوە و پـەیتا پـەیتا بـەرەوپێش بردویـەتی و هـەرگیز لـە شوێنی خۆی نەوەستاوە ، بەڵکو هەمیشە (دیـلان) لـەدنیای داهێنـانی نــوێی بــواری ئــەدەب و رۆشــنبیری دوورەپــەرێز نــەبووە و خــۆی پێگەیاندوە ، ئەوەش بەکاروانی شیعری (دیـلان)ەوە دیـار و ئاشـکرایە هەر بۆیەش شیعرەکانی بەوێنەی ناسـك و جـوان و شـێوەیەکی بـەرزی هونەرمەندانە خەملاندوە .... رۆژ لەدوای رۆژ هەنگاوی بەرەو لوتکـەی بەرزتر ناوەو ئەنێ و ئاسۆی بیری فراوان و قوڵتر و لەبارتر ئەبێ.

(دیلان) لەهاوبەشی کردنی تێکۆشـانی گـەلانی ژێردەسـتەو چەوسـاوەی دنیا پەشیمان و بێدەنگ نـی یە ، بـەڵکو بـە شـێوەیەکە کـە هەمیـشە سوورە لەسەر بیروباوەڕی مرۆڤانـەی خـۆی .. سـاڵی ١٩٧٣ بـە هـەمان سۆز و کوڵ و عەشقەکەی جارانیەوە و بەبڕوایەکی بەهێزو پتـەوترەوە و بەناونیشانی (بەربەرەکانی)یەوە کانی بـەهرە و هونـەری لـە هەڵوێـستی

نوێدا دەرئەخات.

(بەربەرەکانی) نیشانەی راستگۆیی (دیلان)ی شاعیر ئەسەلمێنێ و ئەوەتا لە ئەندێشەی نەتەوە ژێردەست و چەوساوەکانی دنیا ئەدوێ.

(دیلان) کە بەگژ داگیرکەر و ئیمپریالیزم و چەوسێنەرەکانی دنیایا ئەچێ ، ئەو دیاردە رەسەنە لەشیعرەکانیا بەڵگەی ئەوپەڕی راستی و دروستی هەڵوێستی نەتەوەکەی بەرامبەر میللەتان دەرئەخات.

بەوەی کورد نەتەوەیەکی ئازادیخواز و ئاشتی ویستە و دروشمی هەرە بەرزو پیرۆزی دۆستایەتی و برایەتی هەموو نەتەوەکانی سەرزەمینە لەسەر بنچینەیەکی راست و دوور لە هەموو جۆرە چەوسانەوەیەك شیعری (بەربەرەکانی)ی کڵپەی بورکانێکی ئاگرینە و لە جەستەی زاڵم و ستەمکار و چەوسێنەر بەر ئەبێ..

شیعری (بەربەرەکانی)ی لەگەڵ ئەو ناوەرۆکە مرۆڤانە بە هێزەی هەیەتی لە هەمان ساتا لە قاڵبێکی هونەری بەرزو ورد و ناسکا داڕێژراوە و پەنجەی شارەزایی و بلیمەتی (دیلان)ی پێوە دیارە:

لەو دەمەوە سووتووی (رۆما)ی سووتاو باری
کە باهێنای بۆ ئەم ناوە بە دیاری

کە .... پریشکی خوێنی زەردی (نەیرون) پژا
کە چەرمەکەی قرچ هەڵگەڕا ... لەدەم کەژا

بەشیرینی هە چ((گوڵێ)) (دەم) ئەکاتەوە
لەم ... وڵاتە... (فەرهاد)مان بیر ئەخاتەوە

(دیلان) لە ئازار و چەوسانەوەی میللەتانی دنیایا خۆی ئەبینێتەوە و ژان بەجەرگیا ئەچزێ ... دیاردەی کارەساتە جگەربڕەکانی وڵاتی خۆمانی ئەخاتەوە یاد...

(دیلان) لەڕێچکەی شیعرەکانیا ، رابوردوو و ئێستا بەداهاتووەوە گرێ ئەدا و مێژووی نەتەوەکەی فەرامۆش نەکردوە و ورد و قوڵ چاوی پیاگێڕاوە و بەتاقیکردنەوەیەکی چاکی دائەنێ و چاوگی بزوتنەوەی پێگەش و شەوقدار ئەکا و سامانی ئازادی پێدەوڵەمەند ئەکا.. داوا لە رۆڵەکانی ئەکا کە هۆشیار و وریابن و ئەوەبزانن کەدوژمن هەر دوژمنە ، ئەوەتا باسی دوژمنە خوێنخۆرە دێرینەکەی کورد ئەکا ، کەهەمیشە نەخشەی داو و پیلانی بۆ ناوینەتەوە....

سورفلی چاوشین نیشانەی پیرە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی لەساڵانی ١٨٢٠ ەوە ریچ و رۆژهەڵات ناسەکانی ئاوەڵی بە ناوی گەشت و گوزارەوە پێیان ناوەتە خاکی کوردستانەوە نەك بەبار بەڵکو بە گەورەترین و تازەترین ئامێر و ئامرازی داهێنانی نوێ کۆت و زنجیری مەینەتیان بۆ ئەم کوردە هێناوە.

لەو رۆژەوە ، لەو ساتەوە ، هەر لەو دەقیقەو کاتەوە
کەخوێنە خۆی دێرینەکەی ((کتێبەکەی)) ئەکاتەوە

لەو دەمەوە کە (ریچ) گەیشتە سەرچنار
تۆوی پیلان ، هی ژێردەستی بۆ ئەم هێنا بەبار

## دوژمنـــــی خوێنـــــەخوێی ئێمـــــە داگیرکـــــەرە
## (مـــام ئینگلیـــزە)   ئیمپریـــالیزم و نۆکـــەرە

(دیـــلان) هەمیـــشە دژی داگیرکـــەر و نۆکـــەر و بـــەکرێگیراوەکانی وەستاوەتەوە و چەندەی پێیکرابێ پەردەی لەڕوو هەڵماڵیون و ریسوای کردون.

وشـەی شـیعرەکانی (دیـلان) پـشکۆی داگیرسـاوە و بـاری سـەرنج و هەڵوێستی ئازایانەی دەربڕەخا و کۆی لێنەکردونەتەوە.

(دیلان) هەڵوێستی خۆی بەرامبەر رژێمی شـای ئێرانـی کۆنەپەرسـت و ئیمپریـالیزمی ئەمـەریکا دەربـڕەخا کەچـۆن هەمیـشە قەڵاچـۆکردنی نەتەوەی کوردی لە کوردستانی ئێرانا داناوە و بەوپەڕی سەختی و هێز و توانایـەوە پـەلاماری رۆڵـە جگەرسـۆزەکانی کـوردی داوە ... سـاڵی ١٩٥٩ کاتێ حەمە رەزا شای پیاوی ئەمەریکا هێرشـی نـاڕەوای بۆسـەر دەسـتەیەك لـە رۆڵـەکانی نەتـەوەی کـورد بـرد و (غـەنی بلوریـان) و ئاوەڵەکانی گیرۆدەی داوی سەخت و سـتەمی رژێمـی ئێـران بـوون ... (دیلان) لـە ئاسـت ئـەو کـردارە ناهـەموارەیا دەسـتە پاچـە نەوەسـتاو هەڵوێستی خۆی نواند:

ئـــەی چـــوار ســـەری نـــاو زینـــدانی
کۆنـــــــە پەرســـــــتی ئێرانـــــــی

سەر زۆر پـــڕا
خوێن زۆر رژا

کەچی لەجێگەی هەر سەرێ
سەد سەری تر دێتە دەرێ

لە جێی هەر دڵۆپە خوێنێ
سەد گوڵ سەری دەرئەهێنێ..!

ئاسوودەبن ، زەبری زیندان
هەڵواسین و پەت و خنکان

تەوژمی خەبات لەق ناکا
هێزی تێکۆشان شەق ناکا

ئاسوودەبن بە کوشتن بێ وە یا مردن
ریشەی کورد قەد نایە لەبن

*****

# شیعر و رۆڵی هۆشیار کردنەوە

گەرچی شیعر لای شاعیری راستەقینە و رەسەن و بەهرەدار و بەتوانا و رۆشنبیر لەئاکامی ئاوێتە بوونی وروژانن و هەژاندنی لایەنەکانی (دەروونی) و کارەساتە کاریگەرەکانی ژیانی راستەقینەوە هەڵئەقوڵێ ، ئەمەش هەر لەخۆوە پێك نایەت و پێویستی بەچەند هەل و مەرج و رەگەزی تایبەتی و کەسایەتی دیاریکراو هەیە بۆ نموونە: (بارودۆخ وەك زەمینەی سەرهەڵدانی شیعرەکە دیاردەی تایبەتی و رِوداوی ئەوتۆ کەهەوێن و، کەرەسەی شیعرەکە پێك ئەهێنێ ، ئارەزوو و گۆش کردن و خەملأنیان وەك ئامێر و هۆی هاتنەکایەی شیعرەکە..) ئەمانە و سەرەڕای مەرجی بوونی : سۆز و خۆشەویستی و هەستی ناسك و سەلیقەی وردو بەهێزی و پاراوی زمان و پلەی بەرزی رۆشنبیری و شارەزای لایەنی هونەری شیعر و زانستە گشتیەکان و گەلێك هۆی تریش...

ئەو لایەنانەی باسم کردن هەر یەکەیان بەپێی پێویستی شوێن و کاتی تایبەتی خۆیان رۆڵی گرنگی هونەری شیعری ئەبینن و ئاکامیش لای هەریەکێ بەپێی ئاستی شارەزایی و پلەی رۆشنبیری و زەوقی چێژوەرگرتنی ئەدەبی بەجۆرێکی جیا و تایبەتی ئەکەوێتەوە و کاری کاریگەرانەی خۆی ئەبینێ و چەمك و لایەنێکی ئەو کاریگەری و کارتێکردنی شوێنەواری خۆی بەجێ ئەهێڵێ ... سا ئەوە لەڕووی وروژاندنی هەست و هۆشەوە بێت یان دەروون بهەژێنێ و خۆشەویستی هۆگری عەشقی بە بەهای دیمەنی دڵفڕێن و جوانی : (سروشت و رەوشت و ئافرەت) بچەسپێنێ با رۆڵی فێرکردن و پێگەیاندن و هۆشیارکردنەوەی ببینێ .

بەلای منەوە شیعرەکانی (دیلان) لایەنە بەجێ و پەسند و سپییەکانی ئەو بوارانەی کە باسم کردن وەك رۆڵەیەکی جگەرگۆشەی شیرین و نازدار لەباوەش گرتوون ... شیعرەکانی دوو تۆی ئەم دیوانە هەمیشە لەبواری گۆشکردن و هۆشیار کردنەوەیا ئامادەی لەدایك بوونی نوێیە.

لەم کۆپلە شیعرەیا کە ساڵی ١٩٥٤ هۆنیویەتەوە هەست بەدنیای شەپۆڵی هۆشیاری و هۆشمەندی ئەکەین:

ئیمڕۆ خەڵکی خاوەن هۆشە
بۆ ئامانجی بەپەرۆشە
بۆ شتی ئەڵقە لە گۆشە
کە سەودای منیشە و تۆشە

شاعیر بەچاوی سوك و سەلیمەوە سەیری جەماوەری نەتەوەکەی ناکات ، بەڵکو پێی وایە لە هەموو گۆڕانکارییەکانی ناو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی جەماوەر رۆڵی گرنگ و سەرەکی ئەبینێ ، هەر بۆیە بەڕێز و نەوازشەوە دەنگی لە پاڵ دەنگیان دائەنێ و بەخاوەن هەست و نەستی ژیرانەیان ئەزانێ و بەوزە و توانایەکی هەمیشەو لەبن نەهاتوویان دائەنێ:

بەڵام .. پشکۆی ژێر خۆڵەمێش و ژیلە
گوێ هەڵخراوی دەنگی بەنگ و زیلە

ئەویان مەلاسی بای تۆڵەسەندن
ئەمیان چاوەڕێی خرۆشی هەستن

کەئـــــەو هـــــەڵیکرد ورد گەشــــایەوە
ئــــەمیان ئــــاوازی دەنگـــــی دایـــــەوە

ئەوســـا نـــۆرەی گـــورز ئەکەوێتـــە دەس
گـــەلی داخ لـــەدڵ بـــە بـــەزم و هـــەوەس

بـا وزە و توانایـەکی بـەهێزو لـەبن نـەهاتوو هـەبێت ، بـەڵام کەنـەتوانرێت بەباشـی و چـاکی شـیلەکەی بمـژرێ و گەوهەرەکـەی دەربهێنرێ چ کەڵکێی هەیە ؟.. بۆیە رۆڵی شیعر تەنیا لەچێژ وەرگـرتن و هەست بزواندنی لایەنە هونەرییەکەیا خۆی قەتیس ناکات ... بـەڵکو وەك باڵـدارێکی ئـازاد سـنوورە دەسـتکردەکان ئـەبڕێ ، ئەوسـا شـیعر رۆڵی کاریگەریی لەژیانا ئەبینێ.

(دیلان) لە شیعری (تروسکە)یا ئـەو مەبەسـتە پـیرۆزەی لێـی دوام بەئەنجام ئەگەیەنێ و لەهەردوو لایـەنی کاریگـەری و بـەرزی هونـەری و پتەوی و بەپێزی ناوەرۆکی شیعرەکەیا هەڵۆیەکی بڵندی سەر ترۆپکـی ئەدەبی کوردییە:

فرمـــان دارە :
دار بەری من و تۆیە
گەر نەگەڕێین لوتمان لەسەر ئەژنۆیە
کوڕنووش بردن:
یاسای دەوری کەوانە
کەی دیلێتی.. ئەنجامی کوردزمانە
کەی دـیلێتی:
بۆ میللەتان .. رەوایە ؟!

لە کوێ ژەهر بۆ نەخۆشی دەوایە ؟
ئەی تروسکە:
رووەو تۆ دێین بۆ شادی
ئینجیلمانە سووتاندن یا ئازادی

تازە لای (دیلان) ئەوە براوەتەوە و بڕوای وایە کەنەتەوەکەی لە پلەیەکی بەرزی هۆشیاریا ئەژی و لەئاستی رووداوەکانی سەردەمایە و لەڕووی پێگەیشتنەوە خەملیوە، بەسەرهاتە پڕ لەناسۆر و خەمە گەورەکانی دووتوێی کارەساتەکانی مێژووی دێرینمان سەرپشکی هەموو راستییەکە و پەندێکی ئەوتۆی داياون کەهەرگیز خۆ لەئاستی دیاردەو رووداوە مێژووییەکانا گێل نەکەن .. ئەوەتا لەکوردستانی ئێرانا جۆر و چۆنیەتی راپەڕینەکەی (کاوە) بەڕووی ئەژدەهاکی مێشکخۆرا ، پیرۆزترین داستانی جوامێرانەی بۆ کورد نەخشاندوە، قارەمانێتی ئەو راپەڕینە ئاوازی (لاووك)ە و لەچیا سەرکەشەکانی کوردستانی ئێرانەوە دەنگ ئەداتەوە و بەبەستەی سەربەرزی و سەرفرازی وەچەی داهاتوو ئەژمێردرێ:

لەو ساتەوە .. راست یا درۆ
کە مێشك و گۆشت .. بوون بەپشکۆ !
چزان .. بەچاوی (نووقاوی) ئەژدەهاکا
بوو بە (لاووك) لەسەر چیا و لەژێر خاکا
لەو ئەفسانەی ( مارکوشتنە) .. راست یان درۆ
ئەم وڵاتە (قوربانی) گرتۆتە ئەستۆ ! ...

*****

# (زمانی شیعری) دیلان

(دیلان) یەکێکە لەو تاك و تەرا شاعیرە هەڵکەوتوانەی خاوەنی وشەو فەرهەنگی تایبەتی خۆیەتی .. گەر دەست دانەگرم و ئەو مافەم پێ ڕەوا ببینرێ و سەربەستی ئەوەم هەبێ بڵێم : (دیلان) فەرهەنگێکی قوڵ و وردی زاراوە و وشە تایبەتییەکانی شار سولەیمانییە .. ئەمەش هەرگیز حسابی بیر تەسکی و ناوچەگەری و دوورە پەرێزی لە (گۆڤەر و دیالێکتە) جیا جیاکانی زمانی کوردی بۆ ناکرێ، بەڵکو هۆشیاری لە وشە هەڵبژاردن و شارەزایی قوڵی شێوەکەو شیرینی وشە و پڕواتایی لە جوانکاری و ڕەوانی لەگونجانی دەربڕین و ئاوێتەی وشە لەگەڵ مۆسیقاو ئیقاعی تایبەتی شیعرەکە ئەو هەڵوێستە ڕاستەی بەسەر (دیلان)نا سەپاندوە، دیارە دڵسۆزی (دیلان) لە پێناوی خزمەتی ڕاستەوخۆی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردیا وایلێ کردوە ئەو وشەو زاراوانە بەکاربێنێ و لەفەوتان بیانپارێزێت ... منیش لای خۆمەوە و لەو ڕوانگەیە و بەهەمان مەبەستی پیرۆزی خزمەت و دەوڵەمەند کردنی زمانی ئەدەبی یەکگرتووی ئێستای کورد و لەپێناوی ئەوەی سامانی زمانەکەمان زیاترو باشتر دەوڵەمەند بێت، لای خۆمەوە سەرجەم و ئەوەنەی لەتواناو دەستەڵاتما بوو بێت و دەرەقەتی هاتبم، سەبارەت بەشیعرەکانی ناو دووتۆی ئەم دیوانە، هەوڵی شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو زاراوانەم داوە کەلە شاری سولەیمانیا بەکاردێن و لەنزیك شیعرەکانەوە پەراوێزم بۆ داناون ... سا هەر لەو چەپەرەوە " ئەو ڕاستی یەش ئەدرکێنم کە (دیلان) وەك شاعیرێکی بلیمەت کەلێن و دەلاقەیەکی گەورەی شیعری لەدنیای ئەدەبی کوردیا پڕ نەکردۆتەوە و بەس ، بەڵکو لەڕووی تەڕ و پاراوی و ڕەوانی زمان و بەکارهێنانی وشە و

زاراوەی رەسەنا رۆڵێکی گەورەی بینیـوە و تائاسـت و ئەندازەیـەك ئـەو وشە و زاراوانە بەهەموو لایەکی وڵاتەکەمانا بڵاوبوونەتـەوە و چەسـپیون و جێـی خۆیـان گرتـووە و بۆتـە بـەردی بنـچینەیی (زمـانی ئـەدەبی یەکگرتووی کورد) تازە لـەوە دەرچـووە هـەوڵ و تەقـەلا بـۆ لەقانـدن و هەڵوەشاندنەوەی بدرێ ... بـەلای منـەوە هـەموو شـێوە هـەوڵێکی لـەو جۆرەبابەتانە ... راستەوخۆ ئیعلانی جەنگـە دژی ئـەو زمانـە ئەدەبییـە یەکگرتوویەی ئێستا کەتازە لە گاگۆڵێ کەوتووە و خـەریکی خەملاندنـە ... ئەو جـۆرە دژایەتیـەی زمـانی ئـەدەبی یـەکگرتووی ئێـستا لـەئاکاما زمانی کوردی دووکەرت ئەکات ، واتە هەوڵ و تەقەلای ئـەوەی ئەیـەوێ لەیەك ساتا هەردوو شێوەی کرمانجی (خـوارو و سـەروو) شـان بەشـانی یەك برۆن و وەك زمانی ئەدەبی بەکاربێن ، هـەنگاوێکی ترسـناك رووە و زمانەکەمان ئەنێن و کارەکەیان دووربێ یا نزیك ئاکامێکی خراپ بەسـەر نەتەوەی کوردا قلْپ ئەبێتەو بەپێوانەی شـاری سـولەیمانی بـردوە ... رۆشنبیری و شارەزایی (دیلان) جگەلە زمانەکەی خۆی لەزمانی عەرەبی و فارسیا ئەو شایەتییە ئـەدەن ... کەواتـە (دیـلان) نـەك پـەکی لەسـەر وشـــە نەکـــەوتووە ، بـــەڵکو بـــەهرەو توانـــای بـــەهێزی لـــە چـــۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو زاراوانەیا هەیەو هۆشـیارانە مامەڵـەیان لەگـەڵا ئـەکات، بـەجۆرێکی ئـەوتۆ داهێنـان و لـەدایك بـوونی نـوێ لـە شـیعری کوردیـا مسۆگەر بکات .. ئەمەی ئەیلێم لەخۆوە نیە و بەهیچ جۆرێکیش شاعیرم منەت بار نەکردوە .. چونکە هیچ نەبێ تاقیکردنـەوەی رۆژگـاری پـڕ لـە مەینـەت و چەرمەسـەرێی ژیـانی ئـەدەبی و رۆشـنبیری قـاڵی کـردووە و تەمـەنی بـەردەوامبوونی ژیـانی شـیعری تـا ئێـستا ئـەوە ئەسـەلمێنێ: پێویستی بە پیاهەڵدان و پاڵپێوەنان نییە ..!

# (دیلان) و هونەری شیعری

لەچەند شوێنێکی ئەو بابەتانەی سەبارەت بەشیعرو ژیانی شیعری (دیلان) دواوم " بیروڕام بەم جۆرە دەربڕیوەکە: (دیلان) شاعیرێکی لوتکە و بلیمەتی کوردە ، خاوەنی دەنگ و رەنگی تایبەتی شیعری خۆیەتی و هەر ئەو راستییەشە بە دڵنیاییەوە " ئەو قەناعەتەی لا دروست کردم کەشیعری (دیلان) وەك پێویستییەکی ژیانی ئەدەبی کوردی شوێنی خۆی گرتووە و کەلێن و دەلاقەیەکی تەواوی پڕ کردۆتەوە و شوێنی تایبەتی لەبزوتنەوەی شیعری نوێی کوردیا بۆ تەرخان کراوە ... پێشێلکردنی ئەو مافە رەوایەی (دیلان) ستەمە و لەئەدەبی کوردی ئەکرێ.

من ئەو حوکمە لە خۆمەوە نایەم و بەپێی لێکدانەوەیەکی ورد و قوڵی بێلایەنانە و لەبەر تیشکی راستی و تیووری زانستانە و بابەتیا، بەدڵنیایی و لەخۆڕازی بوونەوە ئەوە دووپات ئەکەمەوە کە : (دیلان) لەکاروانی شیعری نوێی کوردیا نەك هەر دوا نەکەوتووە ، بەڵکو پێ بەپێی تەمەنەکەی و ژیانی شیعری یەکێکە لە پێشەنگەکانی ئەو کاروانە .. من ناڵێم دنیای شیعری و شیعری شاعیرانی بەرلەخۆی کاریان تێنەکردووە و دەوریان لەشاعیرییێتی (دیلان)دا نەبینیوە ، بەڵام دڵنیام کە شیعرو شاعیرانی کوردی هاوچاخی خۆی کاریان تێ نەکردوە و ئەویش پێخۆری شیعری کەسی بەر لەخۆی نەجووەتەوە و بەهیچ جۆرێ لاسایی شاعیرێکی هاودەمی خۆی نەکردۆتەوە ... چونکە بەرهەمە ئەدەبیەکانی تا نووسینی ئەم چەند دێڕە گەر پێش شاعیرانی پێشەنگ و لوتکەو نوێخوازی سەردەمی خۆی نەکەوتبێ ئەوا هاوشانیان رووە و

داهێنان و نوێ کردنەوەی شیعری کوردی تەکانی داوە.
من ئەم بۆچوونەم لە دنیای شیعرەکانی یەوە هەست پێکردوە و بەلامەوە وایە و خۆشی کەتائێستا لە ژیانایە بێفیزو لە خۆبایی بوون و خۆهەڵکێشان " ئەم راستیەی درکاندوە ... رۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی ٢٥-٩-١٩٨٣ (دیلان) لە کۆڕێکی ئەدەبیا کەلە شاری سلیمانی بۆی سازکرا بوو، لەو رووەوە . بەم جۆرە بیروڕای خۆی دەربڕیوە : (من پەیڕەوی کەسم نەکردووە، نەهاتووم لەکەسەوە شیعر فێربم یان شیعرم فێرکاو بڵاوی بکەمەوە ... من خۆم قابلیەت و توانای شەخسی خۆم هەیە... ).
ئەو زەمینە لەبارەی بۆ شاعیر رەخساوە ، توانیویّتی کەسایەتی خۆی لەشیعری نوێی کوردیا بچەسپێنێ...
ئەگەرچی(دیلان) لە تێکڕای شیعرەکانیا پەیڕەوی هەل و مەرجەکانی شیعری کلاسیکی نەکردووە ، بەڵام بەم دوو پێوانەیەی بارودۆخی ژیانی منالّی پەروەردەی خێزانێکی ئەدەبدۆست بووە و لەدنیای ئەدەبی کلاسیکیا گۆش کراوە شارەزاییەکی تەواوی لە دنیای شیعری کلاسیکیا هەیە.
(دیلان) لە دارشتن و هۆنینەوەی گەوهەری شیعرەکانیا رێبازی نوێی هونەری شیعری تازەی گرتۆتە بەر ... دیارە بەپێی پلەی رۆشنبیری و شارەزایی و زەوق و سەلیقەی شیعری گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی روو لەکێشی (خۆماڵی – نەتەوەیی) بکات کە زیاتر و باشتر لەگەڵ (فۆنەتیک و فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی)ی زمانی کوردیا ئەگونجێ و رێك ئەکەوێ ..
بۆیە بەشی زۆری شیعرەکانی لەسەر کێشی (دە) برگەیی و کێشی

پەنجە داناوە ... با ئێستا کەمێك سەر بەلای ڕێبازی هونەری شیعری (دیلان)دا شۆڕبکەینەوە و بزانین چۆن و چەندە لە هونەری چنینی شیعریا دەستی بالاّ و وەستایانەی هەیە ... لەشیعری (شەپۆل)دا ئەم بابەتە هونەریەی بەکار هێناوە:

شەپـــۆل شـــەپۆل
لەگەڵ دەریای ژیانا
هاتین
ڕۆیین
بەهۆی تویّی ئاسمانا

ئەم کۆپلەیە ئیقاعێکی مۆسقای بەهێزی لە ئامێزگرتووە و خاوەنی کێشێکی لەنگەرگرتو و ڕەوانی خۆیەتی ... هەر زوو
کار ئەکاتە سەر تەلی هەست و هۆشی مۆرڤ و وەستایانە ئەیبزوێنیّ ...
ڕۆڵی ئەم شیعرە هەموو دەم و هەمە جۆر هەست پیّ ئەکریّ و لەئاستە هونەریەکەی نزم ناکاتەوە ، سا ئەمە بەو شێوە چنراوە کە جیا و لێك بلاّوە بێت یا کۆکرێتەوە و لەدەم یەك دریّ ، ئەمە دەسەلاّتی هونەری (دیلان) دەرئەخات ، چونکە لە ساتی لێکدانی برگە چنراوەکانا وێنەیەکی جوانی بەیتی شیعری دەرئەخات، لەهەمان ساتیشدا کێش و ئاوازە مۆسیقییەکەی لەدەست نەداوە:

شـەپۆل شـەپۆل ، لەگـەڵ دەریـای ژیانـا
هـاتین ، ڕۆیـین بـە دوو تـویّی ئاسمانـا

(دیلان) لە هونەری شیعری نوێیا شارەزایە و هەرگیز لە ئاستیا دا نەماوە ، هەر لە هەمان شیعری (شەپۆل) دا بەمجۆرە وەستایی خۆی دەر ئەخات:

لەبـــەهاردا
هەر کوێ ئەچووی
زستان بوو
لەهـــاوینا
(چـــزە)
لە پێست
هەستا بوو

ئەم کۆپلەیەش وردەکاریەکی شارەزایانەی تیا بەکارهێنراوە و چینی بەیتە شیعرییەکە تەواو بەسەلیقەی شیعری و ئاوازی مۆسیقای شیعرییەوە بەندە...

لەوەیە نابەڵەدێ ئەم شیعرە چنراوە ببینێ لە شوێنی خۆی رابمێنێ ، کەچی هەمان ئەم جۆرە چنینە دەستی هونەرڕەوەری پێوە دیارە و لای شارەزایانی شیعر نیشانەی کارامەیی خاوەنەکەی دەرئەخات.

(دیلان) دەسەڵاتی هونەرڕەوەری خۆی لە (سرودی وڵات)دا بەم جۆرە دەرئەبڕێ کەبەیتی شیعرەکە شێوەی ئاسۆیی و راست و رێك و پێکی لە ئامێزگرتووە:

## پایــز

ســـاڵ پـــایزە ، گەرمـــەی گـــەڵا ڕێزانـــە
زێـــڕ بارانـــە ، شـــێوەی ســـاڵی جارانـــە

گـــەڵای ڕژاوی ، دار مـــازووی چـــیای بـــەرز
ملوانکەکـــــەی ئەئاڵانـــــە ملـــــی وەرز

هەناسەی شاخ ... کزەبای ساردی پێدەشت
تێکـەڵ ئـەبوون ڕووەو دامـان بـەبای وەشت

گرمـەی هـەور، لێزمـەی خـوڕی پەڵـەی سـاڵ
بـــە هـــوڕژم خـــۆی ئەگەیانـــە ناومـــاڵ

ڕووبـاری شـین ، سـوور هەڵگـەڕا و بـە لافـاو
جـارێ بێـدەنگ " جـارێ بـەهاژە و بـەتاو

مۆسـیقا بـوو بـۆ شـەو ، بەسـتە بـۆ شـەوگار
شـەوی درێـژی ، هەنسکی بـە هـاوار .!!...

(دیلان)ی شاعیر لێهاتوویی و شۆڕەسواریی خۆی لـە بـوارە گرنگـەکانی هونـــەری شـــیعریا تـــاقی ئەکاتـــەوە ... بـــەڵام تاقیکردنەوەیـــەکی سەرکەوتوانە ، تاقیکردنەوەیەکی هونەری کە خۆی لە خۆیا داهێنـان و شۆڕشێکی هونەری شیعرییە لەبواری (هێز لەسەر وشـە و بڕگـە دانـان)و

لە هەمان ساتیشا ئاواز و کێشی بەرزی شیعریەکەی لەکیس نەداوە لەم موستەزادەیا شیعری (سێبەری پەرت) بەنموونە ئەهێنمەوە:

گــڕەی چــلەکەی ئیمــساڵ گــەرم بــوو ســـکڵ بـــاران بـــوو
بـــای باوەشـــێنی جـــاران نـــەرم بـــوو شـــنە هێنـــان بـــوو
ســـێبەری خەســـتی ئـــارەق فـــرێن بـــوو لـــەو شـــاخ و داخـــە
پـــشووی ژێـــر گـــەڵای گـــڕە بـــەزین بـــوو لـــــەو دۆڵ و باخـــــە
هـــاوین تەرمەکـــەی ئەبرایـــە شـــوێنێ ورشـــەی گـــەڵا بـــوو
ســـوپای تـــەوژم کـــە خـــۆی ئـــەبینێ لـــــەژێر چـــڵا بـــــوو

ئـەو چـەند بەیتـە شـیعرە موسـتەزادە هـەر لەسـەر هـەمان کێـشی نەتەوایەتی کوردی وتراوە کە کێشێکی لەبار و گونجاوە بۆ زمانی شیعر وتنـی کـوردی ئـەوەتا (سـەدر و عـەجز)ی بەیتەکـە(دە)بـە(دە) برگـە و موستەزادەکەی (پێنج)بە(پێنج) برگە.

وەك وتم (دیلان) تا نووسینی ئـەم چـەند دێـڕە ئـەتوانین ئـەو حـوکم و بڕیـارەی بەسـەرا بـدەین کـە کانییـەکی تـەقیوە و هـەر قوڵپـە قـوڵپی خــوڕەی ئــاوە بێگــەردە ســازگارەکەی دێ و لــە هــەموو وەرزێکــا بەخشندەی بەپێز و گەییوی هەیە.

ئەوی پێویستە لەم رووەوە فەرامۆش نەکرێت کـە تاوەبـارانی شـیعری (دیلان) تا ئێستا خۆشی نەکردۆتەوە، بەڵکو سات لەدوای سات و پەیتا پەیتا خێراتر و بەخوڕتر و توند و تیژتر لە جاری جاران دائەکات..!

(دیلان) ئێستا لە هونەری داهێنانی نوێی شیعریا لە لوتکەیەکی زۆر بڵندایە و بەسەر لوتکەکانی سەردەم و هاوچەرخەکانیا ئەڕوانێ ، گرنگی بە هەموو رەگەز و کەسایەتی و هەلومەرجی هونەری شیعری نوێ داوە... بەلای منەوە (دیلان) لەو لایەنە گەش و روونا کەی من پەنجەم بۆ بردوە لە لوتکەیەکی بەرزەوە بلیمەتی و لێهاتوویی خۆی ئەنوێنێ .. لەشیعری (تروسکە)دا وەك هونەرێکی تازە داهێنراوی شیعرییە و بەم شێوەیە خۆی ئەچەسپێنێ:

ئەی تروسکە:

بەرەو کۆ دێین بۆ رێی ژین

بە چوار وەرزە ... پەل ئەگێڕین بتبینین

پەل ئەگێڕین:

دەور و پشتمان پەیکۆڵە..

پێمان رووتە ... تێشووی رێمان سکڵە..

هەنارراوە:

سووربوونەوەی سەر سنگمان

دام و داوە،جێگەی چینەی ناوچنگمان

قوڵپی تەریك:

گەردنی داپۆشراومان

مەیلەو ئاڵە، تکەی دڵی گوشراومان

زەردی دوکەڵ:

توێی .. سەرپۆش قوڕاوی

یەخەی ونجڕ کراس شیتاڵ بڕاوی

بەفر و خوێنە:

بەفر و خوێنە خۆراکی بەستـــەڵەکمان

بۆ مانــەوەی رەگـــێـــکی رەچەڵکمان

بۆ مــانەوە:

زەرد و ســـــوورە .. قـــوربـــــانــــی

پەلکە زێــــرپینەی سنــوورە گـــــۆرانـی

لە شیعری (تروسکە)دا چەندە لێی وردبیتــەوە ئەوەنــە گیانی داهێنـانی هونەروەری پێوە دیارە، بەڵگــەی هەڵکشانی داهێنـانی هونــەری نــوێی شیعری (دیلان) ئەسەلمێنێ.

لەشوێنی خۆیا ئەبوو گەر وردتر و قوڵتر و بەشێوەیەکی تێر و تەســەلتر لە دنیای شیعری (دیـلان) بدوامایـە .. ئـەم چەند دێڕەی بەردەستتان تــەنیا بەســەرکردنەوەیەکی شــیعرەکانە و هێـشتا مـافی رەوای خــۆیم نەداوەتێ و بەلاشمەوە وایـە ، بەمـە ئـەو گفت و پەیمانــەی خـۆم کەلـە پێشەکی (پایزی جاران)دا دابووم بە دنیای شیعری (دیـلان) بـە تــەواوی نەم بردۆتە سەر ... ئەوە هەر قەرزێکە و رووبەڕووی دەرفەتێکی لەبار و گونجاوی ئەکەمەوە. بۆیە هیـوام وایـە بـە جـۆرێ لـە دەرگـای شـیعری (دیلان)م دابێ، کە دەنگەکەی ئەو قەڵـەمی رەخنـە رەسـەن و دڵسۆز و لێهاتووانە بجولێنــێ و چـی تـر لـە ئاسـتی دیـاردە گەشـەکانی شـیعری (دیـلان)دا کـپ و خـامۆش و بــێدەنگ نــەبن و ئـەم چـرا داگیرسـاوەی شیعری نوێی کوردی فەرامۆش نەکەن.

**عەبدوڵلا ئاگرین**

سلیمانی ٢١-٧- ١٩٨٥

## پێشکەش :

* بەگیانی پاکی (مەلا ئەحمەدی دیلان)ی باوکم کە فێری کردم شیعرم خۆش بوێ.
* بەو کەسانە بێ کە فێریان کردم کوردم خۆش بوێ .

**( دیلان )**

# (پێنج خشتەکی لەسەر شیعرێکی سالم(*))

نەکەی هەرگیز نەمامی گوڵ ببێتە سێبەر و سایەت
بە نینۆك گەر بژاری کەی بە پوولی بەرهەم و مایەت
ئەوی بۆنی وەفا و عەهدە بە هیچ جۆرێ لە گوڵ نایەت

هەتا ماوم ئەچێنم تۆوی هەر خارێ لەدڵ شایەت
کەبێی بۆ سەر مەزارم دامەنت بگرن ئەگەر مردم

***

(*) لە ساڵی ١٩٥٨ لە ئیدارەی محەلی شاری سلیمانی دیلان و چەند برادەرێکی لە دنیای (سالم) ئەدوێن و ئەویش ئەم شیعرەی سالمی زۆر لا جوان و ناسك ئەبێت و ئەم پێنج خشتەکییەی لێ دێنێتە کایەوە.

# (شەش خشتەکی لەسەر شیعرێکی)
# سالم(*)

من بـرۆی پەیوەستی ئـەو نـازدارە شـێر و تیرمـە
پرچـــی لـوول و زوڵفـی ئـاڵۆز کۆتـەو و زنجیرمـە
قـــوژبنی مەیخانـــە دایـــم گۆشـــەیی تەدبیرمـــە

سـوجدە بـردن بـۆ نیگایـە کـردەوە و تەفکیرمـە
کەی بە صەیحەی من ئەگا جزبەی مریدی خانـەقا
شـەیخی ئـەو پـیرو موسـینە مـن جـوانیٚ پیرمـە

***

(*) دیلان وەك شاعیرێکی هەست ناسك ، هۆگری هونەری بەرزە و ئەو جۆرە ئەدەبەش کاری تیٚ ئەکات

– ساڵی ١٩٥٨ لەگەڵ چەند برادەرێك لە ئیدارە محەلی شاری سلیمانی ئەبێت و یەکیٚ لە ئامادەبووان ئەو شیعرەی سالم ئەخوێنێتەوە لە هەمان کاتیشدا دیلان ئـەم شـەش خشتەکییەی لیٚ پێك ئەهێنیٚ

# سکالآیەکی کورت(*)

منم بە دەستی چەرخەوە واگێژ ئەخۆم و ئەڕۆم
منم کە بوومە خوێنەخۆر و خوێنی خۆم ئەخۆم
منم لە بەحری خەیاڵاتی بێ وچانی ماتەما
هەر پەل ئەگێڕم نە کەڵك و نە سوود و علاجە بۆم
زامدارە بولبول و لە دەوری گوڵ ئەکا رەقس وسەما[1]
بەکەیلی ئەشکی سوور و ئەسەف دەست و چاو ئەشۆم

***

(*) دیلان کە ئەم شیعرە دائەنێ. شەوێك لە شەوانی ساڵی ١٩٤٨ لە ماڵی برادەرێکی
ئەم چەند شیعرە بۆ بێکەس ئەخوێنێتەوە و بێکەس ئەڵێ : ئەمە شیعری کێیە؟.
دیلان لە وەڵامدا ئەڵێ هی منە !!.. ئەڵێ چی چی ؟...
بڕوا بە دەسەڵاتی شیعری دیلان ناکات ... بۆیە پێی ئەڵێ : ئەمەشیعری خۆمە ...
کەیفی خۆتە من ئەڵێم (هی منە).

(1) ئەم دوو بەیتەی دوایی لە دەستخەتێکی(دیلان) دا بەمجۆرەش نوسراوە:
دیلانە بولبول و لە دەوری گوڵ ئەکا رەقس و سەما
بە کەیلی ئەشکی سروشك و ئەسەف دەست و چاو ئەشۆم.

## دەمەتەقێ(*)

### ١٩٤٩

**لاس :**

گوڵەباخ ئیمساڵ شکاوە چڵی
وەنەوشە سیس و ژاکاوە گوڵی[1]...

گوڵاڵە بە حاڵ هێزی تیا ماوە
ئەوەندە خوێنی لەش تکاوە

پەپوولە حۆل و گێژ و وڕ بووە
هێندە قەبرغەی بە دڕکاچووە ..!

---

(*) ئەم قەسیدە شیعرە لە بەندیخانەی (کوت شاری واست) لە دوا مانگی ساڵی ١٩٤٩ دا دانراوە و لە ڕۆژنامەی ژینی ١٩٥٠ دا بڵاوکراوەتەوە.

(1) لاس : لە کەلتووری نەتەوایەتی کوردا گەلێ چیرۆك لە شێوەی داستان و ئەفسانەدا دەما و دەم پێمان گەیشتووە ... ((لاس)) یش نمونەیەکی ئەو جۆرە چیرۆکانەیە پاڵەوانی چیرۆکی ((لاس و غەزالە))ە ... وەك سەرچاوەکان پەنجەیان لەسەر داناوە ... مەڵبەندەکەی لە قووڵایی ئاڵانی _ شار بازێڕی ناوچەی سولەیمانیەوە هاتووە.

- گوڵە باغ و وەنەوشە و گوڵاڵە ... نیشانەو نموونەی پاکێتییە و خوازەیە بۆ بارو دۆخی مرۆڤی نیشتمان پەروەر کە چۆن چەپۆکی ستەم و کوتەکی ناهەموار بە تەپڵە سەریا ئەماڵێ.

سـرورودی پـۆلی مـەلی سـەر درەخـت
خوێنـدنی پـەپووی شـوومە بـە ناوەخـت[1]

بـەهاری ئیمـساڵ تـۆراو و تاڵـە
بـا لـە گـوڵ پرسـین چـیە ئـەم حاڵـە ؟

**گوڵ :**

وازم لێ بێنـە دەسـتم دامانـت
نـازانم چـی یـە نـاو و نیـشانت

پـەڕ و بـۆم وەری و لـەش داڕزاوە
چـقڵی دونیـا لـەپووم چـەقاوە

تـۆ .. بـەرگی زەرقیـت کردۆتـە بـەرت
بـەڵام رەش پۆشـە ئاسمـانی سـەرت[2] [3]

---

(1) لەو بەیتەدا ((مەلی سەر درەخت)) مرۆڤی پاکی دڵسۆزە و ((پەپووی شەم))یش هێزی ناڕەواو شەڕویست و ناهەق پەرستە.

شاعیر زۆر جوان ئەو واقیعە دەرئەخات کە لە بریتی سروودی سەرکەوتن و کامەرانی میللەت ، دەنگی پەپووی شووم ئەبیستریَ و وڵات چۆڵ و کاولەیە

(2) زەرقی : باق و بریقاوی ... رەنگاو رەنگ و ئاڵ و واڵاو سەرجەم بەیتەکە ئەوە ئەگەیێنیَ : مرۆڤی کەمتەرخەم هەرگیز خەمی کەسی دی هەڵناگریَ و با

خەڵکی لە ماتەمدا بژین و سەر و سەرپۆشیان رەش بێت .. ئەو هەر لە ئارەزو و زەوقی خۆی ناکەویت ..

تـــۆ .. وابـــێ خەبـــەر هێنـــدە بـــێ بـــاکی
بەڕاســـتی ئـــەڵێم بـــۆ کـــردن چـــاکی ..! [1]

**لاس:**

بەســـــە دە بەســـــە ئـــــەوا تـــــەقیم دەی
ڕێـــزە ڕێـــزان بـــە گـــەر حـــاڵیم نەکـــەی [2]

بەســـــە دە بەســـــە ئـــــیتر نـــــاتوانم
بـــاری توانجـــت بێتـــە ســـەر شـــانم..

**گوڵ:**

دە گـــوێ ڕاگـــرە ئـــەی هـــەر دوو چـــاوم
(مـــن) سەربەســـتییە نیـــشان و نـــاوم [3]

---

(1) بێ خەبەر : بێ ئاگا ... دیارە کەسانێك کە هێندە بێ باك و بێ ئاگا بێت و لەگەڵ ژان و سوێی گەل و وڵاتەکەیا نەبێت بۆ (نەمان) مردن چاکە.

مەحویش بۆ هەمان فەلسەفەی ژیان ئەڵێ:

سەر کە جۆشێکی نەبێ من زرکە تاڵم بۆ چییە؟!

دڵ کە هۆشێکی نەبێ شیشەی بە تاڵم بۆچییە؟!.

(2)تەقیم : شەقم برد ... بۆ حاڵەتی داخ و خەفەت بەکاردێت و ئەو کەسە ئەڵێ لە خەفەتا شەقیم یان شەقم برد.

- ڕێزە ڕێزان : ئێسك و پروسکی ورد و کەرت و پەرت.

(3)دیارە کە شاعیر خۆی لە سەربەستیدا ببینێتەوە ، گەشانەوەی گوڵی ژیانی بەڵگەی بوونی سەربەستییەو پلیشانەوەی گوڵ و گوڵزاری باخچەی ژیانی .. نەبوونی سەربەستی ئەگەیێنێ.

پێـــی داگیرکـــــەران پێـــی خوێنمـــــژانمان
پلیـــــــشانیەوە گـــــــوڵی باخانمـــــــان

رووخـــــانی لانـــــەی مـــــەلی ســـــەر دارم
ئەمەیـــــــە ( حـــــــاڵ و رازو گوفتـــــــارم) (1)

لاس:
گوڵـــــە ســـــوورەکە چـــەن بـــەرگت ئاڵـــــە
دەورو پشتیـــــــشت پـــــــڕ دڕك و داڵـــــــە

بـــــەڵام بەڕێـــــژەی ئێـــــسکی شـــــەهیدان
بـــــەو قەنارانـــــــەی هـــــــەڵخرا لێمـــــــان

ڕێـــم ریگـــەی ڕۆڵـــەی گیـــان بـــەخش کـــەربێ
ئـــەوی پێـــشکەشی بـــێ نـــرخ بـــێ ســـەربێ!...

شـــــەرتە بـــــەگازی خـــــەباتی میللـــــەت
دەربێـــــنم رەگـــــی بەنـــــدی و زیللـــــەت(2)(*)
***

---

(1) (حاڵ و رازو گوفتارم) مەبەست لـە جـۆر و بابـەتی ژیـان و نهێنیـە دەروونیـەکان و گفت و بیروڕایـە .. سـەرجەم بـارو دۆخـی ژیـان لـە کلاوڕۆژنـەی سەربەسـتی یـەوە تەماشا ئەکرێ.

(2) شەرتە : مەرجە
گاز : گەرتن بە ددان گەزتنی.

(*) سەرجەم بەیتەکە مەبەست لەو سوێندەیە کە بڕوا بـەجۆرو شێوەیەکی تێکۆشـانی میللەتە، لە پێنـاوی نەهێشتنی بەندایـەتی و زەلیلـی و لـەڕەگ و ریشە دەرهێنـانی ماکی ئەو دەردو نەخۆشی یە

# ئەو پەڕی هەست

١٩٥٠

ئـــــەی ئەوپـــــەڕی شـــــعوورم
مـــــەنزڵگای ڕێگـــــای دوورم[١]
ئاســـــۆ و شـــــەبەقی ســـــوورم
مایـــــەی شـــــادی و ســـــروورم[٢]
ئـــــەی هـــــۆی ئـــــاوات و تاســـــەم
بـــــۆ چـــــرۆکی هەناســـــەم
(وەحـــــی) ئـــــەم بەنـــــد و باســـــەم
کـــــردە و کۆشـــــە و کاســـــەم[٣]
ئـــــەی کلیلـــــی زنجـــــیرم
(نیـــــشانی) قـــــەوس و تـــــیرم[٤]
دەســـــتی هـــــەڵگری شـــــیرم
جێگـــــای نینـــــۆکی گـــــیرم
ئـــــەی پاداشـــــتی ئـــــازارم

---

(1) شعوورم : هەستم ، هۆشم.
مەنزڵگام : لانەم ، خانەم ، شوێنەکەم.
(2) سروورم : خۆشی و شادیم.
(3) (وەحی): جۆرە ئیلهام و بیرخستنەوەیەکی دیوی ئەو دیوی هەستە .
کردەو کۆشەم : هەوڵ و تەقەلام.
کاسەم . مەبەست لە کاسەو خوانی بیری و بەری ئەو ڕەنج و تەقەلایە.
(4) قەوس و تیرم: مەبەست کەوان و تیرە بەهەڵسان و کەوتنی تێکۆشانیش دێت.
قەوس: کـەوان.

بـــــازاڕی کـــــسپ و کـــــارم(١)
مەرهـــــەمی زامـــــی چـــــارم
بـــــاغم ، ســـــەمەرم ، دارم(٢)
ئـــــەی تێکۆشـــــانی پـــــڕ خـــــوێن
بازینـــــدان بـــــێ چـــــرپاو نـــــوێن(٣)
مۆســـــیقام بـــــێ دارو جـــــوێن
ئـــــەنجام (تیغـــــەکان) ئەســـــوێن(٤)
ئـــــەنجام تـــــەناف بـــــێ یـــــا دار
گـــــورزی دەســـــتی ســـــتەمکار(٥)

---

(1) کسپ : کاسبی مەبەست لە دەسکەوتنی ڕۆژانەیە.
(2) باغم ، سەمەرم ... دارم : بەرهەمم ، بەرو بوومم.
لێرەدا شاعیر مەبەستی لە باغ ژیانە و لە سەمەریش بەری ڕەنج و هەوڵ و تەقەلادانە ... داریش بەمەبەستی ئاکامی دوای هەوڵەکە دێت ... واتە بەرهەمی ژیان و تەقەلای ڕۆژانەم ئەو دارەیە کە ئەبینرێ و مشتێکە بۆ سەر خەرمانەی پێشکەوتن و شارستانییەتی مرۆڤایەتی..
(3) چرپا و نوێن :– چرپا : قەرەوێڵە ، ئەو شوێنەی نوێن و پێخەفی لەسەر ڕائەخەن بۆ نووستن .
نوێن : پێخەف: دۆشەك و سەرین و لێفەو بەتانی یە.
(4)تیغەکان : کۆی تیغە : لەناو خەڵکی شاری سولەیمانیدا تیغ زیاتر بەکاردێ.
(5) بەمەبەستی گوێزانی ڕیش تاشین دێت تیغ : واتای چەك یان ئامێری دەستی بەرامبەر ئەگەیێنێ وەك شیرو خەنجەرو چەقۆ . ئەسوێن : کول ئەبن .
سەرجەم واتای : (ئەنجام ((تیغەکان)) ئەسوێن) واتە ئەو جۆرەها ڕێگاو چەشنی چەکانەی دوژمن بەکاریان ئەهێنێ کول و کۆڵ ئەبن و کۆڵ ئەبەن .. ئەو چەکانەش کەداگیرکەر بەکاریان ئەهێنێ : ئازار و ئەشکەنجە و لێدان و زینـدانی ، هەڵواسین و کوشتن و بڕینە.

دەستی لیستی (ئیستعمار)
ئەوانی پیا دێتە خوار ..!
ئەنجام هەر شەڕ و شەڕگێڕ
ئیستعماری بە لەش تێر
تینووی خوێنی سوور و سوێر
پەل ئەکوتێ شەل و کوێر
ئینجا .. ئاشتی پەرستان
یاخۆ .. ئازادی ویستان
ئەڕژێنە باغ و بێستان
لە گەرمیان و لە کوێستان ..!
ئەڕژێنە باغی ئاوات
لەو جێیەی ڕۆژ لێی، هەڵات
بە زەبری سەختی خەبات
ڕۆژی (سەربەستی و نەجات)
ئیتر ئەو تەوقەی جاران
بەزۆر ئەکرایە ملمان[1]
بۆ گێرەی ئاغاکانمان

(1) ئیتر ئەو تەوقەی جاران : تەوق : کۆت ، زنجیر ، پێوەند، واتە ئیتر ئەو کۆت و زنجیرەی جاران میللەتی پێ دیل و زەبوون ئەکرا پچڕێنراو ئازاد بوو..

تێکـــــڕا ئەکەونــــە پـــــچڕان[1]
ئـــــیتر نەترســــــی بەرگـــــە
نـــــە نەخۆشـــــی بـــــە مەرگـــــە
نەهەڵگوشـــــــــینی ورگـــــــــە
نـــــە هەڵقرچـــــانی جەرگـــــە
ئەوســــــا دێتـــــەوە یـــــادم
کـــــە تــــۆی قیبلـــەی مـــــرادم
تــــۆی ئـــــەو پــــەڕی ئـــــاواتم
تـــــۆی گـــــۆی هونـــــەر وهـــــاتم(*)

***

(1) بۆ گێرەی ئاغا کانمان :

- گێرە : مەبەست لەو کارەیە کە جاران وەرزێرەکان خەرمانیان پێ سوور ئەکردو ئەکوتا، بەهۆی جووتە گا یان هێستر و دوایش جەنجەڕ بەکار هێنرا.

(*) سەرجەمی دێڕە شیعرەکە مەبەست لەوەیە کە داگیرکەر و چەوسێنەر و ستەمکار بە زۆر ژێردەستەکانیان ئەچەوسانەوە ... لە دێهات نیشینەکاندا دەرەبەگ وەرزێر و پاڵەی ئەچەوسانەوە و بەرامبەر نانەسکی هەرچی کارو باری خۆی هەبوو پێی رایی ئەکردن. وەك زەوی کێڵان و تۆو پێوە وەشاندن و دروێنەو گێرەو خەرمان هەڵگرتن و وجۆبارو شەتڵ لێدان ... تا دوایی ... لە ئەنجامیشدا بەری ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایە نانەسکی یەکەی پێ ئەبڕا

# جانەوەری شەڕ[1]

بـۆ وڵات ببـێ بـە دەریـای خوێنـاو؟
مـردن ببـارێ بـە گـوژم و بـەتاو!
رەش دابگیرسـێ ئاسمـانی شـینم!
وشـك هەڵبگـەڕێ دەشـتی رەنگیـنم!
زەردباو بنـوێنێ پـەڕەی گوڵاڵـەم !
لـێم تـاریکتربێ ئـەم ژینـە تاڵـەم !
بـۆ بـەبێ تیـشکی رۆژی بـەهارم !
بتاوێتـەوە بـەفری نـزارم !
بڕوخـێ لانـەی بولبولـەکانم!
تێـك بـچێ خـوڕەی سەرچـاوەکانم!
بـۆ سـوور بنـوێنێ تریفـەی مـانگم!
نقـوم بـێ دەنـگ و ئـاواز و بـانگم !
بـەبێ پـایز و زەردی خـەزانم!
بـوەرێ گـەڵای درەختـەکانم!
لـەجێی سـرودی مـەلی سـەردارم
بایـەقوش بێتـە یـار و غـەمخوارم
بـۆ مـاڵ بڕوخـێ شـار هـەرەس بێنـێ؟

(1) ئەم شیعرە لە رۆژنامەی ژین وەرگیراوە، لە ژمارە (١١٢٢) لە ٦ی تشرینی دووەمی ١٩٥٢ بلاوکراوەتەوە..

بـێ ئـاگر و نـەوت كڵپـە بـسێنێ
بۆ گرد دروستبێ لـە ئێسکی سووتاو؟
لەلـەش و لەسـەر لـە گۆشـتی بـرژاو
لـە مەچەك لـە قـاچ لـە دەسـتی پـەڕیو
لـە پـرچ لـە گۆنـا لـە پێـستی رزیـو!
بـۆ سـەریەك کـەوێ لاشـەی مـردوان!
کەڵـەکبێ هـەتا ئەگاتـە ئاسمـان
هەرچـی بـەڕەنج و بـە ئـارەق رێـژان
هاتۆتـە بەرهـەم لـە مێـژووی ئینـسان
تـەفرو توونـابن تێکـڕا نـەمێنن
سـەرلەنوێ تـۆوی دیلـی بـچێنن
بـۆ خیـزانن ژنـان، کفتـە کـەناران
پێ پەتی، لەش رووت،وێڵ و سەرگەردان
ئـاوارەی چـۆڵ و رێـی توونـاوتوون بـن
لـەژێر بۆمبـادا سـەرەونگوون بـن
بـۆ قوتابخانـە و کۆشـك و تـەلاران
ببنـە خـەڵوزی کـوورەی بـەدکاران
بۆ؟ بۆچۆ؟ بۆکێ؟ ئـەم بـەڵای رەشـە!
لەبـەر کـێ بـرژێ ئـەم خوێنـە گەشـە؟
لەبـەر زەوتکـەری خـاك و سـەروەتمان
هۆی دەردی سەر بوو بەختی نەگبەتمان

هـــۆی ئـــازاردان و چەوســـاندنەوە

هـــۆی خـــوێن و مـــژین، رووتاندنـــەوە

زنجـــیری زل و پێوەنـــدی پێمـــان

کۆســـپی بـــەرلووت و چـــقڵی رێمـــان

بـــەتاڵان بـــەری هـــەبوو و نـــەبوونمان

شیشی داخ بۆ نـاو ئێسکی زینـدوومان

بـــــەکورتی لەبـــــەر ئـــــەمپریالیزم

خـــوای دەرەبـــەگی و بـاوکی فاشـــیزم

هـــەر لەبـــەر چـــاوی رەشـــی زۆرداران

لەبـــەر خوێنمـــژان یـــا گوناهکـــاران.

نـــا نـــەخێر ئـــەمڕۆ میللـــەتان یەکـسەر

رێگـــای ئاشـــتییان واگرتۆتەبـــــەر

میللـــەتی ئیمـــڕۆ هـــی دوێنـــێ نییـــە

ئـــەزانێ شـــەڕ و شـــەڕخواهی چـــییە

زۆر چـــاك ئـــەزانێ دوژمنـــی کێیـــە

کـێ شـەڕی ئـەوێ کـێ مـژدەی پێیـە؟

***

## پاییز[1]

پایز بوەرێ گەڵای درەختت
زستان، بابێنێ وەیشوومەی سەختت
خەزان، بازەردبێ دەشت و چیا و کێو
بەفر، داپۆشە هەوراز و نشێو.
رەهێڵە رایدە پووشی پەنا چاڵ
بای وەشت، بیشکێنە نەمامی ناوماڵ
دووکەڵ زەردیکە ژوور و قوژبنان
داپۆشە چارەی جگەر کونکونان!
پەپوو، رۆژتە بخوێنە بەگەرم
سەرماوسۆڵەیە لەکەس نەکەی شەرم
بەڵام با ببیەی رازی داستانی
یەتە پێش چاوت ناو و نیشانی
تا پاییز تارای زەردی نەپۆشێ
زستان وەیشومەی سەختی نەجۆشێ
وشك نەبێ پووشی دەشت و چیا و چۆڵ
نەیگرێ بەفر لوتکە و شێو و دۆڵ

---

(1)ئەم شیعرە لە رۆژنامەی ژین، ژمارە (١١٣٢) ساڵی ١٩٥٣ و گۆڤاری رزگاری ژمارە (٤) ١٩٦٩/٣/١٨دا بڵاوکراوەتەوە

لافـــــاو و بـــــاران نـــــەیماڵی زەوی
بـــای دەشـــتیش نـــەیبا پـــەرژینی قـــەوی
لرفـــــە و چـــۆقەی دان نەگاتـــە ئاسمـــان
پـــــەپوو نـــــەخوێنێ لـــــە پـــــۆپی داران
چـــۆن ڕۆژی بـــەهار ئـــەدا گزنگـــی؟
چۆن نێرگس چین چین، خاو خاو ئامێزان
نـــازداران پـــۆل پـــۆل گوڵاڵـــە ڕێـــزان!
ئـــەدەن بەیەکـــدا دەســـت لـــەناو دەســـتا
لەگـــەڵ گوڵاڵـــەی ســـووری چاومەســـتا
چـــۆن یەتـــەوە قـــوڵ سەرچـــاوەی بنـــار؟
گیـــای نـــاو ئـــاو ورد ورد ئەخاتـــە کـــەنار!
چـــۆن یەتـــە چـــرۆ درەختـــی باخـــان
یەتـــــە بریقـــــە نـــــزاری شـــــاخان(*)

***

(*) (پارچەیەکی "ڕەمز"ییە، لە ١٩٥٣ نووسراوە)

# هەورەکە، دایرێژە[*]

هەورەکــە دایرێــژە، ســا، شەســتی بارانــت
بــا، بیبــا، ســەیلانت، دێهــات و شــارانم
بـا گـڕی تریـشقەت، چـەخماخەت، بروسـکەت
گیـان بکـا بـە خـەڵوز.. نـەیهێڵێ تروسـکەت
بـا، رەشـیت، تووڕەییـت، بـا شـێوەی ئـاڵۆزت
ونــی کــا ئــاوازی هێلانــەی بەســۆزم
بـا لێزمـەی بـەخوڕت یـا تـاوت یـا تـەرزەت
بیکـوتێ، بیـشکێنێ، قەڵـەم کـا بـە تـەرزم
بـا تـەمی سـەر لوتکـە و سەرشـاخی زۆر تاڵـت
داپۆشــێ دیمــەنی نــزاری خــاڵ خــاڵم
هەورەکــە دایرێــژە ســا شەســتی بارانــت
بــا بیبــا ســەیلانت دێهــات و شــارانم

***

هەورەکــە چــۆك دادە و تــەپونم داڕێــژە
چـین چـینی شەسـت پـەڕ وەنەوشـە دابێـژە
(پەیمانــە)ی سەردەســتی گوڵاڵــە بڕێــژە
تـۆش، (قـوڕاو) لـە چـاڵ و لـە چـۆلا بنێـژە

***

---

( * ) ئەم شیعرە لە رۆژنامەی ژین، ژمارە (١١٥١) لە ساڵی ١٩٥٣دا بڵاوکراوەتەوە

با دەعبای خزاوی بنمیچ و لەکون چوو
تۆقیوی ڕۆشنایی، ملکەچ و گیان مردوو
چاو کوێری گەشەی گوڵ، هەڵاتووی بریقە
ڕەفیقی هەنسک و سەرشۆڕی تریقە
***
ئەوانەی کە تۆ هۆی بۆ گەشتی ئاسمانیان
بۆ خشپە و بۆ چرپە و بۆ گۆشەی ئامانیان
دەرکەون (تۆ) بەری ڕۆژت وا لێ گرتوون
تۆ هێز و توانای فڕینت بۆ بردوون
***
بەڵام تۆ هەورەکە، لەیەك دە و تاریك کە
دەزوولەی ڕووناکیم زۆرتریش باریك کە
هەر کاتێ هەڵیکرد بای بەهێز، بای لەپڕ
بەسنگی ئەستوورت بەجۆرێ ئەدا دڕ
هەر پەڵەت، هەر پارچەت وا ئەبا بۆ شوێنێ!
نە دەنگت، نە ڕەنگت شێوەشی نەمێنێ!
*****
ئەی هەوری داگیرکەر تۆزێ بۆم ڕاوەستە
کەمەری تاریکیت باشتریش ببەستە
هەرکاتێ هەڵیکرد بای تۆڵەی گەلی من
تۆ خۆت و دەعباکان جێ نابێ تێ بچن

# مژدەی مەلێك(*)

منـــاڵ: ئـەی باڵـداری دەنـوك ســوور
بریقــــــــەت دێ دوور بــــــــەدوور
ئێــسك ســـووكی نـــەرم و شـــل
دڵ دێنێتـــــــە جووڵــــــە و پـــــل
وەرە لـــــــــەتوێی دەســـــــــرازە
لـــــە تـــــووكی نـــــەرم و تـــــازە
لـــــە ســـــنگی گـــــەرم و گـــــورپم
لـــــە چـــــاوی هیـــــوا پــــــڕم
بـــــۆت ســـــاز ئـــــەدەم هێلانـــــە
ئـــــەی مـــــەلی خنجیلانـــــــە
وەرە مـــــــــــن بەپەرۆشـــــــــم
مـــن بێـــشكە و لـــەش و كۆشـــم
خۆشـــــــە بـــــــۆ هەڵنیـــــشتنت
بـــــۆ جێـــــی ئـــــارام گرتنـــــت
كـــۆتر: كۆرپـــەی نـــازكتر لـــە گـــوڵ
ســـــەودای جـــوانی پــــڕ بـــــەدڵ
منـــــــیش گـــــــڕی ئاســـمـــــانم

---

(*) ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٥٣ نووسراوە و لە ژمارە (١١٥٣)ی رۆژنامەی ژین لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٥٣دا بلاوكراوەتەوە

چریسکەی باڵەکانم
ملەقوتێی گوێسوانەم
هاقی دەمی کولانەم
لایلایەیە بۆ خەوت
بۆ پرخەی ڕۆژ و شەوت
بنوو بێ ترس و بێ سڵ
ئەی خونچەی گەشی سەرچڵ
منال: ئەی باڵداری دەستەمۆ
خودای لەنجە و هاتوچۆ
چییە بەدەنووکتەوە
بەسەر پەڕەی سووکتەوە
دە بیخەرە ناو چنگم
بیدە لە یەخە و سنگم
چونکە بەخوێن تینووان
وەك مار بەسەر زینووان
داگیرکاری بێگانە
وا خەریکی پیلانە
خەرریکی خوێن رشتنن
تەمای وێران کردنن
وەرە من شەڕم ناوێ
بملاوێنە تاو تاوێ

مـــن بـــه ئاشـــتی و ژینـــی شـــه‌نگ
دوور لـــه بۆمبـــا و گـــڕی جـــه‌نگ
وه‌ك گـــــــوڵ ئه‌گه‌شـــــــێمه‌وه
وه‌ك بـــــــوك ئه‌ڕازێمـــــــه‌وه
كـــۆتر: كۆرپـــه‌ی شـــیرین گرۆگـــاڵ
ئـــــه‌وا له‌گـــــه‌ڵ بـــــای شـــــه‌ماڵ
بـــۆم هێنـــای مـــژده و دیـــاری
ده‌ســـــكه، بـــه خنـــه و یـــاری
ئـــــــه‌وا هـــــــه‌موو میللـــــــه‌تان
كه‌توونـــــه ڕێـــــی تێكۆشـــــان
ئاشـــــتیت بـــــۆ ئـــــه‌پارێزن
شـــــه‌ڕ و شـــــه‌ڕخوا ئـــــه‌بێزن
وا یـــه‌ك ده‌س و به‌یـــه‌ك ده‌نـــگ
ئـــــه‌ڵێن: نامانـــــه‌وێ جـــــه‌نگ
هـــا ئـــه‌وه‌ش لقـــی زه‌یتـــون
هه‌ســـته بـــه‌بێ چـــه‌ن و چـــوون
بـــــه‌گاكۆڵكێ نـــــه‌رم و ورد
بیـــده، ده‌س نه‌تـــه‌وه‌ی كـــورد
بڵـــێ: ئێمـــه‌ش وه‌ك گـــه‌لان
بـــــه‌هاوكاری و تێكۆشـــــان
ئه‌گه‌ینـــه مـــافی خۆمـــان
***

# بۆ گیانی برایەکم(*)

ئــەی ئــاوارە لــەدەس مــاری بێگانــە
تــۆ پاکیــت و نەبــەزینت نیــشانە
تــۆ، کۆڵنــەدانت و لانــەدان لــەڕێگات
بــوو بــە درکــی تێهەڵــچەقیوی جێگــات
تــۆ، خۆبــەختیت، بیرکردنــەوەت لــە ســبەی
هاویــشتیتیە باوەشــی ســزا و ناڵــەی

***

ئــەی بولبــولی ســەودای گــوڵی ئــازادی
تــۆ بــۆ رۆژی خۆشــبەختی و شــادی
خۆتــت گێــڕا لــەدەوری ئامــانجی گــەش
لەگــەڵ ئــازار و ئێــشا بوویتــە هاویــەش
تــۆ بــەڕووتی، دەردی ســەری، نەخۆشــی
بــۆ هیوایــە، ئــاواتیّ، تێنەکۆشــی
تێکۆشــانیّ دەنگــی زنجیربــیّ ســازت
تێهەڵــچوونی مــرەی دوژمــن بــیّ ڕازت
ئــەی چــریکەی بــیّ دەنگــی نــوکی خامــە
دوژمــن گێــژە و خــەیاڵ و هۆشــی خامــە

(*) ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٥٣ نووسراوە، لە ژمارە (١١٥٩)ی رۆژنامەی ژین لە ساڵی ١٩٥٣دا بڵاوکراوەتەوە

نەتوانیویـــە و نـــە ئـــەتوانیٚ، تـــۆ و هاوڕێـــت
ئاشـــی ترســـی ئـــەو بیرەتـــان بهاڕێـــت
نـــە توانیویـــە و نـــە ئـــەتوانیٚ، زنجـــیری
داوی رەشـــی فاقـــە و کـــەوان و تـــیری
بـــاڵی مـــەلی (ئاشـــتیخوێن)تـــان بـــشکێنیٚ
ملـــی بـــەرزی خـــەباتتان دانـــەوێنیٚ
***
ئـــەی ئـــاوارە، نـــەك ئـــاوارەی هـــەلآتن
نـــەك راکـــردوو لـــە چـــنگی تیـــژی دوژمـــن
نەئـــ، وریـــابی، بەرامبـــەر مـــۆڕی چـــاوی
یـــا دەربـــازبوون لـــەژێر قـــەپی خوێنـــاوی
***
ئـــەی زمـــانی هەڵبەســـتی کـــوردی شـــیرین
پـــەلکی خـــاوی خـــەیاڵی وردی زێـــڕین
تـــۆ بـــە(مایـــە)، بـــە ناونیـــشان هـــەژاری
بـــەلآم بـــەخوو، بـــەکردەوە بـــەرداری
وەرە، شـــەرتی خێـــر پـــەیمانیٚ ببەســـتین
کـــە لـــە رێگـــەی خـــەباتا رانەوەســـتین
هـــەتا لاکـــی داگیرکـــەرمان نەنێـــژین
تـــامی ئـــۆقرە و حەســـانەوە نەچـــێژین
*****

# شینێك[1]

پێشەوای بەرزی چینی کرێکار  قەڵای ئازادی
تیری ئاراستەی دڵی ستەمکار  مۆسیقای شادی[2]
ئاڵا هەڵگری ئاشتی جیهان  بەرامبەر بە شەڕ
چرای رزگاری رێگەی میللەتان  گەنجی علم و فەڕ[3]
باوکی دڵسۆزی ملیۆنەها کەس  کێوی زانیاری
رێپیشاندەری ئایین و مەبەس  ئاشکراو دیاری
تیشکی زێڕینت چرای کوردستان  بۆ شەوی تاری
ئەستێرەی گەشەی ئاسۆی نیشتمان  جریوەداری[4]
مردن لە ئاستت لێوە لەرەی بوو  پرس کەن لەمردن
بەڕۆژ و بەشەو چەرمەسەرەی بوو  بۆ زەفەر بردن[5]

---

(1) شینێك : شینێك شیوەنێك ، گریەو شیوەن بۆ لەدەست چوونی ئازیز ، خۆشەویستێك

(2) پێشەوا: لێرەدا مەبەست لە رابەر ، سەرکردە

(3) گەنجی علم و فەڕ :
گەنج : خەزینە ، کانی چاوگ . علم: زانیاری. فەڕ: باشەو خێرو چاکە
واتە تۆ خەزێنە و کانی و مەڵبەندی زانست و زانیاری بەنرخ و بەکەڵکی بۆ مرۆڤایەتی لە پێناوی سەرفرازی و رزگار بوونی لە جەورو ستەم

(4) بۆ شەوی تاری : بۆ شەوی تاریك و نووتەك یا شەوی تاریك و دەیجور و نابینا

(5) چەرمەسەرە: گێرمە و کێشە، دووچاری ناهەمواری و ناخۆشی - زەفەر بردن : پەی پێبردن ... ئەمە لە ساتێکدا بەکاردێت کە ، مرۆڤێك لەگەڵ بەرامبەرێکیدا کێشەیەکی هەبێ و بۆ چەند جارێك هەوڵی دابێت کە بەسەر کێشەکەدا زاڵ بوو بێت ، کەچی ئەنجام نەیتوانیوە و سەرنەکەوتووە ، سا ئەمە بەهۆی رێکەوتەوە بوو بێت یا بێ توانایی ، بەڵام کە دەرفەتێکی باشی بۆ ئەڕەخسێ و هەلی بۆ رێك ئەکەوێ و کاز و کێشەکە چارەسەر ئەکات ئەڵێ : زەفەرم پێ برد.

چۆن وێرای توخونی چریسکەت کەوێ | وا بەئاســــــانی ؟
---|---
یـــا وەك پەروانـــە روونـــاکی ئـــەوێ | بـــۆ رێگـــا و بـــانی[١]
ئـــەبێ مـــردنیش کـــە تێگـــەیی لێـــت | بـــــالّی شـــــکاوە
هەڵئـــەپروزێ بگاتـــە بـــەر پێـــت | خـــەیاڵی خـــاوە[٢]
بۆیـــە وا تـــوانی بـــە کورنـــوش بـــردن | بگاتـــە بـــەر پێـــت
بگاتـــە راســـتت بـــە ئـــارەق رشـــتن | بگاتـــە نـــاو جێـــت[*][٣]

***

---

(1) توخونی : لێ نزیك بوونەوە

چریسکە : بریسکە، شەوق و رووناکی.

چۆن وێرای توخونی چریسکەت کەوێ : واتە چۆن ویرای لە شەوق و بریسکەکەت نزیك ببێتەوە ، چونکە شەوقی ئاگر تین و گەرمایی هەیە و هەرشتێ لێ ی نزیك ئەبێتەوە ئەیسووتێنێ .

پەروانە — مەبەست لە پەپولەیە کە چۆن بەشەو ماتێ تاریکی دادێت ، ئیتر وێڵ و سەرگەردانی تروسکەی شەوقی رووناکییە، لەهەر کۆیەك رووناکی بەدی بکات خۆی ئەگەیەنێتێ ، بۆیە هەر لەپێناوی گەیشتنی بەو شەوقە لە گڵۆپ و چرا نزیك ئەکەوێتەوە و ئەسووتێ ... دیارە لێکچوواندنێکی جوان دروست بووە لە نێوان شەیدایی و هۆگری مرۆڤ بۆ تیشکی رووناکی زانیاری و شەیدایی پەپولە بۆ رووناکی. هەردوو لایان لە عەشقەکەدا یەك ئەگرنەوە .

(2) هەڵپروزان: بە گۆشتی کەم برژاو ئەوترێ.

کاتێ مەل و باڵندە سەر ئەبڕێ ، جۆرە پەڕێکی وردی باریکی پێوە ئەمێنێ بە سووتاندن نەبێت ناڕوا پێی ئەوترێ: هەڵپروزاندن .

(*) ئەم چەند دێرە شیعرە لە ساڵی ١٩٥٣ دا وتراوە لە میهرەجانێ کەلە (سوسێ) لە مانگی چواردا گێڕدراوە بەبۆنەی کۆچی دوایی گەورە پیاوێکەوە.. وەك دیلانی شاعیر خۆی ئەڵێ : ئەم شیعرە ناتەواوە

(3) کرنووش: چۆك دادان ، مل کەچی و مل نەوی

# بۆ پۆلدی [1]

تۆ بۆم بڵێ بە لەرەی لێو
لێوی ئاڵتر لە بەرگی سێو

لەسەر ((تانگۆ))ی ئاواتی دڵ
منیش و تۆش بێنێتەوە کوڵ ...! [2]

منی کوڕی گەلی ژێردەس
دەنگی کەمتر ئەگاتە کەس !

منی کوڕی نەتەوەی کورد
نیازیان وایە بەدەست و برد

---

(1) پۆڵدی : دیلانی شاعیر ئەڵێ:

پۆڵدی کچێکی ئەڵمانی دەنگ خۆش بوو لە کۆنگرەی ((ڤیەننا))ی ساڵی ١٩٥٣ گۆرانیمان بۆ یەکتر ئەوت : ( ئەو گۆرانی شەڕ نەویستن و من گۆرانی کورد خۆشویستنمان) ئەوت

(2)تانگۆ : جۆرە ئاواز و گۆرانیەکی سەما و هەڵپەڕکێی ئەوروپاییە و باو و برەوێکی زۆری هەیە .

دیلان ئەڵێ : ئەو گۆرانییەی کە پۆڵدی وتی : گۆرانیەك بوو لە هۆڵی بێتهۆڤن مۆسیقای سەمای تانگۆیان لەسەر ئەکرد

بیکەن بە گۆشت بۆ (غوولی)شەڕ
وولات پاکژکەن بۆ لەوەڕ ..! (1)

منی کوڕی گەلێکی دوور
لە دنیای نوێی پڕ گوڵی سوور

نیازی وایە چاو سووری شەڕ
ئاشتی پیلان بخاتە گەڕ

هەڵچنێ ئێسك و لاشە
هەرزان بێ بۆ داڵ و واشە

من بۆم وتی بەستەی قژ کاڵ
بۆم باس کردی گوڵاڵەی ئاڵ

چۆن بەخوێناوی قوربانی
گەشەی کرد و شادمانی

رووی کردە وەنەوشەی روو شەنگ
لە خۆیدا تارای رەنگاو رەنگ ..!

---

(1) غوولی شەڕ : شەڕ خواز مەبەست لە ئیمپریالیزمی رۆژئاوایە کە هەمیشە لە پێناوی بەرژەوەندی و چاوچنۆکی و چڵیسی و تەماعی خۆیاندا ئێڵەی ئاگرو شەڕو مردن خۆش ئەکەن .

وڵات پاکژ کەن بۆ لەوەڕ : مەبەست لەوەیە کە داگیرکەرە ئیمپریالیزمەکان هەمیشە هەوڵی سەرکوتانەو نەهێشتنی هێزی بەرگری میللەت ئەدەن بۆ ئەوەی کەسێك نەمێنێتەوە رووبەڕوویان بوەستێ

تۆش بۆت وتم بەلەرەی لێو
لێوی ئاڵتر لەبەرگی سێو

وتت : ئێمەی گرِی شەڕدیو
بە کۆمەڵ لەخاکا رزیو

نابین بە پێشەنگی ئاگر
نابەینە سەر کەلی باگر[1]

ئیتر ... دەستی جوانی و هونەر
دەستی (مۆسیقا)و دۆستی فەڕ

ئەنێینە ناو دەستی گەلان
(ئاشتی) ئەڵێین لەگەڵ مەلان

منیش وەك بۆم وتی (نەورۆز)
گۆرانی کۆنی گەل و هۆز[2]

---

(1) نابین بە پێشەنگی ئاگر : واتە نابین بەسووتەمەنی و گڕ خۆش کردنی ئاگری ئەو شەڕەی دژی مرۆڤایەتی و لە پێناوی بەرژەوەندی ئیمپریالیزما هەڵگیرساوە

(2) نەورۆز : ئەو بۆنەو رۆژە پیرۆزە نەتەوەییەی نەتەوەی کوردە کە شاعیران شیعریان بۆ ووتوە لێرەدا مەبەست لەگۆرانی گەل و هۆز شیعرەکەی پیرەمێردی شاعیرە:

ئەم رۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی (کۆنی) کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە

وا دووبـــــــــــاره گــــــــــۆرانی دڵ
ئەمخاتـــــە ســــەر خــــرۆش و کــــوڵ[1]

مــــن بــــۆت ئـــــەڵێم تـــۆ گوێـــت لێبـــێ
ســــــــــڵاو پاســـــــــەوانی رێبـــــــــێ

بابـــــە یــــــەك دەنـــــگ بەیـــــەك ئـــــاواز
دەشــــــت و چــــیا بخەینــــــە پــــــەرواز[2]

بڵــــێین: ئاشـــتی ، ئاشـــتی بـــۆ گـــەل
دەنـــــگ بداتــــــەوە دەمــــــی کــــــەل...

***

(1) ئەمخاتە سەر خرۆش و کوڵ: لێرەدا ئاستی هەرەبەرزی و لوتکەی شەوق و ئارەزوو ئەگەیێنێ سا ئەوە  لە هەر کەلێن و بوارێکی ژیاندا خۆی ببینێتەوە

(2) پەرواز: پەرباز ئەمە بۆ باڵندە بەکاردێت بە تایبەتی بۆ کەو لەکاتی شەرە کەودا یا بۆ کەڵەشێرو سوێسکە ... بەڵام شاعیر لێرەدا بەهەمان ئیقاعی خۆشی و کەیف بۆ هەڵپەرکێ و شایی گێران بەکاری هێناوە .. دیارە کەشادی و زەماوەند ئەسازێ ئەوە ئەگەیێنێ کە سەربەستی و ئاشتی دەشت و دەر و چیای بە ئاوازە خۆشەکەی رازاندۆتەوە و گڕی شەڕ و ناخۆشی تەریوە و دوور کەوتۆتەوە

# ڕووناکی[*]

پەروانە بەشەو چرا ببینێ
بۆ روناکێکەی خۆی ئەسوتێنێ

بۆ نەختێ شەوق و تۆزێ رۆشنایی
ئەبێ بەخەڵوز بۆ (ڕۆژی دوایی)

یا گوڵ خەندەران بۆ بزەی سەر لێو
هێندە ئەبینێ روو گرژ بۆ جنێو[1]

کە بیستی قاقا یا پێکەنینێ
بە جۆرێ کوڵ و جۆشش ئەسێنێ

لە خۆشی گەشکەو زەردەخەنەی دەم
لێک ئەبێتەوە و شەق ئەبا بە خەم

(*) ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٥٤ دا لە رۆژنامەی ژیندا بڵاوکراوەتەوە
(1) گوڵ خەندەران: جۆرە گوڵێکی هاوینەیە و قسەیەکی باوی بەدواوە هەیە و ئەڵێن:
گەر بەامبەری بوەستی و پێی پێبکەنی گوڵەکە لەداخا دەم ئەکاتەوەو شەق ئەبات

یا گوڵی گەورەی گوڵەبەڕۆژە
ئەزانی بۆچی هەر رووەو رۆژە ؟

چۆن رۆژ بگەڕێ مل ئەچەرخێنێ
کە ئاواش بێ بۆی دۆش دائەمێنێ

پەرۆشی تیشکی زێڕینی ئەوە
بێزاری سزاو ناڵینی شەوە ! [1]

ئەمانە هەموو بێ گیان ، بێ زمان
بێ دەست و بێ گوێ ، بێ ناو و نیشان

بێ بیر کردنەوە ، بەبێ جوڵەی دڵ
بەبێ ترس و لەرز ، بێ دوو دڵی و سڵ

---

(1) شاعیر لەو بەیتەدا ئەو بەند و باو و حوکمە سەخت و گرانەی لەسەر گوڵە بەڕۆژە هەڵگرتووە کە گوایە نیشانەی بێ باری یە ؟ لای شاعیر وانەکەوتۆتەوە زۆر بەناسک پۆشی و جوانی یەوە ئەڵێ: روو وەرچەرخاندنی گوڵە بەڕۆژە رووە و تیشکی خۆر پەرۆشی گوڵەبەڕۆژە ئەگەیێنێ بەرامبەر تیشکی زێڕینی خۆر و بێزاری لە سزاو سەختی تاریکی شەو

لــه دووی روونــاکی و شــادی عــەودالن
دوژمنـــی شـــەو و شـــەوگاری تـــاڵن[١]

بـا ئێمـــەش وەك ئـــەو گـــوڵ و مێــرووە
کـــە بـــۆ روونــاکی و گەشـــە تێنـــووە

بـۆ گەشـەی گـوڵی سەربەسـتی و شـادی
بـــــۆ هــــــەڵهاتنی رۆژی ئـــــازادی

ئێمـــەی بـــۆ بـــادەی رزگـــاری تێنـــوو
ببین بە خـەڵووز ، ببین بـە سـووتو[٢] ..

***

(1) عەودالی: بە پەرۆشن، وێڵن بۆی.

(2) بادەی رزگاری: مەبەست لەسەر مەستی مولّ و جۆشی تێکۆشانە کە وەك بادە ئەیخاتە سەر ئەو هەواو هەوەسە.

# قوربانییەکانی نەتەوە(*)

١٩٥٤

بیخـــەرە گـــەردن ، پـــەتی جـــەڕاوت
بیخـــەرە ســـەر پـــشکۆ نێـــچیری راوت(١)

گـــیر کـــە لەجەســـتە نینـــۆکی ســـوورت
بیگەێنـــە گـــوێ زەمزەمـــەی دوورت(٢)

---

(*) ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٥٤ دا لە رۆژنامەی ژیندا بڵاو کراوەتەوە ... ئەگەر چی ساڵی ١٩٥٣ وتراوە.

نەتەوەی زیندوو ئەنجامی خەبات و تێکۆشانی بێ وچان قوربانی پێشکەش ئەکات و باجی ئەو هەوڵ و تەقەلایەی ئەدات

(1) پەتی جەڕاوت: جاران و دوای بڕیاری دادگا گەر یەکێ بەتاوانبارێکی زۆرگەورە بزانرایە و سەخترین بڕیاری دوایی دادگا خنکاندن بوو ، ئەو تاوانبارە سێدارەی بۆ هەڵئەخراو بەپەتا ئەکرا ، پەتی جەڕاوت نیشانەیە بۆ ئەو پەتەی مرۆڤی پێ ئەخنکێنرێ .

(2) گیرکە: قایم کە.

جەستە: لەش ، ئەندام کۆی مرۆڤ.

نینۆکی سوورت : ئەو نینۆکە خوێناویەیە کە بەخوێناوی جەرگی رۆڵەکانی میللەت دەست و پەنجەی ئیمپریالیزمی پێسوور بوو.

زەمزەمەی دوورت : بەزم و زەمزەمە : واتە ئەو کارو کردەوە سەر سوڕهێنەرانەی لە سەرتاپای وڵاتا ئەکرێ .

بیخەنـــە ... ژووری تـــاریکی زینـــدان
شـــەبەق بخـــەرە جێـــی قـــەپ و ددان[١]

گـــڕ بەربـــدەرە خاشـــاکی لاشـــە
گۆشت هـەرزان بکـە بـۆ داڵ و واشـە ...! [٢]

ئێـــسقان ورد بکـــە ســـەر بپەڕێنـــە
جومگـــەی ئـــەم و ئـــەو لێـــك بترازێنـــە[٣]

بـــبڕە ، بکـــوژە ، بکـــە بـــە ســـووتوو
فـــوارەی خـــوێن بخـــە نـــاو قـــوڕگی تێنـــوو

مەســـت بـــە بەجـــەرگی بـــرژاو و پـــارە
بـە خـوێن رووناك کـە ئـەم شـەوە تـارە ..!

---

(1) شەبەق: دەلاقە ، کون ... مەبەست برینێکی گەورەی جەستەیە

(2) خاشاکی لاشە :

خاشاك: پۆش و کاو کۆڵ .

خاشاکی لاشە: بەواتەی ئێسك و پروسکی سووتاو یـان خۆڵـەمێش و سـووتووی لاشـەی سووتاو.

واشە: باڵندەیەکی بەهێزی دەنوك تیژی گۆشت خۆرە.

(3) بترازێنە: لێك بکەرەوە ، لە شوێنی خۆی دەری بێنە

بـا.. تەنگـەی ئەسـتوور ، چەشـی دارکـاری
مەســـتی ئـــازاردان پێـــی گوناهبـــاری[1]

هەڵپـــەڕێ لەســـەر ئێـــسکی ئـــەم و ئـــەو
قاقـــای تێکـــەڵکا لەگـــەڵ قاسـپەی کـــەو

بـــا.. پیـــشەی ســـنگی کـــراو بـــەدارا
بکـــا بـــــە تـــاری بەزمەکـــــەی دارا[2]

بـــا.. ئـــەم بـــسوتێ ، ئـــەو ببـــێ بـــەخۆڵ
ئـەم بـە قاوورمـە، ئـەو بـە شـیپەی چۆڵ[3]

---

(1) تەنگەی ئەستوور : ناوقەدی ئەستوور .. مەبەست لەو ستەمکارو خوێن مژانەیە کە لەسـەر هـەوڵ و تەقـەلا و هێـز و بـازوی چەوسـاوەکان ورگیـان زل ئـەبێ و قـەدیان ئەستور ئەبێ

(2) با پیشەی سنگی کراو بەدارا : مەبەست لـەو تێکۆشـەرانەیە کـە کـارو پیـشەیان قوربانیەو ئەکرێن بە سێدارەدا

(3) قاوورمـە : جـاران لەبـەر نـەبوونی هۆیـەکانی پێشکەوتن و ژیـانی و گـوزەرانێکی باشترو سەختی و دوورو درێژی زستانیش لەو لاوە بووەستێ ، لەبـەر ئـەوە زۆربـەی دانیشتوانی شاری سولەیمانی لە هاوینـان مـەڕ (بـەرانیان) دائەبەسـت و تـا تەنگـەی پایز بەخێویان ئـەکرد بـەران قەڵـەو ئـەبوو ، ئەوسـا سـەر ئـەبڕا و گۆشـتەکەیان بـە پارچە پارچەیی لەناو رۆنە دووگدا نیمچە سوور ئەکرایەوە و پـاش ساردبوونەوە لـە هیزەدا سەری بە رۆنە دووگ دا ئەپۆشرا و بۆ زستان هەڵئەگیرا بەکار ئەهێنرا ، ئەمە پێیان ئەوت: قاورمە

چــی لــەوە ... مێــزی رازاوەی ئــەوێ
دەســتکاتە ملــی قــەد باریــك شــەوێ

زرەی پیاڵــە و فنجــان مەبەســتە ..!
شــەرەف تــۆ بــڕۆ هــیچ رامەوەســتە ..!

بــا خــەڵکی هــەموو قەڵاچــۆ بکــرێ
تەقــەلاو رەنــج و ســامانی بــبرێ

سـا ئـەوی دەسـتی دار بگـرێ بـە حـاڵ
لـە گـڕی شـەڕدا بـێ بـە کـۆی زوخـاڵ[1]

لەبــەر مــەرامی پیــسی داگیرکــەر
جـەردەی (ئایـەتی) خـوێن رشـتن لەبـەر[2]

---

(1) سا ئەوی دەستی دار بگرێ بەحاڵ : مەبەست لەوانەیە کەلەبەر بێ هێزی و لاوازی دەستیان بە ئاستەم دار ئەگرێت ، ئەمە زیاتر ئەو کوڕ و کاڵە تازە پێگەیشتوانە ئەگرێتەوە کە گەنگە موویان لێ نەهاتووە .

دار: لێرەدا بەواتای رێگای هەوڵ و تەقەلا و تێکۆشانە .

بێ بەکۆی زوخاڵ : ئەوەندە بسووتێ ببێ بەخەڵوز.

(2) مەرام : مەبەست.

بمـــرێ نیـــشتمان ، بـــسووتێ میللـــەت
بـــژی ژێـــر دەســـتی، بمێنـــێ زیللـــەت.. ! [1]

بـــەڵام ... پـــشکۆی ژێـــر خۆڵـــەمێش و ژیـــل
گـــوێ هـــەڵخراوی دەنگـــی زەنـــگ و زیـــل

ئـــەویان مەڵاســـــی بـــــای تۆڵەســــەندن
ئـــەمیان چـــاوەڕێ خرۆشـــی (هەســـتن) [2]

کـــە ئـــەو هـــەڵی کـــرد ورد گەشـــایەوە
ئـــــەمیان ئـــــاوازی دەنگــــی دایــــەوە

---

(1) ئەم بەیتە شیعرە بە زمانی داگیرکەر و ستەمکار و نەیارەوە وتراوە.
نابێت : ئەم بەیتـە لـە تێکڕای شـیعرەکە دابـبڕێ و بەتـەنیا بـوترێ ... دەنـا واتاکـەی ئـەخنکێنرێ و وەك ئایـەتی (ولا تقربـوا الـصلاه...)لێ دێـت گـەر بەشـەکەی دوای نەوترێ کەئەمەیە .. (ان کنتم سکاری). مەبەست ئەوەیـە : داگـیر کـەر هـەر زمـانی خوێن رشتن ئەزانێ ئیتر با میللەت بمرێ

(2) مەڵاس: خۆی مەڵاس داوە ، خۆی مت کردوە ، خـۆی مـات داوە ، بـێ چـرکە، بـێ چرپە، بێ سرتە.
– خرۆش : هەڵچوونی کەف و کوڵی سۆزی دەروون

ئەوسا نۆرەی گورز ئەکەوێتە دەس

گەلی داخ لە دڵ بە بەزم و هەوەس[1]

کۆزەر و پەربای وائەکا بەشەن

چەرخ نەیدیبێ مەگەر بەدەگمەن[2]

ئەو سا هەچ کەسێ لە مەیدانا مرد

جێی شانازی یە بۆ نەتەوەی کورد

***

(1) گورز : بەو دارە ئەوترێ کە سەرێکی کەمێك خڕ و ئەستوورە و بۆ لێدان بەکار ئەهێنرێ، گەلێ جاریش گورز بەو کارە ئەوترێ کە (فرمان)ەکەی تیا بەجێ ئەهێنرێ ، وەك ئەڵێن: (گورزی خۆت بوەشێنە، نۆرە گورزی خۆمە).

(2) کۆزەرە : کاتێ دانەوێڵە بۆ جیاکردنەوەی کا و کۆتەڵەکەی شەن و کەو ئەکرێت ئەمە لەبەر (با) بەجێ ئەهێنرێ .. دوای ئەوە گەلێ جار بە (بێژەنگ) و (کەو) بەکار ئەهێنرێ بۆ گرتنی سەر کۆزەرەکە واتە ئەو گەنمە یا نۆك یان نیسك ئەخرێتە بێژەنگەکەوە و گیژ ئەدرێت هەرچی دارو کا و کۆتەڵە سەر ئەکەوێ و بەچنگ ئەگیرێ و فرێ ئەدرێ ئەمە کۆزەرەی پێ ئەڵێن

# بەهار

## ١٩٥٣

وا بەهار دیسان تارای ئەپۆشێ
گوڵاڵە پیاڵەی خوێنین ئەنۆشێ[1]

نێرگس ئەندام شۆڕ ڕەنگی زێڕینی
وەنەوشەو کڕنووش پەرەی چین چینی[2]

هاژە هاژی ئاو، هاڕە شەتاوان
بریسك و هۆڕی نزار و کاوان

تریق و هۆڕی خونچەی داری باخ
خوێندنی مەلی قەڵبەز و سەر شاخ

---

(1) گوڵاڵە پیاڵەی خوێنین ... ئەنۆشێ :
– ئەنۆشێ: ئەخواتەوە.
واتە ( گوڵاڵە بۆیە ڕەنگی سوورە ، چونکە بەخوێن ئاودراوە و پیاڵە خوێنی خواردۆتەوە .
(2) نرگسی ئەندام شۆڕ: نێرگسی گوڵ شەست پەڕی قورسە بۆیە بەلای لاسکەکەیدا شۆڕ ئەبێتەوە .
ـ وەنەوشەو کڕنووش : دیسان گوڵە وەنەوشەش کەمێك بەلای لاسکەکەیدا لار ئەبێتەوە، ئەو لار بوونەوەیە خۆی لە خۆیدا نیشانەی نەوازشی یان کڕنووش بردن بۆ هاتنی بەهار ئەگەێنێ.

دەنگی شمشاڵ و بەستەی دڵ فڕێن
تەنگوچەڵەمە زستان راو ئەنێن ..! [1]

خونچەی درەختی ژیاوەی بەهار
شەرپەتی لەگەڵ شەماڵی نزار

ئەو.. ئەڵێ شاباش لە گوڵاڵەی هەرد
ئەم.. ئەڵێ ئەخێر بە شنەی بێگەرد[2]

---

(1) راستە کاتێ هاژە هاژی ئاوی چەم و هاڕەی شەتاوی بەهاردێت و نزاریش نێرگزەجاڕی هەزار رەنگ ئەنوێنێ و لەولاشەوە خونچە ئەپشکوێ و مەل بە شەوقەوە ئەخوێنێ و شوانیش حەیرانی ئەو دیمەنانە ئەبێت و لێو بە شمشاڵەکەیەوە ئەنێ و فووی پیا ئەکات و ئاوازی خۆش پێك ئەهێنێ ، هەر هەموو ئەوانە کە نیشانەی هاتنی بەهارن ، زستان بە سەختی و تووشیەوە راو ئەنێن و هەڵدێت

(2) هەرکە زستان بەسەر ئەچێت و بەهار دێت، دارو درەختی بەردار، بەر لەوەی گەڵا و شینایی دەرکەن ، بەری درەختەکە لە شێوەی خونچەی گوڵدا ئەپشکوێ .. شاعیر زۆر جوان دیمەنی ئەو خونچەیە و شەماڵمان نیشان ئەدات کە چۆن خونچەی (ئەو) درەختانە پیرۆزبایی و شاباشی مژدە و هاتنی بەهار بە پەڕەی گوڵاڵەکاندا ئەدەن کەچی لەم لاوە (ئەم) شنەی شەماڵی دەم نزار بوونی خۆیی و هاوپەیمانی لەگەڵ گوڵاڵەدا نوێ ئەکاتەوە

گوڵان دێنمە لەنجەو هەڵپەڕین
ئەیان هێنمە گەشەو پێکەنین ..!

بەڵێ ... ئەمساڵیش ئەگریجە پەخشان
هەمدیسان بەهار خۆی ئەدا نیشان[1]

بەڵام ئینسانی نیشتمانی ... دیل
پێ بەزنجیر و ژێردەست و زەلیل

کۆماوەی باری گرانی دوژمن
ناوچەوان لۆچی زووخاوی بێ بن[2]

پشت داڕزاوی قەمچی و دارکاری
روومەت قوپاوی ئاخی هەژاری

پێ لە خرتکە چووی بەردی هەردی دەرد
رەنگ هەڵبزڕکا و بە هەناسەی سەرد ..! [3]

---

(1) پەخشان : بڵاو ، ئەگریجەی پەخشان ، ئەگریجەی بڵاو

(2) ناوچەوانی لۆچ: ناوچەوانی گرژو مۆن .. لە ئەنجامی تووڕەیی و ئازار پێگەیشتن چرچ ئەکەوێتە ناوچەوان و لۆچ دروست ئەکات

(3) پێ لە خرتکە چوو: ساتێ خرتکە گەورەکانی پێ لە ئەنجامی رۆیشتن و هەڵبەز و دابەز بەسەر هەرد و بەردا لەجێ ئەچێ، مرۆڤ دووچاری ژان و ئێش ئەکات.. ئەمە واتای کەند و کۆسپی رێگای تێکۆشەرانی میللەتیش ئەگەیێنێ.

رەنگ هەڵبزرکاو : گەلێ جار مرۆڤ لەئاکامی کار و هەڵوێست و ترسێکی کت و پڕدا رەنگی زەرد ئەبێت ، یان کە هەواڵێك و باسێکی نائاسایی ئەبیسترێ رەنگ زەرد ئەبێت ، ئەڵێن : رەنگی هەڵبزرکا.

ئەگەر حەیای بەهار و گوڵی
درەخت و چرۆ و گەڵا و چڵی

کە دی ئینسانی (سەرۆکی) وایە
ئەبێ خۆی دواخا و نەیەتە کایە(١)

شەرتێ ببەستێ لەگەڵ ئینسانا
لەگەڵ تاریکی شەوی زیندانا

تا شەکەی نەیە ئاڵای ئازادی
نەیەتە بەر گوێی مۆسیقای شادی(٢)

نەیەتەوە قوڵ سەرچاوەی ئاوات
گەل رزگار نەبێ بە زەبری خەبات(٣)

---

(1) کایە : سەرە ، ریز، نۆرە منداڵ کاتێ یاری ئەکا و سەرە دێتە سەر کاتی ئەو : لەبری ئەوە بڵێ : نۆرەی منە ، ئەڵێ کایەی منە

ئاڵا: بەیداخ.

(2) تا شەکەی نەیە ئاڵای ئازادی:

شەکە: لەرانەوە ، جولاندنەوە واتە تا نەلەرێتەوە ئاڵای ئازادی ..

(3) زەبر: بەهێز ، بەدەسەڵات ،بە توانا.

بەزەبری خەبات : بە هێزی خەبات ، بە توانای خەبات

ووړد نـــــــەبێ کەلەبــــــچەو زنجـــــــیر
گۆشـــــتەوزوون نـــەکا برینــــی جــــێ تـــیر[1]

نـــــەڵێ بـــــەهارم نـــــەڵێ شـــــای فەســـــڵم
نـــــەڵێ جێــــی راوگــــەی ئـــــارامی وەســـــڵم

نـــــــــــەڵێ ئیکـــــــــسیری بزوتنـــــــــــەوەم
نـــــــــــەڵێ هـــــــــەتاوی گەشـــــــــاندنەوەم[2]

***

(1) قـەفی کەلەبـچە: ئەسـتووری کەلەبـچە: ئـەڵێ قـەفی ئـەو دارە، قـەدی ئـەو دارە ئەستوورەی ئەو دارە. قەف: گەلا جار بۆ قـەد دێـت وەك ئـەڵێن : ئـەو زنجـیرە دوو قەف بەسەر یەکدا شکاوەتەوە .

گۆشتەوزوون : ساتێ شوێن برینێك سارێژ ئەبێتەوە و پێـستێك دروسـت ئـەکات. جـۆرە خروویەك پەیدا ئەبێت ، لەم سـاتەدا ئـەوترێ ئـەوە شـوێن برینەکـە گۆشـتەو زوون ئەهێنێتەوە ، واتە چاك ئەبێتەوە .

(2) ـ ئیکسیر: دەرمانێکی کیمیاوی یە و تێکەڵ یان روو پۆشی هەندێ کانزا ئەکرێت ، نرخی ئەو کانزایە زیاد و بەهادار ئەبێت .

ئیکسیری بزوتنەوەم: ئیکسیری ژیانم.. دیارە مەبەست لە ژیانی زیندەوەرانە

# گــــورپـــــه(*)

١٩٥٣

خت خــت خت خت
چاو مۆڕی مـــت(١)

چـــاو زیـــتــی گەڕ
وەك شمـڵی شـەڕ(٢)
دێی بـــۆ لـــەوەڕ
بۆ خواردنی کۆترەکانم ..؟!

خت خت خت خت
چـــاومـــۆڕی مت
مـــەشـــکــە دڕە
سەر هــــەڵبڕە(٣)

(*) ئـەم شـيعرە سـاڵی ١٩٥٣ دانـراوە و ١٩٥٤ لـە يـەکێ لـە ڕۆژنامـە سياسـييەکاندا بڵاوکراوەتەوە

(1) – خت خت: جۆرە دەنگێکە بۆ دەرکردن و وریا کردنەوەی پشیلە بەکاردێت.

ـ مت: بێ دەنگ، لەسەرخۆ.

(2) شمڵی شەڕ: شەڕەنگێز ، شەڕانی ، شەڕخواز .... مرۆڤی شیرین کوژ، واتـە حـەز بە کوشتنی مرۆڤیش ئەگەیێنێ.

(3) مەشکە دڕە: ئەو مەشکەیە، جاروبار جۆرە مێرویەك تێی ئەدات و کـونی ئـەکات و ئـەدڕێ .. جـا گـەڵێ مەشـکەی پـڕ لەکـەرەو دۆش ، پـشیلە ئەیـدڕێ و کەرەکـەی ئەخوات.

سەریان پڕە
لەپاسکەری مەلەکانم

***

ئەتەوێ نێچیر کۆتر بێ
دەستەمۆو ماڵی و هۆگر بێ[1]

یەکە یەکە بیانخنکێنی
پەڕ و پۆیان لە لەش دەربێنی
دەم و سمێڵ بە خوێن ڕەنگکەی
وەك جاران پەنای بێ دەنگکەی[2]
ئەمجارە کولانەم بەرزە

---

(1) دەستەمۆ و ماڵی و هۆگر بێ :
ماڵی: رابهێنرێ ، کە مەلێکی تازە لە شوێنە ئەسلیەکەی خۆیەوە بۆ شوێنێکی نوێ ئەگوازرێتەوە، ماوەیەکی ئەوێ تا شارەزای لانەکەی خۆی ئەبێت ، ئەو سا پێی ئەوترێ : راهاتووە یان ماڵی بووە

(2) پەنای بێ دەنگ: شاعیر بێدەنگی پشیلە(گورپە)ی چواندوە بەو یارییە.کۆنەی جاران ئەکرا ... کۆمەڵێ لەناو خۆیاندا رێك ئەکەوتن کە یاری پەنای بێدەنگ بکەن ، هەمووان جگە لە یەکێکیان بێ دەنگ خۆیان لە پەنایەکدا ئەشاردەوە ، ئەو کەسەش بەلایاندا تێئەپەڕی و زرمەی لێ هەڵئەسێنرا، سا پشیلە گورپەش گەلێ جار بێدەنگ و لەپەناوە پەلاماری کەو یان جوجەڵە یان کۆترێك ئەدا و سلی ئەشکێنێ کەچی ناشی خوات.

چەکم سەد جۆرە سەد تـــەرزە[1]
تــۆش بـــڕۆ لاواز ، دان لـەقی
هەر وەك پێشکەشی شڕ و شەقی
***
خت بڕۆ بۆ قـــوژبن و چـــاڵ
بۆ خـــزمەت مووزەردی چاو کاڵ
ئـــەوەی نـــاردووتی بۆ مووشە
خـۆی لای تۆ خراپترتووشـــــە[2]
بـڕۆن هـەردووکتان بە جووتـــە
مـایەتـان پووچەك و پـــووتـــە

***

(1) گورپـــە: نیـشانەیە بـۆ داگیرکـەر و ئیمپریـالیزم ، کـۆتریش نیـشانەیە بۆنەتـەوە چەوسـاوەکان، سـا ئێـستا میللـەتان وەك کـۆتر کـە چـۆن لەهێلانەکـەی خـۆی لەشـوێنێکی بـەرزدا دروسـتی ئـەکات بـۆ ئـەوەی پـشیلە زەفـەری پێنـەبات.... میللەتانیش بەهەمان شێوە و سەدان جۆر دژی ئیمپریالیزمی جیهانی تێئەکۆشن

(2) مووشە : خواردنی ماڵی ئیف ، هاوانتە .

ـ تووشە : دوچار بوون ، تووش بوون.

## لاوك(*)

**کیژ:**

هۆ کاکەی شوان، کاکەی ناو شاخ
چاوەڕێی سۆزە، گوڵی باخ
ڕاوەستاوی سیحری فووتن
ئاوارە و سەرسامی خووتن
هۆ کاکەی شوان، کاکەی قەدپاڵ
کەرەك لەبەری پشتێن شاڵ
لاکەرەوە بڕوانە دوور
بڕوانە دەشتی سەوز و سوور
بڕوانە بریقەی نزار
بڕوانە دەریای لالەزار
بیانهەژێنە بەشمشاڵ
بیانهێنەرە ناڵە ناڵ

**شوان:**

هۆ کیژی شەنگ، هۆ کیژی شەنگ
مەیفڕێنە خەیاڵی مەنگ

---

(*) ئەم شیعرە لە ژمارە (١١٤٣)ی ٣/٤/١٩٥٣ی ڕۆژنامەی ژین وەرگیراوە، کە بەناوی (م.ص.د) بڵاوکراوەتەوە

مەستی بۆنی گیای شاخانم
گێژی بریقەی داخانم
سەرسامی چریکەی بەردم
ئاوارەی گولاڵەی هەردم
شەکەتی رۆژی بەهارم
تینووی خاڵ خاڵی نزارم
دوای پەپوولەی رەنگین کەوتووم
بۆم نایە فووم، بۆم نایە فووم

**کیژ:**

هۆ کاکەی شوان، کاکەی ماندوو
ماندووی رۆژگاری رابردوو
بەس رایوەشێنە گاڵۆکت
بەس لە دڵ گیرکە نینۆکت
دەم بخەرە سەر خونچەی دەم
با بپشکوێ گوڵی ناوچەم
تۆزێ تینوێتیت بشکێنە
تۆڵەی خۆت لە من بسێنە
منیش وەك تۆ لەش پڕ زامم
هەر وەك تۆ جەستە و ئەندامم

هیلاکی کاری بێ بەرە
کون کون و پڕ کەلەبەرە
وا هەردووکمان بۆ درێژی ساڵ
رەنج ئەدەین بۆ چاوێکی کاڵ
ساڵ دوانزە مانگ هەرداو هەرد
من شەو و رۆژ مەینەتی دەرد
نەك من و تۆ هەموو هەموو
بەهەزار نەوەك یەك و دوو
ئەبڕێ بۆ یەکێ، بۆ ناوێ
بۆ بتێ، هەیکەلێ، چاوێ
دواییمان هەر هەناسەی سەرد
من بێخەوی و تۆ هەردوبەرد
بیهێنە جۆش لوولکی دەم
پێی بەبادەین ئازار و خەم

**شوان:**

هۆ کیژی جوان، هۆ کیژی جوان
ورد وەرە پێش نەرم و نیان
مەیبڕەوە حەیرانی دڵ
باسۆزی لاوك بێتە کوڵ
ژێر بەڕووبێ شوێنی گوفتار

بۆم مۆڵدە رانی بەرخ و کار
بێ، سەرێ کەمە سەر رانت
چاو برمە هەردوو چاوانت
دەم بخەمە سەر گوڵی گەش
تۆزێ دەرچێ هیلاکی لەش
ئەوسا تین یەتەوە گیانم
پێی سارێژ ئەبێ زامانم
لێی ئەدەم بە فووی دوو لێوان
هەی هاوار ئامان سەد ئامان

کیژ:

هۆ کوڕی شۆخ، هۆ کوڕی شۆخ
تەزووت گەیانە ئێسک و مۆخ
گەیانتە گیانی هیلاکم
گەیانتە ناو سینەی چاکم
بەڵام وا کەوتەوە بیرم
رایوەشان تەوق و زنجیرم
ساردی گەیانە جگەرم
قورسی خستە تەوقی سەرم
پێش بردنی هەڵاڵەی لێو

بــــۆ شـــــانەی دڵـــی ســـــەودای کێـــو
بیرکەینــــــەوە لـــــــە بـــــــەهارێ
لـــــــە ڕۆژێ، دەرمـــــــانێ، چـــــارێ
رزگارمانکـــــــا لـــــــەدەرد و خـــــــەم
ئـــــــازار نــــــەمێنێ زۆر و کــــــەم
بــــــەری ڕەنجــــــی فراوانمـــــــان
بــــــۆ خۆمـــــان بێـــــت و باوانمـــــان
پێـــــی ســــــاڕێژکەین برینــــی لــــــەش
تـــــانووت بـــــەین لــــە گوڵاڵـــەی گـــەش
هەڵکێـــــــشین هەناســـــــەی پـــــــشوو
بینێــــــــژین یـــــــادی رابـــــــوردوو

هەردووکیان دەست ئەکەنە ملی یەکتری و بەهەڵپەڕکێوە ئەڵێن:

هــــۆ ئاســــۆی ســــوور، هــــۆ ئاســــۆی ســــوور
خـــــۆت دەرخـــــە لـــــە دەمکـــــەلی دوور
لەگـــــــەڵ ئاســـــــۆی ئەرخـــــــەوانی
دیــــــاری تــــــۆبێ کامــــــەرانی

***

# نەورۆز (*)

١٩٥٣

ئـــــــاوڕێ ... ئـــــــاوڕێکی دوور
لــــە ڕۆژێ .. ڕۆژێکـــــی ســــوور [١]
ئـــــاوڕێ لــــە ڕۆژێکـــــی ســــوور
لـــــە تــــــەختێ هەڵگەڕایـــــەوە [٢]
لـــــەکارێ دەنگـــــــی دایـــــەوە
لەگـــــەڵا چـــــۆن ژیایـــــەوە
ئـــــاوڕێ .. لــــــە قیامــــــەتێ
لــــە یــــادێ .. یــــادی میللـــەتێ [٣]
کـــــــە ڕاپـــــەڕێ لەخـــــەو
بەرامبــــــەر ســــــامی شــــــەو [٤]

---

(*) ئەم شیعرە لەساڵ ١٩٥٣ دانراوە و ١٩٥٤ لە ڕۆژنامەی ژیندا بڵاوکراوەتەوە

(1) ئاوڕێکی دوور : گەڕانەوە بۆ باوەشی مێژووی ڕاپەڕینەکەی کاوە کە کەوڵەکەی بەرۆکی کرد بە ئاڵا و ڕوو بە ڕووی ئەژدەهاکی ستەمکارا ڕاپەڕی.

(2) لە تـەختێ هەلگەڕایـەوە: مەبەست لـە شـکۆ و تـەخت و دەسـەڵاتی پاشـایەتی زوحاکە.

(3) لـە قیامـەتێ: مەبەست جـۆش و خرۆشـی هەڵسانی نەتـەوەی کـوردە بەرامبـەر (زوحاک)ی خوێن مژ.

ـ یادی میللەتێ: یادی ڕاپەڕینی نەتەوەی کورد بەرامبەر زوحاک.

(4)سامی شەو : ترسی شەو

بۆ گزنگی رۆژێکی نەو ..!!
ئاوڕێ .. بێتە عیبرەتی[1]
بۆ زاڵمێ ، دارێ ، پەتێ
یا بۆ .. وەچەی (زوحاک)[2]
هیتلەر و چار و ماک
بۆ کۆشکی بوو بەخاک

ئاوڕێ لە چەکوش بەشان
لە کۆڕێ.. کۆڕی قارەمان
ئاوڕێ.. لە چەکوش بە شان
لە کاوەی قارەمان
کە سنگی کردەوە
گەلی لە پشتەوە
گرەوی بردەوە[3]

***

---

(1) بێتە عیبرەتێ: ببێتە پەند ، پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن

(2) وەچەی زوحاک: هەموو خوێن رێژ و ستەمکارێکی ئەم دنیایە ئەگرێتەوە بە نموونە: هیتلەری ئەڵمانی نازی و مۆسولونی ئیتالیای فاشست و چاری رووسیای قەیسەری و ماکی ئارسری.

(3) گرەوی بردەوە: کاتێ راپەرینێ گرەو ئەباتەوە وەکو میللەتی لەپشت بێت و ئاکامی سەرکەوتن مسۆگەر ئەکات

# کونه پەپووی شەڕ[*]

١٩٥٤

تـــــۆ بخوێنـــــــه هێلانــــــــەواز[1]
ئــــەی دوژمنـــــی جریـــــوەو بـــــاز
هــــــــاوڕێی دووکـــــــەڵی ناســــــاز
مـــــشك و مــــــار بێنـــــەرە پـــــەرواز
تـــــۆ بەقریــــــشکەی ســـــــاماویت
چــــــاوی بــــــەفرو فێڵاویـــــــت[2]
بــــــاڵی ژاکـــــــاوی خوێناویـــــــت
چــــــنگی تیــــــژی خوێناویـــــــت

---

(* ) ئەم قەسیدەیەی دیلان لە ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٥٤ دا لە (تووی مەلیك — شاری سلیمانی) خوێندراوەتەوە

(1) کونە پەپووی شەڕ: شەڕەنگێز ، شەڕخواز ، ئیمپریالیزمی خوین مژ.

هێلانەواز:

واز: کراوە

هێلانەی کراوە، هێلانەی بەڕەڵڵا.

(2) تۆ بە قریشکەی ساماویت:

ـ قریشکە: جۆرە دەنگ و هاوارێکی زیقاوی ناسازە و زیاتر ئافەت ئەقیژێنێت یان ئەوترێ ئەقریشکێنێ. مەبەست لەهاوارێکی مەترساوییە.

ئـــــــەوەی ڕۆژ تۆقاندویـــــــەتی[١]
بریقـــــــە .... تەزاندوویـــــــەتی
گەشـــــەی گـــــوڵ تۆراندوویـــــەتی[٢]
ڕوونــــــــاکی فڕاندوویـــــــەتی
وای لێکـــــە تـــــۆزێ دەرکـــــەوێ
کـــــەف و زەرداوی ســــــەرکەوێ[٣]
پرپـــــشکی خــــوێنی بەرکـــــەوێ
ئـــەو ســـەرکەوێ خـــەڵك ژێـــر کـــەوێ
ئـــــــەی پاســــــەوانی کــــــەلاوە
خـــۆت بـــۆ نێـــچیرێك مـــات داوە[٤]
مــــوژدەی شـــــەوگارت هێنـــــاوە
بـــۆ دەســـــتەیێك خـــۆت بـــاداوە[٥]

---

(1) ئەوەی ڕۆژ تۆقاندویەتی: ڕۆژ تیشکی ڕووناکی پەخش ئەکات و تەنگ بە تاریکی شەوە زەنگ هەڵئەچنێ و کاتێ ڕۆژی ئازادیش دێت. ستەمکار و شەڕخواز دەنگی دەفیان نایەت و ڕاو ئەنرێن.

(2) بریقە.. تەراندوویەتی: باق و بریق تەرەی کردووە یا بریسك و هۆڕ تەرەی کردووە.. تەرە بۆ ئەو حاڵەتە بەکار دێت کە مەلێك لە هێلانەو شوێنی خۆی پەڕەوازە ئەبێت ئەڵێن.. تەرە بووە.

(3) کەف و زەرداوی سەرکەوێ : مەبەست لە ئیمپریالیزمە کەبەو هەموو ناهەمواری و زۆردارییەیەوە سەرکەوێ ، کەچی میللەت بەو هێمنیەو بێوەییەوە ژێرکەوێ !.

(4) پاسەوانی کەلاوە: کوننە پەپووە ، چونکە هەر لە کەلاوەو کاولە و وێرانەدا ئەنیشێتەوە

(5) دەستەیەك : مەبەست دەست و پێوەند و نۆکەرەکانیەتی

بەلام ئەوەی لات پۆلایە
خاوەنی زێڕ و تەلایە
بەهێزەو دەوری قەلایە
هەوری ناخۆشی و بەلایە ...!!
ئەوەی لای تۆ قەلای سەختە
خاوەنی تەلار و تەختە
سەرۆکی شادی بەجەختە[1]
رابەری خۆشییە.. بەختە
پووچ تر لەداری گەننەڵ
پیس ترە لە رێوی دەغەڵ[2]
لای بازە ، سیسارکە کەچەڵ
بێشەرمە ، گروێیە ، چەپەڵ[3]
رزیوترە لەلاکی چاڵ
رەش ترە لە رەشی زوخاڵ[4]

---

(1) لەدیوانی دیلانی ساڵی ١٩٦٩ دا ئەم دێرە بەم جۆرە نووسراوە : "سەرۆکی شادی و ختە" کەچی لە دەستخەتێکی شاعیر دا بەو جۆرە نووسراوە و من ئەو نووسراوەی دەست خەتی دیلانم لا پەسند تر بوو

(2) داری گەننەڵ : داری پواو و پوچەڵ .

- دەغەڵ : لاواز و ریوەڵە ، گەڕ

(3) سیسارکە کەچەڵ : جۆرە باڵندەیەکی ناشرینی رەشە وەك قەلەڕەش وایەو سەری رووتاوە.. زۆری ژیانی لەسەر لاکی تۆپیو و گۆشتی بۆگەن و رزیوە.

- گروێیە : گەڕاوی ، دەم و چاو پەڵەپەڵ و گەڕ بوو .

چەپەڵ : پیس ، پۆخڵ ، چڵکن.

(4) زووخاڵ : خەڵوز .

بـــێ زراو تـــره لـــه ژاری تـــاڵ
ســـواو تـــره لـــه کۆنـــه نـــاڵ[١]
وا لـــه ترســـی خوێنـــدنی مـــەل
لـــه ترســـی چریـــسکەی دەم کـــەل
لەبـــەر ئـــاوازو ســـۆزی تـــەل
(لەبـــەر نرکـــەو جۆشـــینی گـــەل) [٢]
شـــــپرزەو شـــــێت و فێـــــداره
ڕۆژی لـــــەلا شـــــەوی تـــــاره[٣]
نـــــوێنی لێـــــژ و پـــــڕ لـــــەخاره
خـــەوی لـــەلا ژەهـــری مـــاره .....! [٤]
(لەبـــــەر دەس کردنـــــه گـــــەردن)
ســـامی هـــیچ نـــەماوه مـــردن
شـــــانازییه بـــــەخت کـــــردن
لـــەو کاتـــەیا هێـــرش بـــردن .... !
وا نزیکـــــــــه شـــــــــادمانی

(1) سواوتره لەکۆنـه نـاڵ : نـاڵی ژێـر پێـی وڵاخەبـەرزە لـە ئـەنجامی ڕۆیـشتنی زۆر ئەسووێ و کەڵکی نامێنێ، دیاره کەسانێك له ناڵی سواو بچێ ئەوه هیچ جۆره نرخ و بایەخێکی نیه.
(2) سۆزی تەل: ئەو سۆز و ئاوازەیه که لەتەلی کەمان و عوود بەرز ئەبێتەوه
(3) فێـداره : فێـی لێ دێ ، پەرگـەم ئـەیگرێ ، جـۆره حاڵـەتێکی نەخۆشـی مێـشك و دەماغه و زیاتر کاتییه.
(4) له خاره : له دڕکه .

شەڕە بۆ یەکەم قوربانی
هەر هاکا ژوورە زیندانی
هەرەسی هێناو رووخانی[1]
رووخانی شالاوی گەلم
رایرفان ئاسۆی دەم کەلم
کەوتە جۆشش تار و تەلم
وا بەهار تارای پۆشیوە
خونچەکراوە و خەنیوە[2]
ئەم دەس ئەو دەسی تەنیوە
ترسی بەمردن کڕیوە[3]
کام دەس و کام پەنجە ئەبڕن
کام سک و کام جەستە ئەدڕن
کام دەروون و کام دڵ ئەگرن

---

(1) هەر هاکا: لەپڕێکا، هەر ئێستا، هەر ئەوەندەت زانی، یان کاتێکت زانی.
- هەرەس : روخاندن ، زیاتر بۆ شاخە بەفرێکی بن کەن بەکاردێ، یان خانەیەك بنچینەکەی پتەو نەبێت دوای ماوەیەك ئەڕمێ و ئەڵێن هەرەسی هانی .
(2) خەنیوە : زەردەخەنە ، دەم بە پێکەنینە
(3) ئەم دەس ئەو دەسی تەنیوە : دەست لەناو دەستە و نیشانەی یەك بوون و یەکێتییە

بـۆ کـویٚ بـۆ کـام جێگـا ئـەفڕن ؟[1]
کونتەپـــەپووی باڵنـــدەی شــــەڕ
ئێـــسك قورســـی بـــێ بـــوم و فـــەڕ
گـــوێ لـــە ئاســـتی شـــنەو شـــۆکەڕ
ســـەربال بـــە فرمێـــسکی شـــەو تـــەڕ[2]
روو ئەکەیتـــــە کـــــام وێرانـــــــە
کـــویٚ ئەکـــەی بـــە خانـــەو لانـــە
کـــــویٚ پــــــڕ لــــەبێر و ســـــامانە
جێگـــای هەڵپـــەڕکێی گەلانـــە ...! [3]
وا هێـــــزی ئاشـــــتی و ئـــــازادی
شـــــەپۆل ئـــــەدا بـــــەرەو شـــــادی
ئـــەڵێ ... نـــە شـــەڕ نـــە بـــەربادی
ئـــەڵێ ... خۆشـــی نـــەك ناشـــادی
کوننـــە پـــەپووی چـــاو گێـــژ و وێـــژ
حەســـاننەوە و ئـــارام نـــە چـــێژ[4].

---

(1) بۆ کویٚ بۆ کام جێگا ئەفڕن ؟ : کویٚ و کام ... نیشانەی پرسیارە بۆ شوێن و جێگا ... سەرجەم واتاکەی : مەبەست لەوەیە دوژمنانی گەل بۆ کویٚ و بۆ کام جێگا دەرئەچن .

(2) بێبووم و فەڕ : بێ بووم : بێ زەوی و خاك ، ئەڵێن بوومەلەرزە واتە لەرزانی زەوی بێ فەڕ : بێ کەڵك و قازانج و بایەخ .

گویٚ لە ئاستی شنەو شۆکەر : واتە لە ئاستی قسەو دواندن گوێت کەڕە

(3) کویٚ پڕ لە بێر و سامانە : واتە کام جێگا پڕ لە خێر و فەڕە . سامانە .

(4) حەساننەوە : حەوانەوە ، پشوی دوای ماندو بوون .

بــــــالۆره نـــــــاخۆش و درێـــــــژ
چنگ لـه گۆشـت و سـەرو لـەش تیـژ[1]
گریمــــان ... چــــنگت خــــسته کـــار
وێرانــــت کـــرد دێهــــات و شــــار
ســـێ بــــارەت کـــردەوە رەفتـــار
رێگـــات چـــۆڵ کـــرد بـــۆ نالـــەبار[2]
بـــەڵام ... ئـــەم هـــەموو ئــاوازە
ئـــەم هـــەموو جریـــوە و نــــازە
ئـــەم جـــۆش و کـــوڵ و پـــەروازە
ئـــەم هـــەموو شـــەهێن و بــــازە[3]
چـــی لێ ئەکـــەی چـــۆن دێیتـــە نـــاو
چـــی ئەکـــەی لـــە رۆژ و هەســـاو[4]
هـــەر بــــە تـــاڵی ئەگریجـــەی خـــاو
ئەتکـــەن بـــە ورگـــی هەڵوەشـــاو

---

(1) بالۆره : یا بالوێره : جۆره ئاوازێکی ناڕێك و پێکی ناخۆشـه و ئـاوازی مۆسـیقای ئاسایی رەچاو ناکات .

(2) سێ بارەت کردەوە رەفتار : مەبەست لـه هەڵگێرانـەوەی ئـاگری شـەڕی سـێیەمی جیهانییە.

(3) شـەهین و بـاز : دوو باڵنـدەی گۆشـت خـۆرن و بەنموونـەی ئـازایی و نەترسـی و چالاکی و تیژ فڕین لەناو باڵندەکان ئەهێنرێنەوە.. لێرەدا مەبەست تێکۆشەرانه

(4) هەساو : سایەقە ... هەور بە بەری ئاسمانـەوە نـەبێت دیـاره مەبەسـت لەوەیـە ، کوننەپەپوو لەبەر تیشکی خـۆر و رووناکـی چـاوی نـابینێ ، بۆیـە خـۆی بـۆ شـوێنی تاریك ئەکوتێ ، سا هەر شتێ لە رووناکی بترسێ و عاشقی تاریکی بێت، بەنموونـەی چاکە نەویست و شەڕخواز ئەهێنرێتەوە.

چــیای شــیرین ... چــیای شــیرین
لوتکـــه ســپی دامـــەن ڕەنگـــین
پــڕ لــه لالــه و وەنەوشـــەی شــین
مـــەنزڵگای قوربـــانی و بـــرین
هـــۆی شـــانازی نەتـــەوەی کـــورد
بڵـــێ بـــه قەنـــدیل و هـــەڵگورد[1]
کوننەپـــەپووی بـــه هەڵپـــه و بـــرد
ئەو باوکەی مـرد ، ئـەو باوکـەی مـرد[2]
بڵـــێ ... ئـــەوەی خـــاوەن بـــیره
دوژمنـــــــی کـــــۆت و زنجـــــیره
ســـا گەنجـــه یـــا وەکـــو پـــیره

---

(1) هـەڵگورد: هـەڵگورد سـەر لوتکـه تروپکـی هـەره بـەرزی شـاخی حەساڕۆسـته و کەوتۆتـه ڕۆژئـاوای حـاجی ئۆمـەران و بـه بـەرزترین لوتکـەی چیاکانی کوردسـتانی عێراق ئەژمێردرێ .

– قەندیل : چیایەکی بەرزو سەختی کوردستانی عێراقه و لـه نێـوان قـەڵادزێ و حـاجی ئۆمەرانایه.. زنجیرەیەکی بەناوبانگی چیاکانی کوردستانه .

(2) ئەو باوکەی مرد : لێرەدا مەبەست لەوەیـه کـه میللـەتێ سـەری بـەرزبێت ، ئـەوا هەمیـشه شـانازی بـه خۆیـەوه ئـەکات ، دیـاره لـەم حاڵەتـەدا ... کوننەپەپوەکـه نیشانەی شەڕه و نموونەیه بۆ ئیمپریالیزمی جیهانی .... سـا کـه میللـەتان سـەریان بـەرز بێـت و ڕووبـەڕووی ئیمپریـالیزمی جیهـانی وەسـتابن ، ئـەوا ئیمپریـالیزم ئـەو باوکـەی مـرد کـه بتوانـێ میللـەتان بـه نـاوی ئاوەدانکردنـەوه و یارمـەتی دانـەوه ، هەڵبخەڵەتێنێ.

سەفەر بەگلگی لەبیرە[1]
ئیمڕۆ خەڵکی خاوەن هۆشە
بۆ ئامانجی بەپەرۆشە
بۆ شتێ ئەڵقە لە گۆشە
کە سەودای منیشەو تۆشە[2]
ئێمە لە جیاتی ویرانی
لە جیاتی ماڵ پەرێشانی
بوون بە قاورمە و بوریانی
ئاوارە بوون سەرگەردانی
پێویستمان بە ئازادییە
بە ئاسوودەیی و شادییە
بە بەزمی کەی قوبادی یە

---

(1) سەفەر بەگلگ : کە ( سەفەربەلکی)یشی پێ ئەوترێ و ئەو ئاڵۆزی و ناخۆشی و گرانی و نەخۆشییە) سەختە سامناکەیە ، لە ئەنجامی شەڕی یەکەمی جیهانی هاتە کایەوە و باڵی رەشی بەسەر تێکڕای گەلانی دنیادا گرت و بەملیونەها مرۆڤ بوونە قۆچی قوربانی و سووتەمەنی ئاگری ئەو شەڕە نالەبارە.. شاعیری نابیناو بەتوانای کورد مەلا حەمدون زۆر بە جوانی باسی ئەو شەڕەمان بۆ ئەگێڕێتەوە :

(2) کە سەودای منیشەو تۆشە :

سەودا : سەودا سەر ، حەیران بوون ، عاشق و شەیدا ، واتە مرۆڤ کە خاوەنی هۆشی خۆی بوو ئەوا ئاواتی بەدیهێنانی ئازادی و ئاشتییە کەواتە ئەم هیوا پیرۆزە سەودای هەردوو لامانە

گـــەل ئـــا ئەمـــە مرادییـــە[1]
کـــۆتری ســـپی ، نـــەرم و شـــل
چـاوڕەش بـەبێ دەس کـاری و کـل[2]
زێـــرین بـــەبێ پلپلـــەی مـــل
خـــاوەن لەنجـــەی بەخلـــە خـــل
بخوێنـــە.. بـــە دەنگـــی زولاڵ
ســـەرنج بـــدەرە گـــوڵی ئـــاڵ
راوی نـــێ پـــەپوی ئێـــسك تـــاڵ
بڵـــێ.. ئاشـــتی بـــۆ مـــاڵ ، منـــاڵ

***

---

(1) بەزمی کەی قوباد: کەی قوباد شایەکی ئێرانی کۆنە و هـەر لـە سـەرەتای بـەهار.. یەکەم رۆژی نەورۆزەوە بەزم و هەڵپەڕکێ و خۆشی ساز کردوە.

- گەل ئا ئەمە مرادی یە : ئەی گەل ئا ئەمەیە شادی و خۆشـی و بـەزمی ئێـوە، ئـا ئـەو شادییە مەبەستی مرادی ئێوەیە و بەدی دێت .

(2) کل : جۆرە تۆزێکی رەشە، چاوی پێ ئەرێژرێ . ئەڵێن ئەم کلە لە شاخی (گـورە) وە دەرئەهێنرێت.. ئەو شـاخەی کـاتی خـۆی موسـای پێغەمبـەر (د.خ) داوای کـرد جەلالی خودا ببینێ و لەگەڵ خواستەکەدا و لە سـاتێکی زۆر کەمـدا تەجـەلای خـودا ئەو کێوەی سووتاند.

# شەڕ و ئاشتی(*)

## ١٩٥٤

مامەپیرە، مامەی ریش پان
گێڕایەوە باسی جاران(١)

وتی: ئەی بچکۆڵەکانم
هۆی ئارامی دڵ و گیانم(٢)

بۆتان باس ئەکەم رابردوو
بە کۆمەڵ نەك یەك و دوو

ئەڕۆیین بەبێ ماچی لێو(٣)
ئەڕۆین بۆ دوور پشتی کێو

---

(*) دوای گەڕانەوەی کۆنگرەی ((ڤیەننا)) کە بۆ ئاشتی بەستراو باسی شەڕ و قات و قڕی جەنگی جیهانی یەکەمە .. لە ژینا و بە پەرتوکێکی شیعری لەژێر ناونیشانی شەڕ و ئاشتیدا بڵاوکراوەتەوە

(1) مامە پیرە : مامە پیرە لە ئەدەبدا نیشانەی میژووی دێرینی ئەو باسەیە کە لێی ئەدوێ .. لێرەدا چیرۆك لەسەر زمانی پیرێکی دنیادیدەوە ئەگێڕێتەوە، کە خودی خۆی شایەتی حاڵە و جەنگی یەکەمی جیهانی بینیوە.

(2) رۆڵەو بچکۆلەش: نیشانەی نەوەی نوێ و وەچەی داهاتووە.

(3) بەبێ ماچی لێو : ئەو مرۆڤانەی لە شەڕی جیهانی یەکەمدا بەرەو تەنووری ئاگر و مردن راپێچ ئەکران ، بەجۆرێ ئەبران دەرفەتی ئەوەشیان نە ئەدرایێ کەس و کار و یار و خۆشەویستەکانیان ببینن و ماچیماڵئاواییان لێ بکەن.

ئەڕۆین بۆ واق و وڕماوی
بەفرمێسکی قەتیس ماوی[1]

بەرەنگی زەرد هەڵگەڕاوی
بە خەیاڵی تەق کراوی ...!

ئەڕۆیین و ترپەی پێیان
ئەگەییە ئەو پەڕی پێیان

ئەڕۆیین و کۆڵی شانیان
ئەگەییە سەر شلکەی رانیان[2]

بەناو بەفرا ، بەناو دڕکا
با سەهۆڵ ئەندامیان سڕکا[3]

---

(1) واق وڕماو : سەرسام ، سەرسوڕماو
بەفرمێسکی قەتیس ماوی : بەو فرمێسکەی لەچاوا مانی گرتووە و وەستاوە نایەتە خوارێ.

(2) شلکەی ران : نەرمەی رانی.. باوەش و کۆشیش ئەگرێتەوە
(3) بەناو بەفرا ،بەناو دڕکا: شاعیر مەبەستی لەوەیە کە لە شەڕدا زستان و هاوینی بۆ نیە لە زستاندا بەناو بەفرا و دوچاری سەرمای تەزینەر ئەبێت و لە هاوینیشدا بەناو دڕک و دالاّ ئەڕوێت .. جاری وا رێك ئەکەوێ بەپێی رووت و خاوسی و دڕك بەبن پێتا ئەچێت.

ســـــوور هەڵگـــــەڕێ گۆنــــاو لووتیـــــان
بیبەســـــتێ خــــۆراك و قووتیـــــان[1]

ئـــــەبێ بـــــڕۆن بـــــێ وەســــــتاندن
تــــا ئەگەنــــــە کـــــۆڕی مـــــردن[2]

کـــــۆڕی بــــــێ یـــــەکتر ناســــــین
بـــــەبێ نـــــاوی یـــــەکتر زانــــــین[3]

بـــــێ ئــــــەوەی ڕۆژێ هـــــیچ کامــــێ
دیبێتـــــــــی چــــــارەو ئەنــــــــدامێ

---

(1) گۆنا : کوڵم ، سووری ڕوومەت.

(2) کۆڕی مردن: کۆڕی شەڕ ، مەیدانی جەنگ، مەیدانی کوشتن و بڕین و لەناوچوون و برسێتی و تێنویەتی و ماندوبوون .. چونکە مرۆڤ لە کۆڕو مەیدانی شەڕدا تەنیا چاوەڕوانی مەرگ ئەکات شەڕی جیهانی یەکەم و دووەمیش نموونەیەکی زیندووی کارخانەی مەرگەو ئیمپریالیزمی جیهانی و نازیەت و فاشییەت لە پێناوی مەبەستی گڵاوی خۆیاندا بەرپایان کرد.

(3) کۆڕی بێ یەکتر ناسین: دیارە ئەوانەی ڕاپێچی شەڕی جیهانی یەکەم کراون لەوەیە هەر یەکەیان لە کونج و شوێنێکی جیای ئەم دنیایەوە ڕۆیشتبن و کەس کەسیان ناناسن.

پەیـــدابوو بـــێ ســـەنگ و ســـووکی[1]
دوو دڵـــــــی یـــــاخۆ نـــــاکۆکی

پەیـــــــدابوو بـــــــێ ڕق و کینـــــــە
بـــــــێ بـــــــەگڕی دڵ و ســـــــینە

ئـــــــەبێ رووی تفـــــەنگی تێکـــــــا
بیپێکـــــــێ و تەماشـــــــای ڕێکـــــــا[2]

بیخواتـــــــەوە خـــــــوێنی گەشـــــــی
هـــــــەڵیکا ئـــــــاڵای هاوبەشـــــــی

بێتـــــە پـــــێش خـــــاوەن فرمـــــانی
کڕنـــــووش بـــــەرێ بـــــۆ ئاسمـــــانی

---

(1) ســەنگ و ســووکی: ســەنگین و ســووکی، گرانــی و ســووکی، ئەمــەیان زیـاتر بـۆ کیشانەی راستی و دروستی بەکار هێنراوە و لە کێشانی شت و مەك بە تـەرازووەوە هاتووە .

سەنگ و سووکی: کاتێ ئەم زاراوەیە پەیدا بوو کە ناڕاستی لە کێشاندا دروست بوو، بە واتا دزی کردن و فرت و فێڵ و ناڕاستی و درۆکردن.

(2) بی پێکێ: ئەڵێن نیشانەکەی پێکا. واتە بەر ئەو شوێنە بکەوێ کە مەبەستە.

بــــۆی هــــــەڵگا بـــــازووی پتـــــەوی
بـــۆی دەرخـــا کوشـــتاری شـــەوی[1]

ئــــەویش بـــە فیـــز هــــەروەکو گیــــو
بـــۆی دەربێنــــێ مــــەدالیای زیــــو[2]

بیـــــــدا لەیەخـــــــەی خوێنــــــاوی
ببـــــێ بــــە نیـــــشان و نـــــاوی..!

دووبـــــــــاره بێتــــــــەوه ســــــــەنگەر
دوو ئەوەنـــدە قـــورس بـــوو بـــێ ســـەر[3]

---

(1) بۆی دەرخا کوشتاری شەوی: لێرەدا مەبەست لە شەو شەوی تاریك و ئاسایی نی یە، بەڵکو مەبەست ئەو شەڕە مرۆڤخۆرە ناڕەوایەیە کە ئیمپریالیزم بۆ خۆی هەڵی ئەگیرسێنێ.

واتە: لە کۆڕی شەڕدا سا رۆژبێت یا شەو چەند کەسی کوشتووە ئەبێت بەسەر کردەی بڵێ!

(2) گیو: ناوی پاڵەوانێکی ئازای کوردە لە میدییەکاندا، ئەم پاڵەوانە زۆر بەهێز و لووت بەرز بووە، لەیەکێ لەو شەڕانەی تیایا سەر ئەکەوێ مەدالیای زیوینی پێ ئەبەخشرێ.

(3) قورس بوو بێ سەر: مەبەست لەوەیە: لە کاتی شەڕەکەدا خەڵاتی مەدالیای کەوتەوە بیرو سەر مەست و سەر قورسی ئەو خەیاڵە بوو.

لە پڕ ئەوەی کە زۆر تر سوور
لە پشکۆی ئاگری پڕ نوور[1]

کسپە لەجەرگی هەڵسێنێ
فیز و مەستێتی بفڕێنێ[2]

دوای بەربوونی خوێنی سنگی
بێتەوە یەك ڕەگ و چنگی

هاوار مردم بۆ نەختێ ئاو
بەڵام کوانێ؟ خەیاڵی خاو

کێ ئەگاتە ناو سەنگەری
بۆ دەرمانی کەلەبەری[3]

ئاو لە کوێیە بۆ فێنکی دڵ
بۆ گەشانەوەی سیسی گوڵ..!

---

(1) زۆر تر سوور: مەبەست لە گوللەیە کە ساتی تەقاندنی وەك پشکۆ سور ئەبێتەوە.

(2) کسپە لە جەرگی هەڵسێنێ: زیاتر بەو حاڵەتە ئەوترێ کە پشکۆی ئاگری داگیرساو گەش بە کوڵمە گۆشتی تەڕدا ئەچزێ و ئەیبرژێنێ.

- فیز و مەستێتی بفڕێنێ: مەبەست لە فیز و خۆبەزل زانینی گیوی پاڵەوانی میدیایە: چونکە مرۆڤی لووت بەرزو بە فیز و خۆ بە گەورەزان هەر لووتی ئەشکێ و لەکۆتایدا ئەتەپێ.

(3) کەلەبەر: لێرەدا شەبەق یا دەلاقەی برینەکە هەندێ جار ئەو برینە کوناودەر ئەبێت و جاری واش هەیە تەنیا دەم ئەکاتەوە دەلاقەی تێئەکەوێ.

بــــۆ دامرکانـــــدنی ... ئـــــازار
بــــۆ بێـــدەنگ کردنـــــی هـــاوار.. [1]

لـــەم کاتـــەدا... دەنگـــیٚ بـــە حـــاڵ
ئەگاتـــە گـــوێی بـــاوکی منـــداڵ [2]

ئـــەڵێ... بابـــە .. مـــنم هەســـتە
وا جەژنـــە خـــەڵکی ســـەر مەســـتە [3]

جەژنـــە.. جەژنـــە کـــوا جلـــی ئـــاڵ؟!
بـــۆ مـــن.. بـــۆ کـــەی بـــانووی ناومـــاڵ [4]

---

(1) بۆ دامرکاندنی... ئازار:
دامرکاندن: کەف و کوڵ نیشتنەوە، کزو کەم بوونە ،وەی ئازارو ژانی برینی جەستە، خامۆش و ئارامی نەخۆشێکی ئازاراوی بەسوێ، ئازار ؛ مەبەست: ژان ، ئێش، سووێیە.
واتە: بۆ دامرکاندنی گڕی ژانی ئاگراوی کە ُ ڤوڵلەی سوورەوەبوو پێکاوێتی.

(2) بەحاڵ: بەئاستەم، کەمێك، تۆزێك. بەڵام بۆ دەنگ زیاتر وشەی ئاستەم و کز بەکاردێت..

(3) وا جەژنە خەڵکی سەر مەس ـنە: خەڵك لە جەژنا سەرمەستی شادی و خۆشی و گەردەن ئازاییە.

(4) کە یبانووی ناو ماڵ: ؛ ـافرەتی خانە خۆی ناوماڵ، لێرەدا زیاتر مەبەست دایکی منالّەکانی ئەو خێزانە .یە جاران باو بوو لە جەژنا، جلی نوێ و جوان بۆ منالّ و کەیبانوو ئەکرا و . بەمەبەستی دڵخۆشکردنی بەیانیانی جەژن، جەژنانە بەسەر خاو و خێزاندا بەش ؛ ـەکرا.

هەر من بێ تۆ بێ نیشانت
بێ دەستی لەناو گیرفانت

بێ باوەشی گەرم و گوڕت
بێ دڵی بەزەیی پڕت. !

بەبێ باوك بە هەتیوی
کەوتوومە چۆڵی نەدیوی[1]

سا توخوا وەرەوە ناومان
روون کەرەوە بەری چاومان

***

تەکانیدا هێز بۆی نایە
هیچ کوێیەکی لە دووی نایە[2]

---

(1) کەوتۆتە چۆڵی نەدیوی: مەبەست لە پیاو و گەورەی خێزانەکەیە کەلە جەژنا لەوێ ئامادە نییە و خاو و خێزان بێ گەورەن و کەسێك نی یە لە دڵنەواییدا جێی ئەویان بۆ بگرێتەوە.. ماڵی بێ پیاو هەست بەو نامۆیی و بێنازیە ئەکا.

(2) هیچ کوێیەکی لە دووی نایە:
– هیچ کوێیەکی: هیچ یەك لە ئەندام کۆی بەدەنی
– لە دووی نایە: بە دوایدا نایە ، بە کێشی ناکات. واتە هیچ یەکێ لە ئەندامانی لەشی قاچ و دەستی بە دوایدا نایەو لە جووڵە کەوتووە.

پێڵـــووی قورســـــی بـــۆ هـــــەڵبڕی
بـــە ئاســـتەم نێـــو نیگـــای فـــڕی[١]

بـــەرەو ئاســـــۆی رەنـــــگ پـــشکۆیی
کورکـــــــانی بـــــۆ رەنجــــــەڕۆیی[٢]

وەك بـــــــەردی گـــــــۆمی شـــــــڵەقاو
ئـــــەو دنیایـــــەی هاتـــــە بەرچـــــاو[٣]

---

(1) پێڵوی قورسی: کە پێڵو قورس ئەبێت نیشانەی خەواڵوێتی و خەولێکەوتنە.
ـ لەچاپی یەکەمی دیوانی ((دیلان)) ئەم بەیتە بەم جۆرە نووسراوە:

**پێڵووی قورسی بۆ هەڵبڕی بۆ تۆسقاڵ نێو نیگای فڕی.**

کەچی هەمان بەیت لە دەستخەتێکی پاك نووسی شاعیر خۆیدا بەم جۆرە نووسراوە ئەمەشیان پەسەندترە بۆیە لەم دیوانەدا دام نا:

**پێڵووی قورسی بۆ هەڵبڕی**
**بە ئاستەم نیو نیگای فڕی**

بە ئاستەم: تۆزێك، کەمێك،تۆسقاڵێك.
نیگا: سەیر کردن، تەماشا کردن.

(2) ئاسـۆی رەنـگ پـشکۆی: وێنەیـەکی جـوانی شـیعریە و مەبەسـت لـە ئاسـۆی داگیرساوی وەك خوێنە.

کورکانی: جۆرە هاوارێکی نەرمە ناڵاندنە یا بەدەنگێکی نزمەوە ئەناڵێنێ.

(3) گۆمی مەنگ: بنەکەی بەباشی ئەبینرێ، بەڵام گۆم کە شڵەقا ، لێڵ و لیخن ئـەبێت و هەرچی لەبنەکەیدا بێـت نـاتوانرێ ببینـرێ.. شـاعیر دنیـای بـە بـەردی بـن گـۆمی شڵەقاو هاتۆتە بەرچاو.

نایـــــه ســــــەربەرد ســـــەرو ملـــــی
لێکـــــی نـــــا برژانگــــی شـــــلی[١]

ئـــیتر پەنجـــەی ســـەر پیلکـــەی چـــەك
جـــــارێکی تــــــر نایکـــــا نمـــــەك[٢]

لەگــــــەڵ ئاســـــــۆی ئەرخـــــــەوانی
رۆیــــــــی ونبــــــوو ناونیــــــشانی
***

مامــــــە پــــــیرەی ریــــــش پــــــان
دەســــــتی کــــرد بەباســـــی جــــاران

گێرایـــــــەوە دایکـــــــی غــــــەمبار
دایکــــــی بێکـــــــەس و هــــــەتیوبار

(1) برژانگی شلی: دیارە برژانگ هەمیشە لەکاتی ئاسایی دا رێك و پێك وەستاوە و رەپ و قنجە، بەڵام کە ئەو مووە رەقە قنجە شل بوو ئەوە نیشانەی ئەوپەڕی تێکچوونی شتە سروشتی و ئاساییەکان ئەگەیەنێ، چونکە مووی برژانگ هەرگیز شل و خاو و نەرم نابێ.

(2) جارێکی تر نایکا نمەك: مەبەست لەوەیە کە جارێکی تر ئیدی پەنجە بە پەلە پیتکەی ئەو چەکەدا نا نێت و تەقەی پێ ناکات.

کەوتـــــە پارێزگـــــاری منــــــداڵ
نــــە وەك بێتــــە خـــــۆراکی چـــاڵ[1]

ڕۆژ هـــەر هەڵپـــەی ئـــەم و ئـــەو بـــرو
بـــۆ خـــۆراکی ڕۆژ و شـــەو بـــوو

گــــــرانیش پـــــێی لێ هـــــەڵبڕی
پــــــەردەی لێکدانــــــەوەی دڕی[2]

منــــاڵ زاق و زووق لــــــە برســــا
دایکـــــی بێکەســـیش لــــە ترســـا

ئـــــەی وت: ڕۆڵـــــە درشــــت و ورد
دێتـــــەوە باوکتـــــان دەس و بـــــرد

---

(1) نەوەك بێتە خۆراکی چاڵ: نەوەك بمرێ، بکوژرێ و جوانەمەرگ کرێ و ئەوسا بخرێتە گۆڕەوە.. خۆراکی چاڵ مەبەست لەوەیە با نەبێتە خۆراکی مار و مێرووی ناوگۆڕ. دیارە شاعیر کە باسی خێزان ئەکات، مەبەستی لەوەیە کە خاوەن ماڵ فەوتا و ماڵ بەرەڵڵا ئەبێت سا پێویستی بەوە هەیە، دەستی بەسەردا بگیرێ، تا سەرگەردان و بەرەڵڵا نەبن و دووچاری چەوتی و نالەباری نەبن.

(2) گرانیش پێی لێ هەڵبڕی : واتە شەڕ و پەشێوی بەرپابوو کە سەرچاوەی گرانی و ناخۆشی و وەیە.

– پەردەی لێکدانەوەی دڕی: ئیدی بیر لە هیچ شتێك ناکاتەوە دەربەسی هیچ هەنگاونانێك نایەت ئەگەر چی ئابروشی لەدەست دەرچێ.

بۆتـــان دێنـــێ خـــواردنی خـــۆش
بەیەکـــەوە تێـــر ئەیکـــەین نـــۆش

بـــەم رەنگـــە منـــداڵ ئـــەدرا لاس
خانـــە بـــەر بـــاد و کـــەڕ و کـــاس..! (١)

لـــە پـــڕ دەنگـــێ دەنگێکـــی زل
بـــە شـــاری خامۆشـــی دا تـــل(٢)

هـــەڵی ســـاندن لەخـــەوی شـــەو
تێیگەیانـــدن هـــەواڵی ئـــەو...! (٣)

(1) (٣١) بەم رەنگە منداڵ ئەدرا لاس:

لاس: لاسدان، لادان، پەناخستن بەلام لێرەدا بە مەبەستی منداڵ فریودان و هەڵخەڵەتاندن ، دێت.

ـ خانە بەرباد و کەڕ و کاس:

خانە : ماڵ، خانوو.

بەرباد: کاولە، وێرانە، روخاو، کەلاوە.

کەڕو کاس: واتە بێدەنگ ، بێ چرپە و ورتە سەرجەمی واتا خانە و ماڵێکی چۆڵ و کاولەی بێ دەنگ ئەگرێتەوە.

(2) هەواڵی ئەو: هەواڵی نوێ، هەواڵی تازە.

(3) بە شاری خامۆشیدا تل: واتە ئەو تەقینەوە گەورەیە، شاری بێ دەنگ و خامۆش و ئارامی لەرزان و خەڵکی لەخەو راپەڕان.

بۆمبـــــا بارینـــــــه، شـــــار وێـــــران
قـــوش دەرناچـــێ نـــەك دلێـــران ! ! [1]

خـــــوای بێخــــەم .. خــــوای بێخــــەم
مـــن بـــەم شـــەوە روو لـــە كـــوێ كـــەم؟

مەلۆتكــــــــەی منـــــــدالّی ســـــــاوا
بـــۆ كـــوێ بـــەرم مـــن ئـــە ئـــاوا[2] ؟

بـــۆ كـــوێ بـــەرم پـــەنای نـــەجات
بـــە كێـــوەی ببەســـتم ئـــاوات..؟ [3]

بـــەلاّم لـــەرزە كـــەوت بـــە دیـــوار
هاتـــە یـــادی داســـتانی (تـــار) [4]

---

(1) قوش دەرناچی:
قوش: بالّندە یان گیان لەبەرێ كە بفرێ و زیاتر بۆ بالّندەو مەل دێت، وەك ئەلّێن بایەقوش لەو باخەدا ناخوێنێ.. لێرەدا مەبەس: لە قوش دەرناچی: بالّندە ناتوانێ بفرێ و دەرچێ.
(2) مەلۆتكەی مندالّی ساوا: كە مندالّ تازە لەدایك ئەبێت بە جۆرە بەرگ و قوماشێكی تایبەتی ئەیپێچنەوە و قۆنداخەی ئەكەن واتە ئەو بەرگە لە لەشیەوە ئەئالێن و ئەیپێچن ئەوسا پێ ئەوترێ مەلۆتكە.
– ئە ئاوا: ئە ئاوها ، بەو جۆرە، بەو چەشنە.
(3) پەنای نەجات: پەنای خۆ رزگار كردن، پەنای دەرچوون و دوور كەوتنەوە لە شەڕ ، سەرفرازی.
(4) لەرزە كەوت بە دیوار: دیوارەكە لە هێزی دەنگی تەقینەوەكە جولاّ و لەرزی.
– داستانی تار : داستانی تاریك و رەش كە مەبەست لە داستانی شەڕە و مردن و مالّ كاولی و برسێتی لەگەلّ خۆیدا ئەهێنێ.

داســــتانی باســـــی شـــــەڕ کـــــردن
بــــە کــــۆ خـــــەڵك لــــەناو بـــــردن

بــــــەملیۆن ئینــــــسانی بێخــــــەم
ببێتــــــە ئێـــــسکی نـــــاو چــــەم

ســــەر یــــەك کـــەوێ ئێـــسك و لـــەش
بەشــکو خــوای شــەڕی پــێ بــێ چــەش[1]

بــــــەڵام وڕەی بۆمبـــــــای ئاسمـــــان
خـــــۆی گەیانــــە نزیـــــك ســــەربان[2]

هـــــەر تەقـــــە و ئاســــنێ وەك تـــیر
چــــــەقییە مـــــەمکی پـــــڕ لەشــــیر[3]

---

(1) بەشکو خوای شەڕی پێبێ چەش:

چەش: چەشە...، بە جۆرێ ئەو خواردنە ئەوترێ کە بۆ راوی ماسی بەکار ئەهێنرێت هەروەها بۆ شێوە خواردنی سەگیش لێرەدا مەبەست لەوەیە کە بەڵکو خوای شەڕ کە ئیمپریالیزمی جیهانی و شەڕ هەڵگیرسێنەرە.. بەوە چەش بێت.

(2) وڕەی: ئەو دەنگەیە لە ئەنجامی رۆیشتنی گولە تۆپ و بۆمباو موشەك و گوللە پەیدا ئەبێت وەك ئەڵێن گولله تۆپە بێرەدا وڕەی کرد.

(3) مەمکی پڕ لەشیر: مەبەست لەو دیمەنەیە کە پارچە گوللەی تۆپ یا بۆمبا لە مەمکی ئەو دایکە ئەچەقێ کە مەمکی شیری تێزاوە و کۆرپەکەی چاوەڕوانی مژینی ئەکات.

بەخۆ کوتاندن و بێشکە
بە چاوی پڕ ڕێشکەو پێشکە[1]

خۆی گەیانە لانکەی ساوا
پەلاماریدا لەتاوا ...!

دەمی گێڕا بۆ نەرمی لەش
دایە بەر فوارەی خوێنی گەش[2]

ساوای بێخەبەر لەم حاڵە
بێ ترس و هاوار و ناڵە

برسێتی لای ئەو مەبەست بوو
چیچیلەی مەمکێکی بەس بوو

---

(1) بەخۆ کوتاندن بۆ بێشکە: ئەچێت بۆ لای بێشکەکە ، وەك ئەڵێن ئازاد خۆی بۆ لای ئاگرینی برای ئەکوتێ واتە ئازاد بۆلای ئاگرینی برای ئەچێ. چاوی پڕ لە ڕێشکەو پێشکە: زۆر جار مرۆڤ لە ئەنجامی ماندو بوون یان نەخۆشیەکی کت وپڕ یا لەڕووناکی یەوە بۆ تاریکی، بەرچاوی رەش یا سپی ئەبێ و بەوە ئەوترێ ڕێشکەو پێشکە.

(2) دایە بەرفوارەی خوێنی گەش: واتە ساتێ ئەو منالە ساوا برسییە دەم بۆ گۆی مەمکی پڕ لەشیری دایکی ئەگێڕێ تا مژی لێبدات و خۆی پێ تێر بکات، لە بریتی شیری خاوی بەری دایکی خوێنی دەم زامی پارچە گوللە بە رووی دا فچقەئەکات.

دەیخستە جێگای جارانی
جێگای بێ دەنگ و ئامانی[١]

مژی لێدا بۆی قووت ناچێ
لە چێشکەی جارانی ناچێ[٢]

کەی ئەو ئا بەم تامە فێرە
جاران شیرین ئێستە سوێرە[٣]

دەمی چەسپان مژی لێدا
تا دوا دڵۆپی کوڵ پێدا

سەری خستە سەر جێگای نەرم
کەی هەڵئەسن لەخەوی گەرم ..؟؟

***

مامەی پیرە مامەی ریش پان
دەستی کرد بەباسی جاران

---

(1) جێگای بێدەنگ و ئامانی: کۆش و باوەشی دایکە کە بە باشترین شوێنی ئەمین دائەنرێ و منالْ هەست بەدڵنیایی و بێوەیی ئەکات.

(2) لە چێشکەی جاران: تامی جاران، چێژی جاران.

(3)کەی ئەو ئا بەم تامە فێرە: لەپێشدا فێری تام و چێژی شیر بووە کە شیرینە کەچی ئێستا لە شوێن شیر خوێن هەڵئەقووتێ و تامی خوێنیش سوێرە.

گێڕایـــــــەوە چـــــۆن رابـــــــردوو
بەکۆمـــــــەڵ نـــــەوەك یـــــەك و دوو

ئەخزانـــــــە نـــــاو ژووری تاریـــــك
ژووری تەســـــك و هێجگـــــار باریـــــك[١]

شـــــەو دارکـــــاری رۆژ ئـــــیش کـــــردن
ئـــــەبێ خـــــۆت بـــــڕۆی بـــــۆ (مـــــردن)

زنجـــــیری دوومـــــــەن لـــــە پێـــــدا
راخـــــەری نەرمـــــە لـــــە جێـــــدا[٢]

قەمـــــچی پـــــــشتی داڕووتانـــــــدن
نەخۆشـــــــی گۆشـــــــتی رزانـــــــدن

ئـــــاوی ســـــارد ئەکرایـــــە ژێریـــــان
گیـــــان لەســـــەر لـــــوتێتی نێریـــــان[٣]

(1) ئەخزانە ناو ژووری تاریك: ئەخزانـە ناو ژووری تاریك ، مەبەست لەوەیـە ، هـەر کەس دیل و بەندەکان لەگەڵ دەست بەسەر کردن و گرتنیـدا ئەخزانـە نـاو ژوورێکـی تاریکی تەنگەبەرەوە.

(2) زنجیری دوو مەن:

مەن: مەنی ٢٤ کیلۆ گرامە یا شەش هۆقەیە واتە ئەو زنجیرە ئاسنەی کە لە دەست و پێیان خستوە و گرانە و دوو مەن قورسە.

(3) گیـان لەسـەر لـوتێتی نێریـان: کامـەیان زۆر نێـرەو بـە جەرگـە خەریکـە رۆحـی دەرئەچێت و گیان لەسەر کونە لوتێتی.

ئەســـپێ و جانـــەوەر بـــە تۆپـــەڵ
بـــۆی بۆتـــە کیـــسەی بـــەر باخـــەڵ[١]

لـــەپڕ نرکـــە ئەهاتـــە جـــۆش
بـــەرز ئـــەبۆەوە ســـەری نـــاو کـــۆش

ژاندرمـــــە و شمـــــشێر و قلـــــیج
ســـــەری گەیـــشتۆتە بـــن مـــیچ

ئـــەی خوێنـــەوە رەسمـــی شـــاهی
جـــەزای تەمـــەڵی و گونـــاهێ

ئـــەیوت : فـــەرمانی شـــاهانە
بـــــۆ پیویـــــستی نیـــــشتمانە

بـــــۆ پارێزگـــــاری وەتـــــەن
ئیـــشی وا هـــەرگیز دەگمەنـــە[٢]

---

(1) ئەسپێ و جانەوەر: مەبەست لەو جڕ و جانەوەرانەیە کە لە ئەنجامی پیس و پۆخڵی پەیدا ئەبێت و مرۆڤ نارەحەت ئەکات.

(2) دەگمەن: بەو کارو هەڵوێست و رووداوانە ئەوترێ کە هەرگیز چاوەڕوانی روودانیان ناکرێت .. لێرەدا شاعیر ئەو ئیش و کارە دەگمەنە مەبەست لەوەیە کە چاوەڕوان ناکرێ ئەو شەڕ کەرە مەیدانی شەڕ بەجێ بێڵێ.

کێ دیویە لە کۆڕی شەڕا
بەرگی سەربازی لە بەرا ..!

سەنگەر بۆ دوژمن جێ بێڵێ
زەوی نامەردی بکێڵێ ..!! [١]

چەك فڕێ با لەبەر مردن
خۆی بفرۆشێ لەبەر دوژمن

خۆی بفرۆشێ لەبەر گیانی
نەمێنێ ناو و نیشانی.. !

لەبەر ئەوە وایە بڕیار
ئەوەی کە کردویە فیرار[٢]

بڕیاری سەر لەشکر وایە
ئەوەی کۆتی لەپێدایە[٣]

---

(1) زەوی نامەردی بکێڵێت: واتە کە یەکێ مەیدانی گیانبازی چۆڵ کرد و رای کرد، ئەبێت دوایی بەم لاو ئەو لادا بسورێتەوە.

(2) فیرار: ئەم زاراوەیە بۆ ئەوانە بەکار ئەهێنرێت کەلە ئەرکی سەربازی هەڵدێن و رائەکەن و مەیدانی جەنگ بەجێ ئەهێڵن.

(3) ئەوەی کۆتی لە پێدایە: مەبەست لەوانەیە کە سەربازی هەڵاتوون و دوای گیراونەتەوە و لە بەندی خانەدا کۆت و زنجیریان لە پێدایەو ئامادە کراون بۆ سزادا و گوللە باران.

خۆی لاخا بێتە ئەم لاوە
بە گوێرەی (تۆمەت)و ناوە[1]

ئەهێنران بەدەستی بەستە
بەئەندام و جەستەی خەستە

ئەهێنرانە بەر سەرای (میر)
ئەدرانە بەر گڕی شەست تیر[2]
هەر وەك گەڵای داری پاییز
بێدەنگ و بێورتەی بەرێز

یەك لە دووی یەك هەڵئەوەرین
ئەڕۆین بۆ دنیای بەرین ..![3]

***

مامەی پیرە مامەی ریش پان
دەستی كرد بەباسی جاران

---

(1) تۆمەت: تاوان: سەرپێچی كردنی یاسا.. هەڵسان بەكارێكی ناڕەوا... گوناهێكی كردبێ .. لێرەدا شاعیر مەبەستی لەوەیە هەر كەس لەگەڵ گوناهكاراندا دەوری ماندەری بینیبێت تاوانی زیاتر و سزا زۆرتر وەرئەگرێ.

(2) سەرای (میر): جاران بە تایبەت لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دائیرەكانی دەوڵەت لە خانوویەكی گەورەدابوون پێیان ئەوت : سەرا.

(3) دونیای بەرین: بەرین: پان و پۆڕ، بەربڵاو، بەرەڵڵا، فراوان دونیای بەرین: بەهەشتی بەرین و فراوان، واتە كە گیان ئەو كەسە چاكە بە بەهشت و دونیای بەرین شاد بوو.

وتی: ئیتر رۆڵەی وردم
بۆم نایە(قافیەی فەردم) [1]

بەڵام منداڵی دەوری پیر
مامەی پیریان هێنایە گیر [2]

تا تەواو نەبێ داستانت
بەری نادەین ریشی پانت

مامە ئاخێکی هەڵکێشا
بە تەوێڵی خۆیا کێشا [3]

ئەزانن چیم بۆ باس کردن
یا بۆ چ شوێنێکم بردن؟

بۆم باس کردن هەواڵی شەڕ
تێمگەیاندن رازی پڕ بەر [4]

---

(1) قافیەی فەرد: قافیەی شیعر، قافیەی تاک.

(2) هێنایە گیر:

گیر: گیرو گاز، تەنگی پێ هەڵچنێ واتە وایان لێ کرد کە بە پێی خواست و مەبەستی بەرامبەرەکەی کار و هەڵوێست بنوێنێ.

(3) تەوێڵ: ناوچەوان، بە تەوێڵی خۆیا کێشا: بەناو چەوانی خۆیا کێشا.

(4) رازی پڕ بەر:

راز: نهێنی، پەنهانی..

- رازی پڕ بەر : مەبەست لەو پەنهانییە بەنرخ و کەڵکدارە و بەرهەمێکی بە هێز و پێزی هەیە بۆ دوا رۆژ، لێرەدا مەبەست لە ئەو چیرۆکەیە کە مامە پیرە گێڕاویەتەوە و وەچەی داهاتوو پەند و ئامۆژگاری لێوەر دەگرێ.

بۆکێیـــان کـــرد؟ و کـــێ یـــان کوشـــت
بـــەرەو کـــوێ چـــوون ورد و درشـــت[١]

چـــی لێهـــات خـــاوەن نیـــشانە؟
لـــە ئـــەرزە یـــا لـــە ئاسمانـــە؟[٢]

کـــوژراوی ســـــەنگەری مەیـــدان
خـــۆراکی گوللـــەی بـــێ ئامـــان ..!!

مامـــــە وتـــــی: ســـــەر هـــــەڵبڕن
ئـــەوە چـــین پـــۆل بـــە پـــۆل ئـــەفڕن؟[٣]

وتیـــــان : مامـــــە ئـــــای لەوانـــــە
لـــــەو هـــــەموو (کـــۆترە) جوانـــــە[٤]
***

---

(1) وورد و درشت:

وورد: بچوك ووردیان: بچوکیان

درشت: گەورە.

(2) ئەرز : زەوی، خاك.

(3) پۆل پۆل: دەستە دەستە ، کۆمەڵ کۆمەڵ.

(4) لەو هەموو کۆترە جوانە: کۆتری سپی و پەڕ نەرمی جوان بەڵگە و نیشانەی پاکی و بێگەردی و بێوەیی و ئاشتی و ژیانی کامەرانی بەیەکەوە گونجاوە.

# شیرین(*)

١٩٥٤

شیرین .. بەستەی گوڵاڵەی سوور　　تریفـــەی مـــانگم
شیرین .. گەشەی ئەستێرەی دوور　　گفـت و گـۆو بـانگم(١)
شیرین .. تیشکی رۆژی دەم کەل　　بـــۆ ویرانـــەی دڵ

---

(* ) ئەم قەسیدەیەی شاعیر لە دیوانی دیلانی چاپی ١٩٦٩ دا هەموو بەیتەکان بەم شێوەیە نووسراونەتەوە:

شیرین! بەستەی گوڵاڵەی ســوور تریفەی مانگم

شیرین! گەشەی ئەستێرەی دوور گفتوگۆ و بانگم

دیارە بەم شێوەیە، هونەری موستەزاد دەرناکەوێ.. کەچی لەدەستنووسێکی دیلانی شاعیردا بە شێوەی موستەزاد نووسراوەتەوە و ئاڵوگۆری بە شوێنی هەندێ وشەش کردوە... مـن دەستنووسـەکەم بـە لاوە جـوانتر و پەسند تـر بـوو بۆیـە ئەمـەیانم هەڵبژارد..

(1) شیرین: وشەی شیرین لە زمانی کوردیدا بە گەلێ واتا دێت:

− شـیرین: شـاخێکی بڵنـدو سەرکەشــە لــە کوردســتانی عێـراق و کەوتۆتـە ناوچـەی هەولێرەوە.

− شیرین: بە واتای خۆشەویست دێت: وەك برای شیرین و خۆشەویستم.

ـ شیرین: بۆ ناوی کیژ بەکاردێت.

ـ شیرین: لێرەدا نیشانەیە بۆ دڵبەر، خۆشەویستەکەی فەرهادی کورد کە لە پێناوی ئەوینەکەیدا رەنجێکە سەخت و قوربانیەکی پیرۆزی بەخشی.

ـ بەستە: بابەتێکی گۆرانییە و گەلێ جار دوا بە دوای (مقـام)دێـت .. بەسـتە لـە ناخـدا جۆش و خرۆشێکی گەرم و بەتینی تیایە.

شیرین .. هاژەو جریوەی مەل — بۆ وەنەوشە و گوڵ[1]

شیرین .. ئەوپەڕی جوانی شێوەی — نیگاری سروشت

شیرین .. تۆ ئەو تاقە سێوەی — کە فەرهادی کوشت[2]

شیرین ... تۆ بووی یەکەم بینین — کارەبای نازت

چاو ... هەڵبڕین زەردەخەنەت — سەروەکەی رازت[3]

لێی شێوانم تەلی تاری — هەڵبەست و خەیاڵ

بووم بەو مەلەی بێ لایەنە — زامدارە و بێ باڵ[4]

ئیتر نەمانگ نە ئەستێرە — نە گزنگی زەرد

نە فووی شمشاڵ نە قاسپەی کەو — لەم بەردو لەو بەرد

---

(1)وێرانەی دڵ: مەبەست لەدڵ و دەرونی پڕ لە پەژارە و پەستی و ناشادییە .. دڵێ کەبە هەڵوێستی یار رەنجابێ و شکابێ.

(2) شیرین ئەو پەڕی جوانی: ئەمە بەدوو واتا دێت:

– شیرین ئەوپەڕی جوانی واتە تۆ لەجوانیدا وێنەت نیە و لەو پەڕی بەرزی جوانی دایت.

– شیرین ئەو پەڕی جوانی : ئەگەر (ڕ) بە قەڵەوی نەخوێنرێتەوە(ڕ)ی لاواز بێت ئەوا شیرین ئەبێت بە شای(پەر)ی یەکانە لە جوانیدا.

– شیرین تۆ ئەو تاقە سێوەی : لەم رووەوە وا باس ئەکرێت کە فەرهاد دوای رەنجێکی زۆر لە کون کردنی بێستون، ئەچێت ئەو هەواڵە بە شیرین بگەیەنێ، شیرینیش وەك مژدانەیەك سێوێکی ئەداتێ ، کەچی کە فەرهاد دەست و پەنجەی جوانی شیرین ئەبینی هێندەی تر شەیدای ئەبێت و روو ئەکاتە کێو.

(3)کارەبای نازت: مەبەست لە تەزووی هەستی ئەو راچڵەکاندنە بەهێزەیە کە مۆرڤ لە بینینی خۆشەویست و نازدارەکەی دا وەك موچرکێك کارەبا بەسەرتاپای لەشیدا ئەهێنێ. .

(4) تەلی ئارام: تەلی هەست و بیر ... تەلی هەستی شیعر وتن.

نــه بریقــه‌ی شــه‌ونمی ســه‌ر | چــــیمه‌نی قــــه‌راغ
نـه خه‌نده‌کـه‌ی تـازه غونـچه‌ی | دره‌ختـــانی بـــاغ[1]
نــه که‌روێـشکه‌ی ده‌غڵــی بنــار | نــه هــاژه‌ی چـاوه
نه ئه‌و بۆنه سه‌ر مه‌ست کـه‌ره‌ی | ئه‌گریجــه خــاوه[2]
نـه کرنووشــی ســه‌وز و ســووری | په‌لکـــــه زێرینــــــه
نـه بـه‌هارێ که‌خـه‌ریکی عیـشوه | کرینــــــــــــــه[3]
نــه ته‌بیعــه‌ت نــه جوانییه‌کـه‌ی | نـــه فـــه‌ڕ و نرخـــی
جـــارێکی تــــر وای تـــه‌ما بــێ | خـۆش بکـا مرخـی[4]

---

(1)چیمه‌نی قه‌راغ: گژوگیا و هه‌رێز و سه‌زایی گوێی کانی و چه‌م و زێیه‌کان.

(2) که‌روێشکه: له کاتێکدا گه‌نم و جۆ گوڵ ئه‌کـه‌ن و نزیکـه‌ی مـه‌ترێ لـه زه‌وی بڵنـد ئه‌بێته‌وه، هه‌ر که‌شه‌ماڵ هه‌ڵئه‌کات شنه به‌گوڵه‌گه‌نمه‌کان ئه‌کات و رایئـه‌ژێنـێ.. ئـه‌و له‌رانه‌وه‌و جوڵه‌یه به شێوه‌ی یـاری و قونـه قـون و راکردنـی که‌روێـشك چـووێنراوه، چونکه تووکی پێسته‌که‌ی له‌گه‌ڵ ره‌وتی راکردنه‌که و (با)یه‌که‌دا دێت و ده‌چێت.

– چنووره خاوه: له ده‌ستنووسێکی شاعیردا(چنووره خاوه) کراوه به (ئه‌گریجه خاوه) منیش ئه‌میانم لا په‌سندتره.

(3) کرنووش : نوشتاندنه‌وه ، ئه‌واندنه‌وه ، چه‌مینه‌وه.

عیشوه : نازکردن ، به عیشوه هـات: بـه نـازه‌وه هـات، هه‌نـدێ جار ئـه‌م زاراوه‌یـه بـۆ خۆڕازاندنه‌وه و خۆ جوان کردنیش دێت.

(4) وای ته‌مابێ : وای نیاز بێ ، وای بوێ ، وای مه‌به‌ست بێ..

– مرخ: یا مڕاندن به ده‌نگێکـی گـڕ، جـۆره حاڵه‌تێکـه حـه‌یوان خـۆی بـۆ پـه‌لاماردان و گرتنی نچێر ئاماده ئه‌کات.. که ئه‌ڵێن: فلانه مرخی له فیساره شت خـۆش کـردوه، ئه‌وه ئه‌گه‌یێنێ که ئه‌و فلانه‌یه نیاز و مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه، ئه‌و شته‌ی چنگ بکه‌وێت.

وا بزانــێ بــەو پــەڕەی گــوڵ / بــە ســیحری جــوانی
راچــڵەکێنێ ئــا ئــەو دڵــەی / کـــەتۆی میـــوانی
چـونکە لەگـەڵ هـەر کامێکیـان / بـــەراورد بکرێـــی
تـۆپێی بـەرزی بـەرەو ئاسمـان / بەســـەریا ئـــەنێی
ئـیتر ... شـیرین داری فیـزت / بـــاش راوەشـــێنە
تۆ ... جێگاکەت هەرچەندە وایە / لەســـەر گلێنـــە(١)
تـــا ئێـــوارێ شـــەپۆڕم بـــێ / و ناڵـــەی جگـــەردۆز
ئـــۆقرە نـــەگرێ کاتـــێ ســـاتێ / دڵەکـــەی گـــڕۆز(٢)

---

(1) فیز: لووت بەرزی، خۆ بەگەورەزان.. هەندێ جاریش لە شوێنی واتای: (عیشوە و ناز) دێت.

– گلێنە: مەبەست بیلبیلەی چاوە.

(2) تا ئێوارە شەپۆڕم بێ:

شەپۆڕ: واتای هاو جووتی، گریان و شین و لەخۆدانە... شین و شەپۆڕ.. واتە تا ئێوارە بگریم و شین و هاوار و واوەیلا و شەپۆڕم بێ.

ـ جگەردۆز:جگەر کون کون ، جگەر پارە پارە ، جگەر بریندار.

ـ ئۆقرە: دان بە خۆدا گرتن، ئارام گرتن.

ـ گڕۆز: گرینۆك، بەو حاڵەتە ئەوترێ:

کە منالێ هەمیشە و بەبێ هۆ و بێ بیانوو هەر ئەگری ئەگەرچی مەبەست و ئاواتەکەشی بهێنرێتە دی.

ـ نیوە دێڕی دووەمی ئەم بەیتە شیعرە لە دیوانە چاپکراوەکەدا بەم جۆرە نووسراوە:

ئـۆقرە نـەگرێ سـاتێ، کاتـێ دڵـەی گـڕۆزم کەچـی لەدەسـت نووسـێکی شـاعیردا وای لێکردوە: ئۆقرە نەگرێ کاتێ ساتێ. دڵەکەی گڕۆز.

منـــی کەســـاس منـــی کڵـــۆڵ یـــا منـــی هـــەژار

چـــۆن ئـــەتوانم ئاشـــی هیـــوات بۆ بخەمـە کـار..؟ [1]

چـۆن ئـەتوانێ پـشت کۆمـاوەی زنجـــیری دوژمـــن

دەســـتی لـــەرزۆك بەئاســـانی بنێتـــــە گـــــەردن

چـــۆن ئـــەتوانێ دەمـــی وشـــکی چەوســـــــاندنەوە

لێـــوی قرچـــی وشـــك هـــەڵاتووی رووتاندنـــــــەوە

نزیکـــی خـــا لـــە دوو لێـــوی دەوری تـــــــەنراوە

بـــــە درکـــــەزی چـــاولێکەری ئـــەم بەنـــدو بـــاوە [2]

هـــەیهو.. هـــەیهو.. مـــاوە پانـــە رێ پـــڕ لـــە خێـــوە

کۆســـپی بـــەر لـــووت بڵنـــد تـــرە لـەو شـاخ و کێـوە [3]

ئـــەبێ شـــیرین.. پەلـــەقاژەی دڵـــــەی منـــــداڵم

---

(1) کەساس: داماو.

کلۆڵ: زۆر جار بەواتای بێ بەخت و چارەڕەش دێت.

(2) دەوری تەنراوە: دەوری گیراوە، چوار لای گیراو و بەستراوە.

– بە دڕکەزی چاولێکەری:

– دڕکەزی: کە بەلەشی مرۆڤدا ئەچەقێ تێ ئەئاڵێ و ئازاری پێ ئەگەیێنێ.

– چاولێکەری: لاسایی کردنەوە.. کەواتە چاو لێکەری بەند و باوی ساتەوەختی و رۆژانە دەردو نەخۆشیەکی کوشندەی کۆمەڵایەتییە.

(3) هەیهو.. هەیهو: گەلێ جار ئەم زاراوەیە بۆ بێزاری و پەستی کارێکی لەدەستچوو بەکار دێت یان بۆ بێزاری لە درێژ دادڕی.

نـــوێنی لێـــژ و شـــەوبێداری    شـــەوگاری تـــاڵم[1]
هـــەڵیگرم بـــۆ ئـــەو کاتـــەی    رژێمــــــی راســـــتی
ئەگاتـــە دەس ئـــەو کەســـانەی    بە خـوێنی خواستی
ئـــەو ســـا منـــیش یـــا داخـــی دڵ    تێـــر تێـــر ئەرێـــژم
لـــەو هەنگوینـــەی گـــوڵی لێـــوت    تـــۆزێ ئەچـــێژم[2]
یـــا وەك بولبـــول هـــەر بـــە تـــەمای    گـــەیین بـــە ئـــاوات
بـــەرەو هیـــوا بـــاڵ ئـــەکوتم    بمبـــات و بمبـــات[3]

***

(1) پەلەقاژە: لنگە فرتێ، قاچ و دەست جوڵاندن زیاتر بۆ ساتی مەرگ بەکاردێت، یان کە باڵندەیەك سەر ئەبڕێ ئەڵێن، پەلەقاژی کرد

– لێژ: خوار ، نەوی... بۆ شتێك بەکار دێت کە لایەکی بڵندو لایەکەی تر نزم و نەوی بێت.

(2) ئەوسا منیش یا داخی دڵ، تێر تێر ئەرێژم: واتە ئەوسا منیش بەتەواوی داخی دڵم ئەرێژم

(3) بمبات و بمبات: هەمیشە هەر بمبات، نیشانەی نەبەزین و کۆڵنەدانە.

# بۆ باڵدارەکان

**١٩٥٤**

ئەی باڵداری ناو هێلانەی سەر پۆپی درەخت
دەنووکی گیان بکەرەوە بۆ دەنکی بەخت[١]

رایوەشێنە سەری خەوی ژێر سێبەری خەست
بە پرووشەوە ئاوی(ئاگا) دەروون بکە مەست[٢]

بجریوێنە کەڕی بکە دارستانی چڕ
پەڕی گەشە گیف کەرەوە وەك شەستپەڕی پڕ[٣]

خولی هیوا بدە بەسەر باسکی درێژا
بەپەڕبازی وەرە بە دەور وەنەوشەی گێژا[٤]

---

(1) دەنکی بەخت: دەنکی بەهەشت، وا باوە کەهەموو.

هەنارێك دەنکێکی بەهەشتی تێدایە کە دەنکی بەختیشی پێ ئەڵێن.. گوایە هەموو جۆرە تام و چێژێکی هەیە... کاتێ باڵداریش دەنووکی گیانی بۆ ئەو دەنکە گەورانە ئەکاتەوە کە دەنکی ژیانی پێ ئەوترێ.

(2) سێبەری خەست: سێبەری چڕ و پڕە.. لە نوسخەی دیوانە چاپکراوەکەدا: (سێبەری سەخت) نووسراوە و شاعیر خۆی راستی کردۆتەوە.

– ئاوی ئاگا: مەبەست لەو ئاوەیە کەلە سەرچاوەوە بێگەرد و روونە، هۆش و بیری پاکێتی ئەهێنێتەوە مێشکی مرۆڤ

(3) کەڕی بکە. دارستانی چڕ: واتە ئەوەندە بە دەنگی بەرز بجریوێنە تا گوێی بیسەرانی دارستانە چڕەکە کەڕ ئەبێت.

(4) خولێ: گەڕانێك.. بۆ باڵندە(دەورە) بە کاردێت واتە بفڕە و خول و دەورەیەك بەسەر ئەو باسکە درێژەدا بدە.

باسك: بە بەرزایی و لاپاڵی گردۆڵکە ئەوترێ.. گەلێ جار بۆ قوڵیش بەکار دێت.

لەسەر بەردی قەراغ ئاوی کەف چەپینی چەم
بیتەکێنە خۆڵی چینەی بێ ئارامی و خەم[1]

سەوڵی شۆخی بگرە لەسەر ریزی بەرەزا
چنگی لەنجە بنێ بەسەر چیمەنی خزا[2]

چڵ بە ورشە و تۆ بە قونەی نیازی چەن ساڵە
زەماوەنێ ساز بدەن لەو ملەو سەر یاڵە[3]

هەڵپەڕن و ئەم وشانە بکەن بە بەستە
( ئاسۆی هیواو سەرفرازی جووت و پەیوەستە) [4]

***

---

(1) بیتەکێنە: لای بەرە، رێی بکەرەوە، وەك ئەڵێن ئەو تەپ و تۆزە لە خۆت بتەکێنە.

(2) سەوڵ: لێکچواندنێکی باڵی باڵندەیە، سەوڵ لێدە:

باڵە فرە بکە.. سەوڵ بگرە و باڵت راست بگرەو مەیجوڵێنە، بەوەش لەنگەری وەستاندن لە هەوادا ئەگرێ.

- شۆخێ: جوانێ، قەشەنگێ... یارێ.

خز: لووس، ساف.

(3) قونە: یان قونە قون، جۆرە رەوتێکی تایبەتی رۆیشتنی باڵندەیە، بە تایبەت لە کاتێکدا کە بە دوای خواردنا ئەگەڕێ.

مله: ملەی چیا.

یاڵ: لە گرد بەرزترە و گەورەترە، واتە نە چیایە و نەگردو سیمایەکی مام ناوەندی هەیە.

(4) جووت و پەیوەست: یەك گرتن و دەست لەمل کردن.

# سروودی من(*)

١٩٥٦

کوێستان تارای شۆی بەسەر داداوە
خشڵی گەردنی( مای زەرد و کاوە) [١]

شەماڵ لە ترسی شنەی نسێی سەخت
پەنای بۆ باسك و دەشت هێناوە [٢]

پەڵەی گوڵاڵە لە ترسی چنوور
ناو جەرگی سووتاو رەش هەڵگەڕاوە [٣]

***

(*) ساڵی ١٩٥٦ وتراوەو لە رۆژنامەی ژینا بڵاوکراوەتەوە

(1) شۆ : شۆ و تەڕی بەهار ، بە دیمەنی هەمە رەنگی باق و بریقی دەشت و دەر و چیا و دۆڵ ئەوترێ.

- خشڵ: بە ئاڵتون و سوور و هۆنینەوە ئەوترێ کە ئافرەت خۆی پێ ئەڕازێنێتەوە مای زەرد و کاوە: بەو جێگا سەختانە ئەوترێ کەلە چیادا ساف و زەردباو ئەنوێنن.

(2) نسێ: بەشوێنی بژوێن و قەدپاڵە سەختەکانی چیاو بەرزاییەکان ئەوترێ کە شێ و تەڕاییان هەیە و سەوزاییەکانیان تا دوا هاوینێکی درەنگ ئەمێنێ بە تایبەت کە بەفری لێنەبارێ، ئەو بەفرە ئەمێنێتەوە پیرەمێردی شاعیر ئەڵێ:
نسێ بوو شوێنەکەی ئەیبەست ئەما تاکو دەمی پایز

(3) پەڵەی گوڵاڵە: کۆمەڵێ گوڵاڵەی زۆر لە نزیك یەکەوە رواون و فەرشێکی گەورەی پڕ لە گوڵ و گوڵزاریان پێك هێناوە بە پەڵە گوڵاڵە ناو ئەبرێ

- چنوور: گیایەکی کێوی بۆن خۆشە.

ئای.. جەستەی ئاڵتون، کەژاڵ چاوانی
نێرگس خەیمەگای زێڕی هەڵداوە[1]

چوون بووکی شاخە جریوەی شمشاڵ
شاباشی شایی هاژەی چەماوە[2]

بەزم قەتارەی قوڵنگ و قازە
(مەی) تریفەیە (جام) مەنگی ئاوە[3]

---

(1) خەیمەگا: خەیمە + گا.

خەیمە: چادر– دەوار، رەشماڵ واتە نێرگز لەو دەشت و دەرە ئەوەندە چڕ و پڕ روواوە که مرۆڤ وا ئەزانی رەشماڵی زێڕینە و هەڵدراوە.

(2) چووز: چووزەرە.

(3) بەزم: بەزم و رەزم.. جۆرێکە لە دەربڕینی هەستی شاد و خۆشی

- قاز و قوڵنگ: لە بەهاراندا و بەتایبەت بە شەو قەتارەی قاز و قوڵنگ لە ئاسماندا ئەیکەن بە بەزم و زەماوەند.. واتە دەنگەکەیان بە بەزم دا ئەنرێ و ئاوازی شادی ئەبەخشێ.

سەرجەم بەیتەکە: بەزم قەتارەی قوڵنگ و قازەی مەی(تریفە) بە جام مەنگی ئاوە شاعیر زۆر شارەزایانە مامەڵەی لەگەڵ وشە و واتادا کردوە و مەی چواندوە بە تریفەی مانگە شەو کە دنیای مەست کردوە و کاسی مەیەکەش مەنگی ئاوەکەیە، چونکە تریفەی مانگەکە لە ئاوە مەنگە کەدا ئەبینرێ، ئەگینا ئاو خوڕ و جولاو بێت شێوەی مانگەکەی ئەشێوێ.

ئاوێنـــه بــــەردە (جـــوان) گردەکانـــه
(پـــرچ) تـــارای گوڵـــه (شـــانه) شـــەقاوه

لەســـــەر چـــنار نـــاز، لـــەزەڵم ســـازێ
لـــــه قـــــۆپی رازی بـــــه هەشـــــت رازاوه

شـــیرین.. شـــیرینی خـــاکی کوردســـتان
هـــــەر بـــــۆ پەرســـــتن دروســـت کـــراوه

***

# کـــاروان

١٩٥٤

کەوتۆتـــە ڕێ کـــاروانی ئـــەم کـــوردە بـــەجارێ
دەنگـی زەنگـی هـــەناوی (زۆر) دێنێتـە خـوارێ[١]
ڕێ ئـــەبڕێ بـــا هـــەوراز و پـــڕ دڕك و داڵ بـــێ
تـەکان ئـەدات بـەرەو هیـوای گـەیین بـە شـارێ[٢]
بـەرەو جێیــە ئینــسانەکان دەسـتی مانــدوویان
بخەنــە ســەر سـکی تێـری بــە کـسب و کــارێ
ڕۆژی ئامــانج چریـسکەی بـێ و هــاژەی شـەتاوان
خەرمانی گوڵ بە شەفاف بێ و خونچەی کەنارێ[٣]
بیـــشەکێنێ شـــنەی شـــەماڵ بـــای کامـــەرانی
ڕوونـــاکی دڵ چـــرایە بـــۆ شـــەوی تـــارێ[٤]

---

(1) زۆر : زۆرداری، ستەم، زوڵم..

(2)تەکان: گوژم خۆڕاتەکاندن بۆ پێشەوە..

(3) خەرمانی گوڵ بە شەفاف بێ:

خەرمان: کۆکردنەوەی گەشانەوەی پشکوتنی.

بەشەفاف بێ: بە شەوق بێ، بە کەیف بێ.

واتــەکاتی گــوڵ ئەکرێتــەوە و ئەگەشــێتەوە، ڕووی خــۆش پــڕ لەکــەیف و شــادی بــێ

ـ کەنارێ: قەراغێ، لێوارێ، کەناری چەم، گوێی چەم..

(4) بیشەکێنێ: بی لەرێنێتەوە، بجوڵێنێتەوە..

کەوتۆتە رێ کاروانەکەی پرچەك بە بڕوا
نای وەستێنێ گەڤینی سەگ، گەزینی هارێ[1]
بەناو دەرەو چیای سەختا بە چنگە کڕێ
سەر ئەکەوێ بۆ ئەو پەڕی دەشت و بەهارێ[2]
بەڵام کاروان لەگەڵ ئەوەی پشتی ئەستوورە
بە لاوچاکی دەوروو پشتی لەش زرێدارێ
تاکە تاکە لە رێچکەی دا سەر نەوی کردو
سنگ ئەکوتێ ورد، لەسەرخۆ وەك زەردە مارێ[3]
بەو نیازەی ساکەی هەڵێ، یەکێ پێی رێکەوت
لەشەقامی رۆیین دەرچێ گورج پەلامارێ
دانی تیژی زەهر ئالووی تێ بچەقێنێ

(1)گەڤین: وەڕینی سەگ هەڕەشەو گورشەی سەگ دیارە کە سەگ ئەوەڕێ بەو وەڕینە هەڕەشە ئەکات..

هار: سەگ کە هار ئەبێ لە خۆیەوە پەلامار ئەداو گەزینی سەگی هار مەترسی هەیە وەك ئەڵێن: لیکەکەی میکرۆبی نەخۆشی لەگەڵ دایە.. بۆیە هەوڵی ئەهێشتنی سەگی هار ئەدرێ.. و پەندێکیش لەناو کوردەواریا هەیە ئەڵێ: سەگی هار چل شەوی عومرە!

(2) دەرە: دەرە بەو دۆڵەی نێوان دوو گرد یان چیا ئەوترێ کە لە ژێردا بەرەو هەوراز هەڵکشێت..

(3) زەردە مار: ژەهری زەردە مار کوشندەو ترسناکە و بەنموونەی پێوەدەرێکی ترسناك ئەهێنرێتەوە. .

بـــۆ ئـــاژاوە و ســـەر لێـــشێوان(بێتـــە دارێ) [1]

ئـەبێ پێـشەنگ ئاگـادار بـێ و ورد بـۆی بنـواڕێ

زەردەخەنـــەی ژەهراویـــان بخاتـــە بـــارێ[2]

هـــیچ نـــەهێڵی بـــڕۆ جووتکـــەن کلـــك راوەشـــێن

بـــە چەکوشـــی ئاســـنینی ســـەریان بهـــاڕێ[3]

بـە پـەڕۆیی کلکـی پیـسییان بگـرێ بـەڵام چـۆن؟

وای فرێـــدا بێتـــە پەنـــدی رووی رۆژگـــارێ

***

---

(1) زەهری ئالووی: ژەهراوی پێوەدانێکی کوژەر.

ـ بێت دارێ: ببێتە سایە، ببێتە سێبەر لەبەریا بحەوێتەوە.

(2)پێشەنگ: رابەر، سەر قافڵە، پێشەنگی کاروان، گەورە، سەرکردە.

زەردە خەنەی ژەهراویان: پێکەنینی درۆ و ساختە..

(3) لە دیوانە چاپکراوکەی ١٩٦٩ دا ئەم دێرە بەم جۆرە نووسراوە:

هیچ نەهێلی بڕۆ جووت کەن سەر راوەشێنن

بەڵام لەدەست نووسێکی شاعیرا بەم جۆرە نووسراوە:

هیچ نەهێڵی بڕۆ جووت کەن کلك راوەشێنن .

# ڕێگای خەبات

١٩٥٤

تا... فرمێسکی ڕەهێڵەی خوڕ
نەڕژێتە سەر

نەڕژێتە سەر چرۆی قوپاو
نایەتە بەر... [١]

پێ ناکەنێ بەبای شەماڵ
ناتروکێنێ

چاوی نووستووی
ژێر هەوری تار [٢]
***

ناکرێتەوە... !
نابێ بەسەر پۆشی درەخت
چرۆی گرژی نە پشکووتوو
لێو هەڵقورتاو

---

(1) ڕەهێڵە: بارانێکی بەخوڕ و بەهێزە.

نەڕژێتە: لەسەری پەیدا نەبێ.. ئەگەر لەسەری نەبێ.

(2) ناتروکێنێ: پێڵووی چاو بە یەکدادان، چاو کردنەوە نوقاندنی.

بـــۆ ئـــــاوی چـــاو... !! [١]

***

تــــا.. قـــرچ و هـــــــوڕ
وەك گـــــــڕی ســـــــوور [٢]
شــــــەو پـــەروانــــــــە
نـــەســــووتـــــــــێنێ [٣]
بـــاڵـــــــی تـــەنـــــك
بـــــۆ ئـەفـــــســـانـــە..!!
***

بۆنەختــــــــێ رۆشنــــــــایی
لێ دیار
بـــــــــۆ... چـــــــــاوەزار [٤]

(1) چرۆی گرژی: چرۆیەکی نەپشکوتو کە پەڕەی گەڵاکەی چنگیان بە یەکدا کردوە هاتونەتەوە یەك..
(2) قرچ و هوڕ: کە ئێسك و گۆشت و پەز بە ئاگر ئەسوتێنرێ یان هەڵئەپروزێنرێ. دەنگی قرچ و هوڕ ئەبیستێ.
(3) شەو پەروانە: شەو کەتاریك دا دێت پەپولە عەوداڵ و وێڵی تیشکی رووناکیە و لە هەر لایەك تروسکەیەك بەدی بکات خۆی بۆ ئەکوتێ و بەدەوریدا ئەگەڕێو ئەسووتێ ئەمەش ئەو ئەفسانەیە دروست ئەکات کە پەروانە ژیانی ناو تاریکی رەت ئەکاتەوە و مردنی بەر رووناکی پەسند ئەکات.
(4) بۆ .. چاوەزار: بۆ پاراستن لە چاو پیاهەڵنانەوەی چاوی پیس، بۆ پاراستن لە چاوی حەسوود.

لێوی بێزاری تاریکی

ناگاته ناو
مەشخەڵی رووناکی

لێ دیار
ئەبێ بەتاو

بیارێنێ پەڕی سووتاو(١)
ئەگینا چۆن.؟
تاڵە دەزووی تروسکەی دوور
تروسکەی دوور

لەقاچی نەرمی ئەنالێ
ئەنالێ
ئەی برد بۆ قوژبن و چاڵێ..؟
***
تا... پەپوولەی
باڵ کونجی تێر

---

(1) ئەبێ بەتاو:
تاو: جار، کەرەت .. ئەڵێن.. ئەم هەورە تاوە...
بارانێکی باشی پێوەیە یان ئەڵێن بەتاو: واتە بەخوڕ و بەگەرم و تیژی ئەبارێ.

تەی نەکا ڕێ

نەگەڕێ

هەردەی تارا پۆشی

نیشانەی جێ

لێی ون نەبێ

نووکی دڕک

سنگی شەقار

نەکا ...

بازرەقە نەبەستێ[1]

کە پەلامار

بهێنێ مار..!

***

ناگاتە هەڵاڵەی نێرگس..!!

لێوی برسی

پەڕەی ناسک

ناخاتە ناو

ناو دەمی

داخی گوڵاڵە

***

---

(1)سنگی شەقار: واتە سنگی هەڵدڕاو یان سنگی پارە پارە و بریندار.

زۆر مەحاڵە[1]
بە باڵی پشوو
بەیەك و دوو
بێنێتە سەر بووكی بنار
***
بەڵێ
ئێمەی وێڵی گوڵێ
ئەمانەوێ
بە خوێنی قاڵی رۆڵەمان
بپشكوێ..
چۆك لەناو لێفەی ئاراما
بەبێ كۆشش
بێ تەقەلا
بەبێ سووتان
شەوگاری كش[2]
ئەبێ بە نیوەڕۆی رووناك
بە چراخان
لەشی برینداری ستەم

(1) زۆر مەحاڵە: زۆر سەخت و گرانە ئەو كارە ئەنجام درێ
مەحاڵ: گەلێ جار بە واتای دەگمەن یا مومكین نییە دێت.
(2) كش: خامۆش، ئارام هێمن، بێدەنگ.

گـــــــــــورج گۆشـــــــــتەو زوون[١]

ئـــەكـــــا لـــــــە پـــــڕ..

***

كەوابوو

زنـــجيـــــــــــر و پێـــــــــــوەن

ئــــــــەی پێـــــــســــــت دابـــــــڕ

بگـــــــە ســــــــەر ئێـــــــسقانی ســـــر

وەك مـــــــــاری كــــــــــڕ...[٢]

***

ديـــــــــــــواری پــــــــــــانی

زيندانی

قــــــــــــووچ و بڵنــــــــــــــد[٣]

گـــــــــــلێر كــــــــــــەرەوەی[٤]

---

(1) گۆشتەو زوون: شوێن برین و زام كە روو لە چاك بوونەوە ئەكات، توێژاڵێك دروست ئـەكات و قەتماغـەی پـێ ئـەوترێ، ئەمـە نیـشانەی خۆگرتنـەوەی شـوێن دەلاقـەی برینەكەیە، سا گەلێ جار جۆرە خرويەك لە ژێر ئەو قەتمانەيەدا پەيـدا ئـەبێت و گـەر بلێت:

شوێنی برینەكە ئەخورێ، وەلامت ئەدرێتەوە و ئەڵێن هیچ نی یە برینەكە گۆشتەو زوون ئەهێنێتەوە واتە چاك ئەبێتەوە..

(2)وەك ماری كڕ: وەك ماری بێدەنگ و مات و هێمن.

(3) قووچ: بڵند، بەرز، هەڵچوو بەرەو ئاسمان

(4) گلێر: تل پێدان ئەم دیو ئەو دیوی پێكردن و خلۆر كردنەوە... ئەڵێن: باگردینەكـە گلێركەرەوە واتە تل بە باگردینەكە بدەو خلی كەرەوە.

دڵانی

لــــەئــــــــاوات پـــــــــڕ

بیپروێنە

دایڕزێنە[1]

جــەستـــــــــەی دیـــــــــڵت..!

ئـــــەبێ بزانـــــی ئـــــەو پێیـــــەی

کەوتە ڕێ

ئەگاتە جێ

ئەگـــــــــاتە مـــــەنزڵی شـــــادی[2]

بۆ ئـــازادی

بــــــــە فـــــیڕۆی نـــــــــــادا[3]

خوێنـــاوی

بەلێشاوی[*]

*****

(1) بیپروێنە: هەڵیپروێنە، وردیکە و لێی کەرەوە.. هەندێ جار کە جل و بەرگ قوڕاوی ئەبێت: ئەڵێن با وشك بێتەوە ئەوسا قوڕە وشەکەکە بپروێنەو لێی بکەرەوە.

(2) مەنزڵی شادی: شوێن مەبەست، بە ئاوات گەیشتن.

(3) بەفیڕۆی نادا: لەدەستی نادا ناهێڵێ لەچنگی دەرچێ لەکیس خۆی نادا.

(*) شیعری.. ((ڕێگای خەبات))لە دیوانەکەی ساڵی ١٩٦٩دا بە شێوەیەك داڕێژراوە و دوایی شاعیر خۆی ئاڵ و گۆڕی بە شوێنێ هەندێ وشە کردوە و سەرلەنوێ چنیویەتەوە و دایڕشتونەتەوە.. منیش داڕشتنە نوێیەکەی شاعیرم نووسیوەتەوە.

# گەشتێ(*)

**١٩٥٤**

ئــەی تریفــەی مانگــە شــەوی زیــوینی ئاسمــان
بۆ بە تۆسقاڵ جار بە جارێ خۆت ئەدەی نیشان[1]

دەربکـــەوە روونـــاکی پـــاك بـــەرە ســـەرینم
بـۆم روونـاك کـە زینـدانی تـار ژووری کـەمینم..!

رازاوەیـــە دیـــواری پـــان رێـــچکەی زنجـــیری
دەم کـراوە و عەزرەتییـە لـەش(مـنم نێـچیری) [2]

زۆر گیانی سەخت، پێستی ئەستوور، مەچەکی پتەو
لەشـــەڕا بـــوون لەگـــەڵ ئاســـن بـــە رۆژ و بەشـــەو

---

(*) گەشتێ: مەبەستی شاعیر لەو گەشتە دوورو درێژەیە کە لە ساڵی ١٩٥٤ دا دوای گەڕانەوەی لە کۆنگرەی لاوان لەسەر ئاشتی خوازی گیراوە و رووە و گرتووخانەی کەرکوك ئەوسا بۆ بەغا و دوایش بۆ خەستەخانەی شاری کەرکوك و لەوێشەوە بۆ سلێمانی.. دیارە ئەو ماوانە بەندی ژیانی لەژێر زەمین و گرتووخانەکاندا بەسەر بردووە..

(1) بۆ بە تۆسقاڵ: بۆ بەکەم کەم، بەکزی؟ بە گەرد گەردی.

(2) عەزرەتییە لەش:

عەزرەتی: پەرۆشێتی، حەزی لێ ئەکا، ئارەزووی لێیەتی، تامەزرۆیەتی.

لەش ئارەزووی ئەشکەنجەو ئازار ئەکات، دیارە وەك باجی ئازادی... حەز بەخۆ بەخت کردن ئەکەم لە پێناوی سەرکەوتنی بیرو باوەرمدا.

لــه ئــه‌نجاما.. قــه‌فی زنجــیر.. هه‌ڵقــه‌ی قــولاپی
وزه‌ی شــووڵ، دانــــه چـــێره و بـــڕه‌ی خراپـــی[١]

وورد ئه‌بوون و هیلاك ئـه‌بوون بـه ده‌سـته و وسـان
له‌بـــه‌ر ره‌قـــی دڵـــی پـــۆلا و راوه‌ســـتانی گیـــان[٢]

منـــیش ئاســـۆی ســـووری هیـــوای جـــێگیری دڵـــم
گه‌شـه‌ی ئـه‌دا بـه ئـاوات و جۆش بـوو بـۆ كـوڵم[٣]

ئـــیتر زڕه‌ی زنجـــیری شـــه‌و ته‌قـــه و ره‌قـــه‌ی ئـــه‌و
ئارامێ بـوو بـۆ شـه‌وگارم یـا بـۆ پرخـه‌ی خـه‌و..!

تــۆم لــێ دیــاری (كولــووی لۆكــه) مــه‌لی ئــاواتم
گـــوڵی هـــه‌رده‌ی ره‌نگیـــنم و بـــه‌ر و بـــه‌راتم[٤]

---

(1) وزه‌ی شووڵ:
شووڵ: به داری ته‌ڕ و نه‌رم ئـه‌وترێ وه‌ك دارێكـی بـاریكی هـه‌نار پێـی ئـه‌وترێ شـووڵی هه‌نار و زیاتر بۆ جه‌ڵده و لێدان به‌كاردێت.
وزه‌ی شووڵ: ده‌نگی شووڵه له‌كاتی به‌كارهێنانیدا.

(2) ده‌سته‌و وسان: ده‌سته پاچه، بێ ده‌سته‌ڵات لـه ئاسـتی رووداودا هـیچ نـه‌كردن و ده‌ست له‌سه‌ر ئه‌ژنۆ راوه‌ستان

(3) كوڵم: جۆش و خرۆش، جۆش و كوڵ ، گه‌یشتن به‌پله‌یه‌كی به‌رزی گه‌رمی و ئاستی كوڵان ئه‌گه‌یه‌نێ.. یان كوڵی خه‌بات له مه‌یدانی گیانبازیدا.

(4) كولووی لۆكه: قۆزاخـه‌ی لۆكـه، تۆپـه‌ڵـه لۆكـه‌ی سـپی لێـره‌دا بـه كـۆتری سـپی و كۆتری ئاشتی چوێنراوه.

بۆ ئەوەی تۆم بێیتە باوەش دەمی کراوە
بۆ خواردنی جەستە و لەشم پڕ لە شاڵاوە

بۆ ئەوەی تۆ باڵی زێڕین بکەی بە سێبەر
لە ژێر باڵتا. سەربەستی بێ و سەرچاوەی هونەر

بۆ جۆگەلەی روون و ساردی گوڵی کوردستان
گەشە بکا و بۆنی خۆشە بگاتە ئاسمان

نەتەوەی کورد دەس لەناو دەس لەگەڵ براکەی
هاوڕێی جیڕی تێکۆشان و رەفیقی راکەی[1]

بەرامبەری داگیر کەری هەر دوو نەتەوە
ئاگر کەری توونی شەڕ و چەوسێنەرەوە

بجەنگن و هەنگاو بنێن بەرەو ئازادی
بەرەو رۆژی رزگار بوون و بەهەشتی شادی

ئەوا زنجیر، ژووری تاریک ، تارمایی زیندان
هاودەنگمە و مۆسیقامە بۆ شەوی لێدان ..!

---

(1) نەتەوەی کورد دەس لەناو دەس لەگەڵ براکەی: مەبەست لەو تێکۆشانە هاوبەشییەیە کە نەتەوەی کورد لە پێناوی سەربەستی و ئازادیدا لەگەڵ برای عەرەبیدا ئەیکات.

هاوڕێی جیڕی تێکۆشان و رەفیقی راکەی: واتە کوردو عەرەب هاوڕێیەکی دەست لەناو دەست و تێکۆشانێکی بەهێزن ، هاوڕێ و راودونراوی دەستی دوژمنن.

تــۆم لێ دیــاری مــەلی ئاشــتی و ئــازادی ویــستن
چەن قورس بێ و هەڵقــەدار بــێ زنجــیری گــەردن[1]

داینــــابڕێ ملـــی بــــەرزی خـــەبات و ویـــستنم
نایێنــــەوێنێ رەقـــی پـــشت و راســـتی گـــەردنم

ئــەی بولبــولی شــەوان بێــدار تــا بــەری بــەیان
تــۆ بــۆ مــن و منــیش بــۆ تــۆ ئــەبین بــە نیــشان[2]

ئـــەوا ئێــستا پێــچەوانە مـــن لـــە جیــاتی تـــۆ
لــە قەفەســدام، ئێــشك چــێتیم گرتۆتــە ئەســتۆ ..!

بـــۆم بخوێنـــە منـــی نـــەخۆش، منـــی دەردەدار
چەشــی ئــێش و ناهــەمواریم هاوڕێمــە ئــازار ..! [3]

ئـــەی گوڵەکـــەی رەنـــگ پەمـــەیی ســـەرداری ژاڵـــە
وەك بیــستوومە رەنــگ شــیرین و چێــشتنت تاڵــە

---

(1) مەلی ئاشتی: کۆتری ئاشتی ، کۆتری سپی.

(2) بێدار: بەئاگا، بە خەبەر ، خەو لە چاو تۆراو، نەنووستوو.

(3) لە دیوانەکەی ساڵی ١٩٦٩ دا ئەم دێرە وا نوسراوە:

فێری ئێش و ناهەمواریم هاوڕێمە ئازار .

بەڵام لەدەست نووسەکەی شاعیردا وشەی فێرکراوە بە چەشی:

- چەش: فێربوو ، راهاتوو.

بـەڵام تـاكو ئـەم قـسەیە .. كامـە عەشـقی گـوڵ
توانیــوێتی دەســتی(نیــان) بێنێتــە ســـەر دڵ

كـام ئاشـق و كـام پەرۆشـی روخـساری شـیرین
گەیــشتۆتە هیــوای ســەوداو ئامـــانجی زێـــرین

ئـیتر بـاتۆ تـا ئێـوارە بـەم تـام نـاخۆش بـێ
كـە بەشـێوە جێگـای سـەرنج سـەرمایەی جۆشـبێ

تا ئەو رۆژەی چوار ئێسكەكەم ئەخرێتـە نـاو چـاڵ
بـۆ گـوڵی رووت ئەسـوتێم و ئـەبم بـە زوخـاڵ .. [١]

بـــەڵێ دەردم زۆر گرانـــە ، پەرۆشـــە گیـــانم
بـــۆ هیوایـــە بـــۆ ئامانجـــێ بەنـــدی زینـــدانم[٢]

بـەڵام نـەدەرد نـە نەخۆشـی نـە زنجـیری دەسـت
بەقـەد موییـك پـێم لانـەدا لـەرێگای مەبەسـت؟[٣]

---

(1) زوخاڵ: خەڵووز ئەسووتێنم، وەك خەڵووزم لێ دێت

(2) ئەم دێرە لە دیوانەكەی ساڵی ١٩٦٩ دا بـەم جـۆرە نووسـراوە: بـۆ ئامـانج و بـۆ هیوایێك بەندی زیندانم.

دیارە بەخۆدا چوونەوەی شاعیر مەبەستی پێكـاوە بـەری هیـواو تێكۆشـانەكەی ئامـانج بەدی هێنانە و ئاكامی تێكۆشانەكەیە.

(3) بەقەد موویێك: بەقەدەر یا بەئەندازەی موییك.

زۆر مێـــشکی بیرکـــەرەوە لـــە دواڕۆژی روون
هـــاڕابوون و لـــەژێر پێـــدا بـــوون بـــە هـــەپروون[1]

منـــیش یـــەکێ لـــەدوای هـــەزار، لـــەپاش ملیۆنـــێ
دەســـتی گـــەرمی خـــەباتکردن رام ئەوەشـــێنێ

هـــانم ئـــەدا بـــۆ کـــۆڕی ســـوور کـــۆڕی تێکۆشـــان
نەترســـم بـــێ لـــەئازار و لـــەقوولّی زینـــدان

بگەمـــە جـــێ.. ئاشـــتی وەك رۆژ دەرخـــا هـــەتاوی
قاقـــای نـــازدار، هـــاژە هـــاژ و خـــوڕەی چـــەماوی

نـــاو قەڵبـــەز و چـــیاو دۆڵـــی خـــاکی کوردســـتان
تـــوانج بـــدا لەناڵـــەی نـــەی لـــە ســـۆزی کـــەمان

پـــۆل پـــۆل مـــەلی ئاشـــتی جـــوانی ئاسمـــانی شـــینم
ســـێبەر بکـــا بـــۆ چـــیمەن و گـــوڵی نەخـــشینم

ئەوســـا مـــن و گـــوڵی ژاڵـــەو بولبـــولی ناکـــام
حـــسابێکی ورد ئەکـــەین و ئەگەینـــە ئـــەنجام.

***

---

(1) هاڕابوون: ورد کرابوون..

هەپروون: ورد کردنێکی زۆر ورد و خاش بوون.

# نیگایەکی شین

١٩٥٤

چنگێکی ئاسنینی ڕەش  رایکێشاوم
لەچوار دیواری قووچ و کەش  خزێنراوم[١]
ئەوەندەی کەللەی بێژنێ  ئاسمانی شین
چاوی وەك کونی سووژنێ  پڕ قارن و قین[٢]
ئاراستەی ناوچەوانم و  دوو چاومە
ڕێگری شیعرەکانم و  هەنگاومە
وێڵم بەدووی پرشنگێکا  گەش و ئاڵە
بە دووی ئاوازی زەنگێکا  زۆر زوڵاڵە
لێم دیار نییە پرشنگەکەی  ناگاتە جێم
لێم ونە زڕەی زەنگەکەی  نایەتە گوێم[٣]
لەو دیو دیوار لەو دیو دیوار  کاتێ گزنگ
ئەکەوتە سەر مێرگی بنار  لەگەڵ ئاورنگ[٤]
لەو کاتەدا نیگای چاوی  سەر گێژکەرم

---

(1) قووچ:بەرز، بڵند.

کەش: لێرەدا بە: بەرز و بڵند دێت وەك ئەڵێن چیایەکی سەر کەشە.

(2) پڕ قارن و قین: پڕ لە توڕەیی و کین و رق ئەستووری.

(3) ناگاتە جێم: واتە ناگاتە ئەو شوێن و مەنزڵەی منی لێم.

(4) مێرگی بنار: بژوێن و سەوزە گیا و شینایی بنار و قەد پاڵی چیاو گرد.

یـاخۆ بـۆنی زوڵفـی خـاوی     ئاگـا بـەرم[1]
دایئـەخورپان دڵـی سـووتاو     تاسـەی بـە گـوڕ
سەری ئەکرد لە هـەر دوو چاو     فرمێسکی خوڕ[2]
لـەو کاتـەدا مـن پـەتیارەی     شـێوەیی بـووم
بۆیـەی سـووری ئـەو نیگـارە     تێی هەڵئەسووم[3]
لـەو کاتـەدا مـن ئەمەویـست     ئـەو ئـاوازە
ئەوەی بە گوێی دڵم ئەم بیست     ئـەو پـەروازە[4]
هـەر لـە دوورەوە نیگـاری     وەك گـڕی سـوور
وەك ئەستێرەی گوێی کـەناری     ئاسمـانی دوور

تـاو تـاو بـە جریـوەی دووری     بم لاوێنـێ
دڵـی راهـاتووی رەنجـووری     بهاژێنـێ[5]
بناڵێنـێ تـا دوا نـووزەی     گـەرم و بێبـاك

---

(1) ئاگا بەرم:

ئاگا: هۆش و هەست، بەئاگا بوون، بەهۆش بوون.

بە ئاگا و هەست و هۆش جڵەو ئەگرێتە دەست.

(2) فرمێسکی خوڕ: ئەو فرمێسکەی لە چاودا قەتیس نامێنێ و دێتە خوارەوە.

(3) پەتیارە: پەتەڕی یا شێت و شەیدا.

(4) پـەروازە: ئەگـەر بـەم جـۆرە بنووسـرێ پـەڕەوازە ئـەوا بـە واتـای تـەرە و دوورکەوتنەوە دێت.

بەڵام گەر بە پەروازە بنووسرێ ئەوا بە واتای تێشوو دێت.

(5) بم لاوێنێ: لاواندنەوە جۆرە ئـاوازێکی خـەمناکی گریانـاوی بەسـۆزە بـەڵام لێرەدا بەواتای ژێرم کاتەوە و رووی نازم بداتێ.

تا ئاوات ئەو كۆرپە و چووزەی ئەكرد بە خاك[١]
وامن كەوتوومە ئەو دیوی دیواری قووچ
ئەو ئاواتەی هەم بوو رۆیی ئەویشم پووچ
لێم ناگەڕێ.. لێم نا گەڕێ یادی دەنگی
گەیشتە گوێچكەی دڵ كەڕێ شێوەی شەنگی[٢]
ئەوا نیگاییێكی تازەی شین تر لە ئەو
پچڕانی لۆلۆی دەسرازەی ئارام و خەو
لێم ناگەڕێ.. من نازانم پەنای سروەت
بۆ گوێ باری شانم دەستی رێكەوت[٣]
هەستێكی باڵ شكاوم بوو ئەویش نەما
كونجێكی پڕ لە داوم بوو كەچی رما ..!
ئەی نیگای مەنگی بێدەنگی دوو چاووی شین

---

(1) نووزە: دەنگێكی زیگنی نزمە و نیشانەیە بۆ دەربڕینی هەست و هۆشی مرۆڤ بەرامبەر ستەمێ یان هەڵوێستێ.

كۆرپە: منداڵی ساوای تازە لەدایك بوو.

چووزە: هاو واتای كۆرپەیەو لێرەدا بۆ گۆپكەیەكی نەكراوە بەكار دێت.

(2) شەنگ: شۆخ و شەنگ، جوان و قەشەنگ.

(3) سروەت: پەنای سروەت، پەنای ئارام و بێدەنگ پەنای هێمنی

تـــیری بـــرژانگ و خـــەدەنگی		پـــڕ تـــاب و تـــین[1]
لێم گەڕێ بەشقی ئەو دەستەی		تـــۆی وا خولّقــان
ئەو دەستەی ئەو بالاّ و جەستەی		تۆی وا نەخشان[2]

تـــا لـــە ناوزینـــدانی تـــارا		دووری لـــە ئاســۆ
لەگـــەڵ درێـــژی شـــەوگارا		بـــە یـــادی تـــۆ
کەی تاریکی یا شەوە زەنگ		شـــەبەقی ســـوور
کردی بە ڕۆژگارێکی شەنگ		تـــۆ دوور بـــە دوور
بیتری و کینە شینی نیگای		بەرامبـــــــــەرم
بیکە بە قیبلە و سوجدەگای		گیـــان و ســـەرم

***

---

(1) پڕ تاب و تین:

تاب: شەوق و گەرمایی یان تاو و وزە.

پڕ تابوتین:پڕ لەتوانا و تین بەواتای گەرمایی، تاوساندن، خاوەن تین و توانا.

(2) بە شقی: بە عەشقی ، سووێند خواردنەوە بە عەشق و پیرۆزی ئەو شتەی سوێندەکەی پێ ئەخورێ.

– تۆی وا خولّقان: تۆی وا دروستکرد، تۆی وا پێکهانی، تۆی وا ساز کرد و ئامادەی کردی.

– وانەخشان: وا بە ڕێك و پێکی ، وا ڕازە و جوان.

# گوڵی ئاوات[١]

١٩٥٣

ئەی گوڵی ئاوات، گەشەت بێ و پێکەنە
نەختێ نرخ و فەڕ بدە بەم چیمەنە
گیان پەرۆشی بۆنی ئێوارانتە
سەرپەرێشانی پیاڵەی گوڵشەنە
بۆمژی جامی لەبا لەب ئاڵتە
لێوی ناسۆرم بەبار و وشکەنە
بۆ کز و سیس و لوول و بێ گەشەی
ریشەیی تۆرا و تاڵیت هەڵکەنە
کوا لە کوێیە بولبولی سەوداسەرت
بۆچی بێ ئاواز و یۆزی دەگمەنە

***

گوڵ وتی ئاسمانی پاکی نیشتمان
پڕ تەم و هەوری بەد و ناڕەسەنە
وا لەژێر تینی گڕی داگیرکەرا
هەردەیی رەنگینی خاکم رووتەنە

(1) ئەم شیعرە لە گۆڤاری رزگاری ژمارە (١)ی ٢٠ی نیسانی ١٩٦٩ وەرگیراوە. بۆ یەکەمین جاریش لە رۆژنامەی (ژین)، ژمارە (١١٦١)ی ساڵی ١٩٥٣دا بڵاوکراوەتەوە..

هەر زرەی زنجیر و زرمەی پێوەنە
سەیری پەنجەی دوژمنی تینوو بەخوێن
نەو گوڵی لاوان ئەکاتە دەسکەنە
من ئەڵێم ئەی گوڵ گەشەت بێ و پێکەنە
نەختێ نرخ و فەڕ بدە بەم چیمەنە
پێکەنە خوێنی رژاوی میللەتم
با لەپێ بگرێ ئەوی لێم دوشمنە
پێکەنە ئەمڕۆ لەجێگەی دەست و پێ
بۆ قەفی زنجیری دوژمن گەردەنە
وا بەخوێنی ئاڵی بێگەردی شەهید
شەو ئەڵێی ڕۆژی ڕەوان و ڕەوشەنە
پێکەنە وا تیشکی ڕۆژی ڕاپەڕین
هەر لەسەر لووتکە هەتاکو دامەنە
تۆ تەماشا بەردی دەستی میللەتم
بۆ سەری ماری رژێمی بۆگەنە
سەیری کۆسپی رێگری رێگەی خەبات
جێگەپاچی میللەت و لووتی شەنە
پێکەنە ئەی گوڵ ئەوا ئاسۆی نەجات
خۆبەخوێنی رۆڵەکانمان ئەلۆوەنە
موودەبێ هەرها کە ناقووسی بەیان
دەنگ و ئاوازی گەیی بەم مەڵبەنە.

ـ له سەرەتاکانی ساڵی ١٩٦٠دا هەندێ لە برادەرانی پێشەوەی خەباتی سیاسی ئەوسا پەیوەندییان بە دیلانەوە کرد لەوانە کاك نوری ئەحمەد تەها، چوونە لای خوالێخۆشبوو (مەحمود ئەحمەد)ی چیرۆکنووس کە یەکێك بووە لە کادیرە پێشکەوتووەکانی حزبی شیوعی. کاك نوری باسی لەوە ئەکرد کە گوایە برایانی پارتی ئەیانەوێ شۆڕش هەڵگیرسێنن بەرامبەر رژێمی عەبدولکەریم قاسم. کاك مەحمود قسەکانی کاك نوری زۆر لاپەسند ئەبێ، لەو کاتەشدا کاك مەحمود لەناو جێگادا کەتبوو و نەخۆشبوو، وتبووی: ئەگەر شۆڕش ئەکەن با شۆڕشی کورد بێ بە پارتی و شیوعی و عەشائیر و هەموو کوردەوە، چونکە ئەمە ئاواتی هەموو لایەك دێنێتەدی، بەڵام ئەترسم بەم ئاواتە نەگەم و هەتا ئەمرم خەوی پێوە ببینم!. دوای کۆچی دوایی مامۆستا مەحمود ئەحمەد شۆڕش لە هەموو لایەکەوە هەڵئەگیرسێ و شۆڕشی ئەیلول پەرەئەسێنێ. ئەوساش دیلان لە ساڵی ١٩٦٩ روو ئەکاتە خوالێخۆشبوو مەحمود ئەحمەد و ئەڵێ:

دێتە گوێم، دەنگێك ئەکاتە گۆڕی تەنگ و تارەوە
پێم ئەڵێ مەحمود لەڕۆژی کۆچی دوایی پارەوە
ئەو خەوەی ئاواتی تۆ بوو دێتە بەرهەم ئێستە وا
مەشخەڵە بۆ شەو لەسایەی رۆڵەی وشیارەوە(١)

***

(1) سەرچاوەی ئەم پێشەکی و چوارینە کاك هونەر دیلانە

# کواتیمالا[*]

١٩٥٤

پرشـــــــنگێکی درەوشـــــــەدار
پریـــسکی ئـــەڕوا شـــارەو شـــا[١]

بگاتـــە هـــەچ لوتکـــە و چـــۆڵێ
گـــــەروویێ، چـــــاوەیێ دۆڵـــــێ

گـــوڵی سیـــسبووی گـــەرمای ســـتەم
ملـــی کەچـــی ژێـــر بـــاری خـــەم

ئەیهێنێتـــــە بریـــــق و هـــــووڕ
ئـــەیکا بـــە گـــەردنی بلـــوور ... [٢]

ئـــەو پرشـــنگە هـــەر چـــەندە وا
ســـــەری هەڵـــدا لـــە رۆژئـــاوا[٣]

---

(*) بە بۆنەی هێرشێکی نارەوای ئیمپریالیزمی ئـەمریکا بـۆ سـەر گواتیمالا وتـراوە کـە میللەتی گواتیمالا بەربەرەکانێیەکی پاڵەوانانەیان دژی ئیمپریالیزمی جیهانی کرد.

(1) پریسکی: شـەوقی، رووناکی ئـەڵێن پریسك و هـوڕی ئـەو ئاگرە ، واتـە شـەوق و رووناکی ئەو ئاگرە.

(2) بریق و هووڕ: شەوق و رووناکی بریقەدانەوە.

(3) رۆژ ئاوا: ئەو شوێنەی خۆری لێ ئاوا ئەبێت و ئیدی دنیا پەردەی تاریکی ئەپۆشێ بـەڵام لێـرەدا بـە واتـای بـیروڕای فیکـری شۆڕشـی فەرەنـسا دێـت کـە فەرەنـساش کەوتۆتە رۆژئاوا.

بـــــەڵام ڕووناکیەکـــــەی هـــــەرگیز
ناپرســــێ هــــاوین و پـــاییز ..!

لـــە ڕۆژئـــاوا تـــا ڕۆژهـــــەڵات
ڕووناکیەکـــەی (تـــەم) لائـــەبات ..!

گـــوێ ناداتـــە (ڕەگـــەز) .. نـــەوە
سپی بـێ ڕەش بـێ .. هـەر ئـەوە[1]

گـــەلن .. گـــەلان ئـــەوەی ئـــەوێ
ژینـــی ئاســـودەی دەســـکەوێ ..!

چـــنگی چەوســـاننەوەو ئـــازار
بـــبڕێ ، دەســـــتی نالـــــەبار

پـــەل کـــرێ .. تـــۆزی نـــەمێنێ
گـــەردی بـــە دوو چـــاو ببینـــێ[2]

---

(1) ڕەگەز: بنچینەی شوناسناسی نەتەوایەتی کەسانی نەتەوەیەك وەك ئەڵێن: کورد لە ڕەگەزی ئاری و عەرەب لە ڕەگەزی سامی.
نەوە: مەبەستە لە نەتەوە ، گەل، میللەت

(2) پەل ئەکرێ: واتا لە ئەنجامی ستەم و زۆرکاریدا پەل پەل ئەکرێ ، یا هەر دوو دەست و هەر دوو قاچی ببڕێ و لێ بکرێتەوە.

ئەو پرشنگە گڕێکی سوور
ئەخاتە ناو ئاسمانی دوور

ئەنووسێ .. ئاشتی ، ئازادی
گەشەی رزگار بوون و شادی ..

گەیشتۆتە سەر ولاتێ
بە ئاستەم دەنگی ئەگاتێ[1]

هەروەك گولّی بەردی ناو ئاو
دەور و پشتی هەموو تەنراو[2]

بە شەپۆل و دڕکی دڕ
بە زەلکاو و چەقڵی چڕ ..!

ئەو ولاتە هەر چەن دوورە
بەلام هێجگار پشت ئەستوورە

---

(1) گەیشتۆتە سەر ولاتێ: مەبەست لە گواتیمالایە کە مەبەستەکانی شۆڕشی فەرەنسای گەیشتوەتێ.

(2) هەر وەك گولّی بەردی ناو ئاو: دیارە کە بەردێك لەناو ئاوێك دابێت و گولّێکی لەناو دەرچوو بێ دیمەنێکی جوان و قەشەنگ ئەگەیێنێ کە ئەو گولّە ئا لەو شوێنەدا ژیان و بوونی خۆی نیشان ئەدات، گواتیمالاش بە خەبات و تێکۆشانی گولّێکە و چواردەوری بە ستەم و رژێمی گەندەلّ و سەر بە سەرمایەداری تەنراوە

سـا ئیمـڕۆ بـێ یـاخۆ سـبەی
کـە چـاوەی (رق) هاتـەوە پـەی[1]

لـەبن هـەر دارێ ، بـن بـەردێ
لەسـەر هـەر هـەردێ یـا وەردێ

گـوڵانی بـە خـوێن ئـاو دراو
ملانـی بـە دارا کـراو

ئـەو (پرشـنگە) دێنـەوە جـۆش
ئەکەونـە جۆشـش و خـرۆش

منـیش لـەم خاکـە دیلـەوە
بـە دەم ئـاوازی زیلـەوە[2]

ئـەڵێم نیـشتمانی خـەڵکی
خێـرو بێـر و فـەڕ و کـەڵکی
ئـەبێ بـۆ خەڵکـەکانی بـێ
بـەری بـۆ رەنجـی شـانی بـێ

(1) کە چاوی (رق) هاتەوە پەی: هاتە دووان و جۆش.

(2) منیش لەم خاکە دیلەوە: شاعیر کە ساڵی ١٩٥٤ ئەم شیعرەی لە هاوبەشی تێکۆشانی گواتیمالادا وتوە. عێراق لەژێر چنگی نۆکەرانی بێگانەکانی ئینگلیزدابوو بەتایبەت فەیسەڵ و عەبدوللە و نوری سەعید.

- بەدەم ئاوازی زیلەوە: زیل - سنجاب ئامێرێکی مۆسیقایە.

# هاوینی دڵ(*)

١٩٥٥

گـــڕەی پـــەژارەی دووری دیـــدارت
قرچـــەی هـــەڵێنا پێـــستی ئـــارامم[١]

گـەردی سـەر گـوڵی وونـی روخـسارت
شـێوانی وێنـەی تـان و پـۆی فـامم[٢]

شەرای بـێ وادەی تاسـەی ڕەنجـووری
سـووتانی ... تـەرز و گـوڵی ئامـانم[٣]

---

(*) لە ساڵی ١٩٥٥ لە (نوگرە سەلمان) بە بۆنەی کۆچی دوایی باوکی شاعیرەوە (مەلا ئەحمەدی دیلان)وە وتراوە.

(1) گڕە : لە چلەو قرچە قرچی هاویندا گەڵێ جار (با) یەکی گەرم دێت پـێی ئـەوترێ گڕە و بە عەرەبی (سموم). ئەم با گەرمە و گڕەیە هەندێ جـار زیـان بـە بـەروبوومی بێستان ، بەتایبەت کاڵەك و شووتی ئەگەیێنێ.

(2) گەردی: بەو تەپ و تۆزە یا ئەو خۆڵە وردیلانەیە ئەوترێ کە شنەو بـا لـەم لا بـۆ ئەو لای ئەبات.

روخسار : روو ، شێوە.

تان و پۆ: سەرتاپا ، سەرجەم، هەر هەموو تێکڕا.

فامم: هۆش و بیرم ، تێگەیشتنم.

(3) شەرا: کە گڕەی گەرمای هاوین لە کاڵەك یان شووتی ئەدات ئەوەنـدەی ئەگـەیێنێ ناوەکەی ئەترشێ و ئەتەپێ و ئیدی بە کەڵکی خواردن نایەت پـێی ئەوترێ: شـەرا لێ ی داوە.

بێ وادە: کارێك کە لە سات و کاتی چاوەڕوان نەکراوی خۆیدا ئەنجام بدرێ.

ـ تاسەی ڕەنجووری:

ـ تاسە : جۆرێکە لە ئارەزوو یا پەرۆشی . وەك ئەڵێن : تاسەی دووریم بشکێنە : واتە ئارەزووی دووریم بشکێنە یان بێنە دی

ـ ڕەنجووری : دەردەدار و نەخۆش ...

واتە تاسەی ئارەزووی دەردەدار و بیمارم بهێنە دی.

قرچـــەی نیـــوەڕۆی هیجرانـــی دووری
پـــەڕ و پـــۆی ئـــۆقرەی هەڵـــچرووزانم[1]

گێژەلووکەکـــەی دەم ملـــە ماتـــەم
بـــردی بەیـــداخی جۆشـــی دەمـــاخم[2]

تـــەمی ئێـــوارێی گـــوێی کێـــوانی خـــەم
دابپۆشـــێ گـــردی بنـــاری ئـــاخم

هـــات گـــەردەلولی دەشـــتی مەینـــەتی
قڕانـــی ڕێـــزەو پـــەترۆی خـــەیاڵم[3]

---

(1) پەڕ و پۆی ئۆقرەی هەڵپڕوزانم:
ئۆقرە : ئارام ، دڵنیایی و هێمنی
هەڵپڕوزانم : کاتێ باڵندە دوای سەر بڕین ، ئاوەرووت ئەکرێ. دوای ئـەوە بـەئاگر پـەڕە وردیلە باریکەلەکانی ئەسوتێنرێ و پاك ئەکرێتەوە. واتە: ئەو پەڕ و پۆی جەستەیەم کە سەرچاوەی ئارام و دڵنیایم بوو ، سووتانت و نەت هێشتن.
(2) دەم ملە: لە بەردەم یان لە پەنا ملەوە — ملە: قەدپاڵی هەوراز و چیا.
ـ ماتەم : مات و مەلوول ، یا بێدەنگ ، کش و مات ..
ـ هەر چەند ئێستا (ماتەم) بە واتای پرسەش دێت.
دەماخم: مێشك ، گەلێ جار بە واتای شەوق و ئارەزوو و خۆشی دێت ، وەك ئەڵێن فلانە دەماخی هەیە واتە دڵخۆش و بەکەیفە.
(3) قڕانی ڕێز : واتە ڕێزو حورمەت نەماوە و کۆتایی پێهێنراوە پەترۆی خەیاڵم :

ڕەشەبای چلەی تووشی و نەگبەتی
وەرانی میوەی ئاواتی کاڵم ... [1]

دەی گەلاوێژی بەیەکگەیشتن
کەی ئەکەویتە باوەشی داخم

کەی لێو تەڕ ئەبێ بە ئاخ هەڵڕشتن
کەی تەزووی ئۆخەی ئەگا بەناخم

***

(1) ڕەشەبای چلەی تووشی نەگبەتی : واتە ئەو ڕەشەبا سەخت و سارد و بەهێزی چلە کە مەترسی و ناهەمواری نەگبەتی لە دوایە.

- وەرانی میوەی ئاواتی کاڵم: واتە ئەنجامی ئەو ڕەنج و هەوڵەی دام ، ئاکامی ئاواتم نەدی ، چونکە ئەو بەرهەمی مێوەیەی بە تەمای بووم بەر لەوەی پێ بگات بە کاڵ و کرچی هەڵوەری.

# گوڵی سارای خواروو(*)

-١٩٥٥ -

گوڵـە شـینەکەی لاسـك کـورت و سـەوز
بای نـەرمی دەشـتی کـاکی بـە کـاکی(١)

رات ئـــەژەنێت و پێــت ئـــەدا وەنـــەوز
ئـــەزانی وێـــڵ و تـــەریك و تـــاکی(٢)

---

(*) بەهاری ١٩٥٥ سانی شاعیر و کاك نوری ئەحمەدی تەها لـە نوگرەسـەلمان لـە بـن بەردێکا گوڵێك ئەبینن .. ئینجا ئەم شیعرە لەدایك ئەبێت.

(1) گوڵی سارای خواروو :

سارا: بەپێی لێکدانەوە و بۆ چوونی شاعیر .. (صحرا )ی عەرەبییە.

بەڵام سەرجەم ناونیشانەکە مەبەست لە بەندیخانەی نوگرە سەلمانە.

دەشتی کاکی بە کاکی: دەشتی چۆڵ و هۆڵی وشك و دوورە ئاو ، زیاتر بیابانی عەرەبی ئەگرێتەوە.

(2) رات ئەژەنێت: ئەتلەرێنێتەوە ئەتبزوێنێ و ئەتجوڵێنێ ..

ئەم زاراوەیە لە لارە لارەی راژەندی بێشکەی مناڵەوە هاتووە.

پێت ئەدا وەنەوز: باویشك دان و ئامـادە بـوون بـۆ خـەوتن ، واتـە دیاردەیـە کـە ئـەوە نیشان ئەدات کە مرۆڤ پێویستی بە خەوە.

– ئەزانی وێڵ و تەریك و تاکی: واتە لەو دەشـت و دەرە چـۆڵە بـە تـەنیا سـەرگەردان و تەرەی. .

چی گەیانیتیە ئەم مەرزو بوومە؟!
چۆن روای کام بای سەرو هێناتی؟![1]

یا وەك دەمێکە و من زوو وتوومە
کە تۆش پەروازەی دەستی خەباتی..!

تۆ وتت نابێ رێی گەشانەوەم
پەل هاوێشتن و بریقەی دوورم

رێی لێبگیرێ و جێی حەسانەوەم
گردۆلکەکانە و هەردەی رەنگینم

وتت بۆ من و هەلاڵەی لێوم
بۆ هەنگە زەردەی رێگای دوور برە[2]

بۆنی بلاو و پەخشانی کێوم
بۆ ئەو دڵەیە لە ئاوات پڕە

---

(1) مەرز و بووم :
مەرز : بە واتای دوا کەناری زەوی دێت و سنووریش ئەگرێتەوە.
بووم : زەوی.
واتای سەرجەم : ئەم مەرز و بوومە مەبەست ئەم شوێن و جێگەیەیە. .
(2) هەنگە زەردە : هەنگی زەرد جۆرێکی نایابی هەنگە و چوست و چالاك و بە بەرهەمە.

بمدا لە یەخەی دوای فەرمانی سەخت
سۆز و هەنسك و نالّێنی شمشالّ(1)

رامانوەشێنێ و کەیلی بکەین بەخت
ریشەی سزامان دەرکێشێ تالّ تالّ(2)

نەك دەسکەنەمکەن بمخەنە گوڵدان
بمبەنە بەر دەم بتانی ستەم(3)

بمخەنە ژووری کڕنووش و وەستان
شەمالّ و هەتاو نەبینم بە چەم

لە جیاتی دەنگی لوولك و بەستە
تەدبیر کردنی زنجیر کردن بێ

چرپەی چۆنیەتی ئازاری جەستە
مۆسیقای شەوی بەسەربردن بێ ..!

---

(1) هەنسك : جۆرە هەناسە هەڵدانێکە لە گەرمەی گریان و زاریدا هەست پێ ئەکرێت..

(2) کەیل : لێرەدا بە واتەی خەست کردنەوە، پڕ و تۆخ دێت. .

(3) دەسکەنە : بۆ چەپك کردنی گوڵ بەکار دێت. .

تــۆ ئــەوێت نەویــست ڕەشــەبای قــایم
تــۆوی فڕانــی بــۆ ئــەم پــەڕی دوور

بــۆ ئــەو جێگایــەی هەمیــشە و دایــم
پــڕ لــە لوورەیــە و لــە نینــۆکی ســوور(1)

بــەڵێ .. وەکــو تــۆ منــی ئــاوارە
ویــستم بخــوێنم چــۆن دڵــم ئــەڵێ

خوێندم، ڕووم کردە ئەو شەوقەی دیارە
کــــەوا خەریکــــە ئاشــــکرا هــــەڵێ

خوێنـدم چـۆن دڵـم بـۆی نۆتـە کـردم
ئەشــخوێنم هــەتا جووڵــەم تێــدا بــێ

ســەرێ بــوو ســەد جــار هێنــام و بــردم
ڕزگــاری ئــەبێ بــە خــوێن پەیــدابێ

***

(1)پڕ لە لوورەیە و لە نینۆکی سوور :

لوورە : بۆ دەنگی سەگ و گورگ بەکار دێت لێرەدا قسە و جنێوی ناشیرین و پیس ئەگرێتەوە نینۆکی سوور : دەست و پەنجەی خوێناوی.

واتە ئەو شوێنە پڕە لەو کەسە ستەمکارو و زۆردارە شەڕفرۆش و جنێو دەرانەی پەلیان بە خوێنی پاکی مرۆڤی چاك سوور بووە..

# بێخودی شاعیر(*)

-١٩٥٦-

ئەی مانگ.. بۆ لێڵە تریفەی ئیمشەو     هـــــــەڵبزرکاوە؟!
چاوی کـەژاڵت وەك چووبێتە خـەو     سـیس و ژاکـاوە[1].
بریقـــەی گۆنـــای درەوشــەدارت     زەرد و خاکییـــــــە
شەوق و چریسکەی گەشی روخسارت     کـەم روونـاکی یـە[2]
بـۆ زەردەخەنـەی زیـوینی لێـوت     بــەبار و گـــرژە؟
پرچـی روونـاکی پەخـشانی کێـوت     ئـــاڵۆز و گـــرژە؟
ئەی مانگ شا کۆگای ئیلهامی هونەر     پــــەنای ئاسمـــانی
زامـدارەکانی دڵ و ســەودای ســەر     خواوەنـدی جـوانی[3]
بۆ شێوەی شۆخی بـاڵا شـەنگەکەت     ســست و شـــەکەتە؟
گیــانی رازاوە و رووە مەنگەکـــەت     مــۆنی خەفەتـــە؟[4]

---

(*) بەبۆنەی کۆچی دوایی شاعیر (بێخود)ەوە وتراوە. .
بێخود: نازناوی شاعیری زانا و رۆشنبیری کورد مەلا مەحموودی کوڕی حاجی مەلا ئەمینی حاجی مەلا ئەحمەدی چاومارە و لە ساڵی ١٢٩٦ ی کۆچی هاتۆتە ژیانەوە لە ١٩٤٧\٨\٢٠ دا ماڵئاوایی لە جیهان کردووە .. ساڵی ١٩٧٠ دیوانە شیعریەکەی چاپ کراوە.
(1) ـ تریفە : تیشکی مانگەشەو.
ـ هەڵبزرکان: کاتێ شیر هەڵئەبزرکێ تام و رەنگی سروشتی خۆی نامێنێ
(2) گۆنا : سەرکوڵم. روخسار: روو ، دەم و چاو.
(3) شا کۆگا : قەڵەندەرخانەی هونەر و ئەدەب ، مەبەست لەو شوێن و مەڵبەندەیە کە باس و خواسی هونەرو ئەدەبی تیا ئەکرێت و ئەبێتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ کەسانی تر.

(4) شەکەتە: هیلاك و ماندو ، پەك کەوتوو ، لە پەل و پۆ کەوتوو

دڵت لە ئاستی شەوای بێداران پەست و گیراوە
وەڵامی پرسی دەردی بیماران ئەخەیتە لاوە[1]
خۆ منیش وەك تۆ گێژی ماتەمم ڕەشە ئاسمانم
وەکو تۆ وێڵی دەشتەکەی خەمم خورە گریانم[2]
نەك من و نەك تۆ بارەگا و تەختی شیعرو سەلیقە
ڕەش پۆش و زیزە وا شکا بەختی کەوت لە تریقە[3]
فریشتە تك تك دڵۆپی چاوی وەکو مرواری
ئەبارێتە سەر جۆگەی زووخاوی بۆ کوردەواری[4]
ئەزانێ (مەلی) نوکتەو گوفتوگۆ کۆچی کردووە
دەزگاو تەرازووی (ئەدەب) ئەڵێ ڕۆ بێخود مردووە[5]
توخوا بێخودی ئازاری گەردوون گوێم لێراگرە
دڵم لە زووخی تاسەی چەق و چوون سەراپا پڕە

---

(1) دڵت لە ئاستی شەوان بێداران پەست و گیراوە:
واتە دڵت بەرامبەر ئەوانەی بەدیارتەوەن و شەو خەو ناچێتە چاویان و بەخەبەرن. دڵت پەست و گیراوە و قسە ناکەیت و لەگەڵیان نا دوێت.
(2) خورە گریانم : واتە منیش وەك تۆ لە ناهەمواری ژیان گەیشتووم و تاڵی و سوێریەکەیم چێشتووەو باش لێی ئەزانم.
(3) بارەگا و تەختی: مەبەست لەکۆگا مانای ئیلهامی هونەرە لە شیعرەکەی پێشوودا.
- سەلیقە : وردو تیژ بینی و هێمنی لە ڕوانین و پشکنین دا.
- کەوت لە تریقە : واتە لە پێکەنین کەوت ، لە پێکەنین وەستا.
(4) زووخاوی: خەم و پەژارە.
(5) مەلی نوکتەو گوفتوگۆ : مەبەست لە بێخودە کە هەمیشە دیوەخانەکەی جمەی هاتووە و لەبەر قسەی خۆشی و خۆش مەعشەری کەسانی ڕۆشنبیر و ئەدیب و ئەدەب دۆستان هات و چۆیان کردووە.

وا تێنەگەی ئەم شارە خامۆشە		هاتا هەتایە
ئەم مل درێژی (بارەی) پێخۆشە		ئەیکا بە مایە[1]
ئەوەندەت زانی ئاما سەرەو ژوور		هەورەکەی رەحمەت
کوردستان پڕ بوو لە تۆفانی نوور		رایماڵی زەحمەت
ئەی مانگ هاو دەردی کۆنی دێرینم		هاوار وێران خۆم
گوڵە زەردەکەی ئاسمانی شینم		شار پەرێشان خۆم
وەرە پێکەوە شەو بەرینە سەر		من بە سکاڵا
تۆش رازی دڵت هەڵبڕێژە دەر		ساڵ بە دووی ساڵا
من جەستەی رێزی برینی دەوران		تۆ زەردەی ماتەم
شینی بێخودی گردەکەی سەیوان		خۆش بکەین بە خەم[2]

***

(1) ئەم مل درێژی (بارەی) پێخۆشە ئەیکا بە مایە:
- بارە : ئەم حاڵە.. واتە خەڵکی شاری خامۆش کە مەبەستی لە دانیشتوانی سلیمانییە و لە شینی بێخودا ماتەم دایگرتوون و ئەوی روویداوە، ئەمان ئێستا لێی بێدەنگن ئەمە ئەوە ناگەیێنێ کە تاسەر بەم حاڵ و وەزعە رازی بن و ملکەچی زەمانەو رێکەوتەکانی ژیان بن .. بەڵکو رائەپەڕن و گەردی بارو دۆخی زەمانە لە خۆیان ئەتەکێنن.
(2) برینی دەوران : زام و برینی دەستی چەرخ و رۆژگار ، کە هەردەمە رووی لە لایەکە.
- گردی سەیوان: گۆڕستانە هەرە بەناوبانگەکەی شاری سولەیمانییە کە زۆربەی هەرەزۆری زاناو ئەدیب و کەڵەپیاوە گەورەو بەناوبانگەکانی شاری سولەیمانی لە باوەشی ئارامی گرتووە ، ئەم گۆڕستانە بە دار ئەرخەوانی بەرزو هەڵچوو بەئاسماندا ئەنراوە گردو گۆڕستانی سەیوان لای هەموو کوردێك بەرێزو پیرۆزە.

# شێخ مەحمودی زیندوو(*)

١٩٥٦

پـــایز ... خـــەزانی تـــەماوی و مەنگـــە
گەڵا و لـق و پـۆپ، خونـچە بـە ژەنگـە!... (١)

ئاسمـــــان نەشـــینە نـــە پیرۆزەیـــی
نەشـــەو جریـــوەی ئەســـتێرەی شـــەنگە(٢)

نـــە ســروەی شـــەماڵ نـــە ســەدای مەلـــە
چـــاوە وشـــك و رەش بـــەبێ ئاهەنگـــە(٣)

رۆژ كـــــە رووناكیـــــدەری سروشـــــتە
تـــەرازووی تیـــشكی نـــەوی و لاســـەنگە(٤)

---

(*) بە بۆنەی كۆچی دوایی (شێخ مەحموود)ە وە وتراوە.

شێخ مەحموودی زینـدوو: مەبەست لەوەیـە : هـەرگیزاو هـەرگیز كرداری جـوامێری و دڵسۆزی و كوردپەروەرانەی شێخ مەحموود لەدڵدا زیندووەو ناوی كوێر نابێتەوە.

(1) گەڵا و لق و پۆپ ، خونچە بە ژەنگە : لە دواتەمەنی وەرزی پاییزدا كە سەرما لە گەڵاو گوڵ ئەدات لە بریتی زەرد بوون ، سوور هەڵئەگەڕێ

(2) شەنگە : جوانە ، شۆخ.

(3) سەدای مەلە : دەنگی خوێندنی مەل ، ئاوازی مەل و باڵندە.

(4) نەوی و لاسەنگە:

نەوی : نزمە.

لا سەنگە : لار ترە ، خوار بووتەوە ، تایەكی بەرز و تایەكی نزمە

تـــەلی تـــار خـــاوە بـــێ ســـۆز و ســـازە
شمـشاڵ لەگـەڵ فـوو بـە شـۆڕ و جەنگـە[١]

ئەگـــەر پێکـــەنین ببـــێ بـــە خەنجـــەر
لای گـوڵ خەنـدەران شـەق بـردن ئەنگـە[٢]

پۆلـــە چـــۆلەکەی مـــۆڵی ئێـــواران
کـــڕ وکـــش و مـــات وڕ و بێدەنگـــە[٣]

سەرچـــنار رەشـــە رەشـــتر ئاسمـــانی
پرچـــی ژاکـــاوە چـــڕە زەبەنگـــە[٤]

---

(1) شمشاڵ لەگەڵ فوو بە شۆڕ و جەنگە:
شۆڕ و جەنگ : شەڕو شۆڕ ، پشێوی و ئاژاوە ، سەرجەم مەبەستی دێڕەکە ئەوەیە کە ئاوازی شمشاڵ هەمیشە خۆشی چێژ بە هەستی مرۆڤ ئەبەخشی کەچی ئێستا پێچەوانە بۆتەوە.
(2) ئەنگ : عەیب و عار ، شورەیی
لەم دێڕەدا مەبەست لەوەیە کە گوڵ خەندەران یان لای ئێمە بە گوڵە (لفکەشامی) مەشهوورە کە بەرامبەری بوەستی بدەیتە قاقای پێکەنین گوایە ئەو گوڵە لە داخا شەق ئەبات و لێك ئەبێتەوە هەندێ ئەڵێن : گوایە گوڵەکە لە داخا وا ناکا بەڵکو هاوبەشی پێکەنینی بەرامبەرەکەی ئەکات و دەم ئەکاتەوە.
لێرەدا ئەوەتا تەنانەت گوڵ خەندەران کە هەمیشە دەم بە پێکەنینە ئەویش لە تاو شینی شێخ مەحموود پێکەنین و دەم کردنەوەی لا شورەیی و ئەنگە
(3) مۆڵە : بەسەر یەکدا کۆ ئەبنەوە .. کۆمەڵ بوون.
- کڕ و کش و مات : خامۆش و بێدەنگ
- وڕە : کاسە ، گێژە
(4) سەرچنار : هاوینەهەوارێکی جوان و دڵگیرەو دەستی سروشت رازاندویەتیەوە، نزیکەی سێ کیلۆمەتر لەشاری سولەیمانی یەوە دوورە و کەوتۆتە رۆژ ئاوایەوە

بولبـــول بــێ ئـــارام بـــەبێ ســـزەوتە
دونیـــای فـــراوان لای گـــۆڕی تەنگـــە!..

خـــاڵ خـــاڵی لوتکـــەی شـــیرین و هـــەڵگورد
لەگـــەڵ فرمێـــسکا تـــوزاوەی پەنگـــە[1]

پـــشتکۆ تـــەمی نـــارد بـــۆ ئـــارارات
هـــەناوی ئـــەزمڕ بـــە کـــاژا و بەنگـــە[2]

بـــەڵام کوردســـتان بـــا لـــە شـــینا بـــێ
گـــوێ هـــەڵخراوی ئـــاوازی زەنگـــە[3]

کـــورد بـــا ســـەراپا ماتـــەم دا بگـــرێ
جـــۆش و خرۆشـــی وەك پـــووره هەنگـــە[4]!..

---

(1) لوتکەی شیرین و هەلگورد : مەبەست لە لوتکەی شاخی شیرین و لوتکەی شاخی حەساڕۆستە.
ـ پەنگە : قەتیس ، یان راوەستاوە پەنگی خواردۆتەوە ، وەستاوە
(2) پشتکۆ : شاخی پشتکۆ نزیك دەماوەند ، نزیك شاری کرماشان.
– ئارارات : زنجیرە چیایەکە کەوتۆنە کوردستانی تورکیاوە.
– ئەزمڕ : زنجیرە چیای ئەزمڕ کەوتۆتە باکوری شاری سولەیمانییەوە.
– کاژاو : مەبەست لە چیای کوڕە کاژاوە لە نزیك بەرزنجەی سەر بە شاری سولەیمانی
(3) بەڵام کوردستان با لە شینا بێ: واتە بەهۆی کۆچی دوایی شێخ مەحمودەوە هەرچەندە کوردستان شین و ماتەو پرسەیەتی بەڵام چاوەڕوانی جەنگی هۆشیار بوونەوەیە
(4) سەراپا : سەرجەم ، گشتی ، هەمووی ، کۆیی.

ســـيا كـــەژ ســـيا ، ســـيا كێوانـــە
ســـيا بـــەرگ ديـــارە هـــەر هەورامانـــە[1]

لـــەكێ بپرســـين ســـۆراخى راســـتى
ديـــارە نـــزيكتر هـــەر بەرانانـــە[2]

بـــەرانان دەخيـــل دراوســـێى دڵـــسۆز
ئێـــستا ئـــەو پـــەڕت كێـــى لا ميوانـــە[3]..؟

هـــەواڵێ پرســـە لـــە دارى كـــەلى
شـــێخ لـــەوێ مـــاوە يـــا لـــە ســـەيوانە ..؟؟[4]

---

(1) سيا بەرگ : بەرگى رەشپۆش نيشانەى پرسەو ماتەمە.
- هەورامان : ناوچەى هەورامان سەر بە شارى سولەيمانييە جێ داڵدەى شێخ مەحموود بوو بە تايبەت لە ساتى تەنگانەدا.
(2) سۆراخى راستى : شوێن پێ هەڵگرتنى راستى ، يا تەعقيبى راستى كردن ، مەبەست لە هەواڵى پرسينى وەفاتى شێخ مەحمودە.
- بەرانان : زنجيرە چياپەكە و لە باشوورى شارى سولەيمانيدا راكشاوە و بەسەر شارەكەدا ئەڕوانێ و گەلێ گوندى خنجيلانە و جوان لەقەد پاڵەكانيەتى، كە مەڵبەندى حەوانەوەى شێخ مەحموود بوون، يەكێ لەو گوندانەش گوندى (دارى كەلى) يە.
(3) دەخيل : هاوار و داد، زاراوەيە كە بۆ پەنا بردن و داڵدە بەكاردێت.
(4) دارى كەلى : گوندێكە كەوتۆتە رۆژئاواى شارى سولەيمانييەوە و مەڵبەندو جێنشينى دوا تەمەنى ژيانى شێخ مەحموود بوو.

ئێستە سێبەری سەر جەستەی كفنی
هەتاوی سووره یا ئەرخەوانە؟

ئێستە پێخەفی نەرم و نۆڵی شەو
بەردە یا خاكی كانی ئاسكانە؟[1]

بەردە قارەمان لە جێی خۆی ماوە
هەر لە دەربەندە یا لە پیرانە؟[2]

ئێستە ئاوباریك وەك بوومەلەرزە
هەرهەڵئەلەرزێ یا لە وەستانە..؟[3]

---

(1) كانی ئاسكان : گەرەكێكی كۆن و بەناوبانگی شاری سولەیمانی یە.

(2) بەردە قارەمان : تاوێرە بەردێكی گەورەیە و كەوتۆتە گەروی دەربەندی بازیانەوە و لەسەردەمی راپەرینەكانی شێخ مەحموودا شێخ قارەمانێتیەكی بە جەرگی تیا نواندوەو هەر لەوێشدا بریندار كراو بە دەستی نۆكەرانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی بەدیل گیرا.

– دەربەند : دەربەندی بازیان، كەوتۆتە نێوان شەقامی سەرەكی كەركوك و سولەیمانی.

– پیران : مەبەست لەو گوندەیە كە بەرامبەر كانی خەیار نزیك دزلێ مەریوان ، دوا شوێن و مەڵبەندی شێخ بوو، دوای ئەوەی دەست بەسەر كرا بۆ ناصریە.

(3) ئاوباریك: گوندێكە لە گەرمیان، نزیك ناوچەی مەملەحەی لای كفرییەوە، شێخ مەحموود لەو گوندەیا شەڕێكی بە ناوبانگی دژی رژێمی كۆنەپەرستی پاشایەتی عێراق كرد.

کـوا شـێخ ؟ کـوا نـەوەی ئەحمـەدی کـاکی
کـــوا نەبەردەکـــەی ئـــەم نیـــشتمانە ؟[1]

بــــەرانان دیــــارە قورگـــــت گــــیراوە
چـــاوت لێخنـــی خـــوڕی گریانــــە

ســـــەرت چـــەپۆکی کۆچـــی بێـــوادەی
شـــێخ خـــوڵی داوە ســـــتی فغانـــــە

بــــەڵام .. بــــەرانان گـــوێم لێڕاگـــــرە
مـــن کـــوردم کـــوردیش گەلـــە ، ئینـــسانە

هـــــەزار ئەوەنـــــدە بخرێتـــــە بینـــــی
دەســـــتی گـــەردوون و چـــنگی زەمانـــە

کـورد شـۆڕە سـواری وەك شـێخی بـوو بـێ
ســــەر نـــەوی ناکــــا لـــەبۆ بێگانـــە

پـــایز .. خـــــەزانی تاریـــــك و تاڵـــــە
یـــا فـــڕەی قەلـــە یـــا هاشـــەی داڵـــە

(1) نەوەی ئەحمەدی کاکی : مەبەست شێخ مەحموودە کە لە نەوەی کاك ئەحمەدی شێخە.

ترۆفتـــەی (دەوران) تیـــژ و بەباڵـــە
بەســـەر (شـــەهێنی) کوردانـــا زاڵـــە[1]

ســـەروو دەمێکـــە بـــاخی هیوامـــان
گۆپکـــەی درەختـــی هـــەر کـــرچ و کاڵـــە

ڕێگـەی بـەر دەممـان ماوەیـێ تەختـە ..!
ئەوەنـــدەت زانـــی پـــڕ چـــۆڵ و چـــاڵە

شـــەو ئاســـوودەنین ، ڕۆژیـــشمان درێـــژ
بـــەخت ســـەرنگوون ماڵمـــان نـــا حاڵـــە[2]

هێـــشتا برینـــی تیمـــار نـــاکرێ
کەچـــی (شـــەبەقێ) هـــاوار بـــەم حاڵـــە

بەراســـتی چـــەرخ بـــێ بەزەییانـــە
بـــەم گـــەلی کـــوردە بـــاش ئـــەکا گاڵـــە[3]

---

(1) ) ترۆفتـەی دەوران : ترۆفتـەی دەوران ... باڵندەیـەکی ڕاوکـەرە وەك بـازێکی بچووك وایە مەبەست لە ترۆفتەی دەوران ، بازی ڕاوکەری چەرخ و سەردەم.

– دەوران : چەرخ و زەمانە ، ڕۆژگار.

– شەهێن: باڵندەیەکی گۆشتخۆری ئازایەو زۆربەی مەلەکان لێی ئەسڵەمنەوە.

(2) سەرنگون : سەرە و خوار ، سەرەو ژێر.

– حاڵمان ناحاڵە : ژیانمان نالەبار و پەشێو و ناخۆشە.

(3) ئەکا گاڵە : حەشری پێ ئەکا، گاڵتەی پێ ئەکا.

بەلام ئەی پایز ئەی گەلاڕێزان
تۆش گوڵی ئاڵی سەرداری ژاڵە
شێخ .. با ماڵئاوا لە کوردستان کا
ئەم خاك و خەڵکە بخاتە ناڵە

ئێستە کوردستان ئامانج و سەودای
لە بۆتەی سەختی دوا ڕۆژا قاڵە

پایز ئاخری گەلاڕێزانت
ورووژمی تیژو توندی خەزانت

گزەی بای ساردی دەمەو بەیانت
گەردەلوولی رەش سەر لوتکەکانت

ئالایە گەردن سەرۆکی ناشاد
کردی بە نێچیر مەرگی دەورانت

کەوا بوو (سەرۆك) مەحموودی کوردان
سووك لێکی بنێ پێڵووی چاوانت

بنـــوو لـــەباوەش دایکـــی دڵـــسۆزا[1]
بـــۆی هەڵبڕێـــژە دەردو هیجرانـــــت

لەگـــەڵ یـــەکتری بکەوتـــە گوفتـــار
ئـــەو بـــە ئیـــشارەت تـــۆ بـــەزمانت

بـــۆی بگێـــڕەوە رەنجـــووری کـــوردان
پیـــشانی بـــدە برینـــی گیانـــت[2]

بنـــو نووســـتنی دوای هیلاکـــی رێ
پرخـــەت بگاتـــە گـــشت کوردســـتانت

ئـــەو رێیـــەی کـــە تـــۆ گرتـــت لـــە ژینـــا
ئێـــستەش بـــەجێت هێـــشت بـــۆ رۆڵـــەکانت!

---

(1) بنوو لە باوەشی دایکی دڵسۆزا : مەبەست لە کۆچی دوایی شێخ مەحموودە و ئەسلیم کردنیەتی بە خاکی پیرۆزی کوردستان.

(2) بۆی بگێڕەوە رەنجوری کوردان :

رەنجوری : بیماری ، نەخۆش و دەردەداری.

لێرەدا مەبەست لە ئازار و ژانی ژیانی مرۆڤی کوردە .

– پیشانی بدە برینی گیانت : مەبەست لە برینی گیانت ئەوەیە. کە شێخ مەحموود دوو جار بەدەستی نۆکەرانی بێگانەو دوژمنی کورد بریندار کرا ، جارێک لەبن بەردە قارەمانی لای دەربەندی بازیان و جارێکیش لەو ساتەدا تەرمی پیرۆزی کە هێنرایەوە سولەیمانی لەلایەن کاربەدەستانی رژێمی کۆنەپەرستی پاشایەتییەوە گوللە باران کرا.

کوردستان .. بگرە چەپکە نێرگسێ
سووک دایبهێڵەو بیخە گوڵدانت

با .. بۆنی خۆشی هەتا هەتایە
ببێ بە مایەی شەوکەت و شانت

با هەنگی لاوی نیشتمان پەروەر
ئەو بۆنە ببا بۆ بەردەکانت

لێی دروست بکا شانەی هەنگوینی
مەبەست و بڕوا و جۆش فەرمانت

***

# تەپڵ

١٩٥٧

کام گێژە کەوتوومە ناوی؟
بۆ کام گێژە مەلەی سستم[١]

پەلەی باڵی لەگۆ کەوتووم
کام چڵە کەوتۆتە مستم؟[٢]

بۆچی بوو هەڵپەی جارانم
بۆ کوێ بوو .. بازرەقەی بەستم؟[٣]

بۆ کام ریسی بە خوری بووم
هەڵم تەکان شان و باڵم؟[٤]

---

(1) گێژ : بەواتای گێژەڵوکەو گەردەلوول دێت ، هەروەها بەواتای گێژی ئاویش دێت که لەپڕ هەر کەسێکی لێی نزیك بێتەوە لوولی ئەداو هەڵی ئەلووشێ.

(2) لەگۆ کەوتوو : هێز و توانای تیا نەماوە.

(3) بازرەقە: زاراوەی بازرەقە لەو واتایەوە هاتووە کاتێ خوێن لە مرۆڤێ ئەڕژێ دێراوی خوێن دروست ئەکات.

(4) بۆ کام ریسی بە خوری بوو: لە کوردیدا ئەوترێ ریسەکەم بۆتەوە بە خوری، واتە ئەوەی چنیومە، خاوبۆتەوە و هەڵوەشاوەتەوە.

– هەڵمتەکان شان و باڵم : شان و باڵم هەڵتەکان و جوڵانەوە.

بــۆ كــام نيــوەڕۆی ڕوونــاك بــوو
بێــــداری شـــــەوگاری تـــــاڵم؟

یــا بــۆ كــام هــەنگاوی دوور بــوو
تــــەوژمی ئــــاواتی كــــاڵم ...؟

وام پـــێ ئـــەڵێ ... وای ئـــەژەنێ!
تـــەپڵی ئـــەو تەشـــیەی رســـتم ..! [1]

خـــڕ بیژەنـــە دونیـــا كـپـــە
مــــاوە تـــــەخت و فراوانــــــە

بـــشیرێنە نـــەك بـــە چـــپە
كوتـــەك بــۆ ســەری تاوانـــە ..! [2]

تـــاوانم كـــرد نـــرا پێمـــا
مـــۆری ئـــەو جووتـــە چـاوانە ...!

هـــەر چـــیم هەیـــە لـــێم وەرگـــرە
لەشـم .. نـاوم .. جووڵـەم .. تینـم.. .!

---

(1) وای ئەژەنێ : وای با ئەدا ، مەبەست لە سووڕ و خولدانە.

(2) بشیرێنە : قیژاندن ، بەدەنگی هاوار كردن

بیگـــــــرووو پێـــــــستی ئەنـــــــدامم
بیکـــــە بـــــە بەیـــــداخی ژیـــــنم! (1)

بەرەڵڵایکـــــــە ، هـــــــەوری تـــــوانج
بـــۆ ئەســـــتێرەی بـــەختی شـــینم ..!

بـــــەڵام .. شـــــتێ لـــــە مۆخمایـــــە
(ئوتـــــــــــوم) نایهێنێتـــــــــــە دەرێ

هـــــــیچ دەســـــــەڵاتێ ناتوانـــــــێ
پـــــەناو زەفـــــەری پێبـــــەرێ ..! (2)

ئـــــەزانی چـــــی؟ ئـــــەمن کـــــوردم
گـــــەڵای کوردانـــــــەم نـــــاوەرێ ..!

دە بیژەنـــــــە ... دونیـــــــا کپـــــــە
دڵ لـــــە تـــــۆوی ئارامـــــا (خپـــــە) (3)

***

---

(1) بیگروو پێستی ئەندامم: گرووو: داماڵین و لێکردنەوە، پێستی لەشم لێبکەردوە.

– دڵ لە تۆوی ئاراما (خپە) : واتە دڵ لە تۆوی ئارام و هێمنیدا بێدەنگەو لە لێدان کەوتووە و وەستاوە.

(2) زەفەری پێبەرێ: پەی پێ بەرێ پێی بوێرێ دەستەڵاتی بەسەریا بشکێ

(3) دونیا کپە : دنیا خامۆش و بێدەنگە.

# دیسانەوە نەورۆز

-١٩٥٧-

دیسانەوە نەورۆزە بەهارە گوڵی ئاڵە
شەونم بە قەتیسی لەسەر ئەو نێرگسە کاڵە
وەك چاوە چی چاوێ کە بە فرمێسك و کەژاڵە

بۆ تازە بەهارێ
بۆ گەشتی کەنارێ

هەرچەندە چرۆ و چووزەرەی باغی شنەو شۆ
پڕنازە بە ئاوازە لەگەڵ شوویی ئاسۆ[1]
بێسوودە ئەگەر هارە نەکا بەستەڵەکی کۆ

(1) - چووزەرەی باغ : گۆپکەو چڵی درەختی باغ
- شنەو شۆ : شەوق و شەفاف یان بە واتای بە کەیف دێت، دیارە گەڵای لق و پۆپی سەرچڵەکانی سەوز و تەڕ بێت و شنەی با بیلەرێنێتەوەو، پێی ئەوترێ: ئەو درەختە لە هەوا و ئارەزوو و شەوقی خۆیایەتی.

بۆ هـاژەیـی چـاوە

بۆ جۆششی کاوە..![1]

زسـتان دەبـڕۆ پـەردەیی (تـۆف) لادە لـە چـاوم

مـن خـۆم بەگـەڵ وەیـشوومەوە تێـوە گـلاوم[2]

ڕێ چۆڵکە لەبۆ مێرگی وەکو ئەخشەری خـاووم[3]

بابێتـە گـەشەو گوڵ

بۆ بولبولی سـەرچـڵ

گـوێم لێیـە نزیـك دەنگـی نـەی و پـۆلی مەلانـە

دڵ ڕانەچـەنێ بـەزم و سـەمای دەس لەملانـە

شـادی گـەلی کـوردی نەبـەزی دۆسـتی گەلانـە

---

(1) ـ هاڕە : کە شوشە یان قاڵبە سەهۆڵ ئەشکێ و ئەکەوێتە خوارێ : ئەڵێن هـاڕەی کرد.

– بەستەڵەکی کۆ : مەبەست سەهۆڵ بەندانی سەر چیای سەختە.

– جۆششی کاوە : واتە بـۆ جـۆش و خـرۆش و دەرون کـوڵانی کـاوە ... گـەڵ جـار بـە واتای سەر گەرم و دڵ خرۆشاو دێت.

(2) تۆف : سـەرما و سـۆڵەیەکی سـەختی بارانـاوی واتـە بایـەکی سـارد بـەدەم بـاران بارینەوە.

– وەیشوومە : بە واتای کارەساتی سەختی سروشتی دێت

– تێوەگلاوم : تووش بووم ، دووچاری ئەو کارە بووم .

(3) ئەخشەری خاوم : ئەخشەر : گیایەکە لە کوێستانە سەخت و ساردەکان ئـەڕوێ و ناسك و بۆن خۆشە ، ئەخشەری خاو : بۆ زوڵفی خاو بەکارهاتووە.

شەڕ دوژمنی وانـــــە
ئاسایشە گیانـــــە ! !

ئەی گەل .. ئەو شەڕخوا هەر خەریکە بە دەس و برد
خاك و شەرەف و ڕۆڵەیی مـەردی نەتـەوەی کـورد
بیکـا بـە خـەڵوزیش و ببێتـە سـوپەر و پـرد[1]

بۆ ویســـتنی دوژمن
بۆ هێرشـــی مردن .. !

تۆش ... بەسیە ئیتر دوو دڵـی و تـرس و بەهانـە
ئـەمجارە لـە ناوچـوون و بـە ملێونـە نەمانـە
ئاسایـــشە ڕێـــی ڕزگـــاری و بـــاخی ژیانـــە

بۆ دەنگی بە ســۆزێ
بۆ گشت گەل و هۆزێ

***

(1) سوپەر: قەڵغانی هەرشتێ بەرگری خۆپاراستنی پێبکرێ، پێی ئەوترێ سوپەر.

# مامه کوڕنوو(*)

-١٩٥٧-

مامـــه کوڕنـــوو، ڕاکـــشاوی گردەکـــەی ســـەیوانەکەم
سەر ڕەحەت ، دڵ بێگرێ ، گوێ شلکە بۆ داستانەکەم(١)
سـەیرە ، بەزمـە ، هەڵپەڕینـە ، پـڕ لـە قاقـاو پێکەنینـە
نەعرەتەی گوێ کەڕ ئەکا ، جۆش و کوڵی سەیرانەکەم(٢)

---

(*) ئەحەی کوڕنو : ناوی ئەحمەدی کوڕنوە ، لە زەمانی کاك ئەحمـەدی شـێخا(نـۆکی کولانووە ، لەبەر ئەوەی پیاوێکی خۆش مەشرەب و قسە خۆش و حـەرەکاتی سـەیر و سەمەرەی کردوە و بۆتە هۆی بەزم و پێکەنین و خۆشی کـاك ئەحمـەد بردوویـەتی بۆ حەج ، پیاوێکی عاقڵ و هۆشمەند بووە ... گاڵتەی بەناهەمواری زەمانە هاتووە . ئەحمەدی کوڕنو : خەڵکی شاری سولەیمانیە و هەر لە شـاری سـولەیمانیش کۆچـی دوایی کردوە.

(1) سەر ڕەحەت: مێشك هێمنە و بەهیچ کارێکی ناڕەواوە خەریك و ماندوو نییە.

- دڵ بێگرێ : دڵ و دەروون هیچ گیر و گرفتێکی تیا نییە.

- گوێ شلکە : گوێ بگرە ، ببیستە .

(2) نەعرەتە : بۆ دەنگ و هاوارێکی بەرز و بەهێز بـەکاردێت وەك ئـەڵێن : نەعرەتـەی شێر یا نەڕەی شێر.

ئەرخـەوان سـووره ، بـەهاره ، گولـشەنه ، رازاوەیـە
دەشت و کۆ رەنگین و پڕ شـۆیه وەنەوشـەی یانەکـەم[1]
خەرمـەنی لالـە لـە کۆهـساران و پێدەشـت و نـشێو
سـوور تـره لـەو خوێنـە بـاریوەی کـوڵی گریانەکـەم[2]

دلبـەران سـرك و بـەتاز و رەوتـی نـەرم و ئیـستەکە
سەد توانج ئەگرێتە ئاهووی دەشـتەکەی شـێروانەکەم[3]
هـەڵبڕه چـاوی نومـایش تێـر سـەرنجی وورد بـدە
وەك بەجێت هێشت وا نـەماوە شـارەکەی جارانەکـەم[4]

(1) دەشت و کۆ : دەشت و چیا.
- پڕ شۆیه : تەڕ و تووشه.
- یانەکەم :خانەکەم ، خانوەکەم
(2) کۆهساران : شاخ و کێوەکان
(3) سرك : رانەهاتووه ، دەستەمۆ نەبوون.
- رەوتی: رۆیشتنی.
- ئێستەکەی : وەستانێکی ساتەوەختی.
- ئاهووی : ئاسکی ، مامزی.
- دەشتەکەی شێروانەکەم : مەبەست لە دەشتی گەرمیانە و کەوتۆتە نێوان قەڵای شێروانەی لای دەربەندی خان و کفری و کەلار.
(4) چاوی نومایش : چاوی بینایی و تەماشا کردن .
– شارەکەی جارانەکەم : مەبەست لەشاری سولەیمانی نازدار و پیرۆزە..

ئەو بەهارەی تۆ بەجێت هێشت پڕ برینی تازە بوو
پڕ لە ئافاتی لەپڕ بوو بۆ گوڵی ئینجانەکەم[1]
ئەو گوڵەی ئاواتی کوردبوو بێتە پشکوتن دەمێ
رابوەشێنێ بای شەماڵی نەرمی کوردستانەکەم[2]

ئەو کەسەی دەستی ئەنایە بین و قورگی ئەو گوڵە
چنگی خوێناوی ئەنایە ناو دڵە پڕ ژانەکەم
ئێمە ئارەق رشتن و بازوو وەشاندن ، بێخەوی
ئەو گڕ و پشکۆی ئەخستە ژێر بنی خەرمانەکەم[3]

ئێستە وا خۆی دائەنێ بۆتە فریشتەی ئاسمان
بۆتە دوکتۆر و برینپێچی برینی گیانەکەم
مامە کوڕنوو چی بڵێم زیاتر لەوەی (خالص) ئەڵێ:
(فێست و رێوی و مێزەر و مەیموونە سەیری بانەکەم[4]
وەك وتم : سەیرە لە بانە.. یا وەکو نالی ئەڵێ :
زیندەگیم تاڵە کە زەلکاو بێتیمارە خانەکەم ..!

*****

---

(1) پڕ لە ئافاتی لەپڕ بوو : واتە پڕ بوو لە زیان بەخشین و کاری ترسناکی کت و پڕ .. زۆر جار ئەوترێ: ئەم لافاوە بێ ئافات، بێ واتە، بێ زیان و بێ ترس بێت ، بێوەی بێ.

(2) بێتە پشکوتن دەمێ:
دەمێ: واتە بۆ ساتێك بپشکوێ

(3) بێخەوی : بێداری ، بە خەبەر ، لێرەدا بەواتای ئێشك گرتن دێت

(4) خالص : نازناوی شیعری شاعیر.

# هاوڕێــم حــەســەن

-١٩٥٧-

ئەی کۆچی پڕ لە ناڵەسۆز بۆ گەرووی شمشاڵە
هەڵڕێـــــژی هەنـــــسکی قـــــووڵ
بـــــەرد بێنێتـــــە جـــــم و جـــــووڵ
داری گریـــــان بنێـــــژێ ..!
ڕەشـــــی بەشـــــار بپۆشـــــێ
بـــــۆ (حەســـــەن) بێتـــــە جووڵـــــە
بـــــۆ ئـــــەو هەنـــــسکە قووڵـــــە
ئـــــەی کۆچـــــی پـــــڕ لـــــە ناڵـــــە
ســـــۆز بـــــۆ گـــــەرووی شمـــــشاڵە
کـــــە بـــــەرد بێنێتـــــە دوان
یـــــا بـــــە ئەســـــرین یـــــا گریـــــان
بپرســـــێ ســـــۆراخی ئـــــەو
لـــــە ئەســـــتێرەی نیوەشـــــەو

سۆراخی ئەو نازدارە
ئەو لاوە بریندارە
کەی ئەگاتە ئەم شارە
ئەم خاکە مەینەت بارە ..!؟
کێ راسپێرین بەپەلە
کام باڵدارە ، کام مەلە ..؟
یا کام پۆلە مەلی ناو
ئاسمانی شینی هەساو[1]
یا کام پەڵە هەوری دوور
کە با ئەیبا سەرەوژوور
یا با ئەیان تارێنێ
بۆ ئەم لاولای ئەفرێنێ[2]
باسێکی (حەسەن) دێنێ
هەست لە مشتمان ئەفرێنێ
تەزوو ئەدا بە ناخمان
بە جگەری پڕ لە داخمان ..!
ئەی کۆچی توون و تاریک

(1) هەساو : سایەقە ، ئاسمانێکی شین و ساماڵ..

(2) ئەیان تەرێنێ: ئەم زاراوەیە بۆ مەلێك بەکار ئەهێنرێ کە لەلانەکەی خۆی دوور کەوێتەوە دوایی نەیدۆزێتەوە..

بڕەندەی قەدەی باریك
حەسەن .. هێجگار شیرین بوو
هاوڕێی وەنەوشەی شین بوو ..!
هەودای ڕۆشنایی ژین بوو[1]
خۆشەویستی نەسرین بوو ..!
بیر و بڕوای ڕووناك بوو
دەروون بێ گرێ و پاك بوو
هەستی پڕ بوو لە جوانی
لە یادی نیشتمانی
هەرچەن لە وڵات دوور بوو
بۆ وڵات گڕی سوور بوو
ئەسووتا بۆ ڕووناکی
بۆ کوردستان ، بۆ خاکی ..!
بۆ نەتەوەی هەژاری
جەستەی پڕ لە ئازاری ..! [2]
ئەی کۆچی پڕ لە ناڵە

---

(1)هەودای ڕۆشنایی : بە واتای تاڵە دەزولەی تیشکی ڕۆشنایی دێت..

(2)جەستە : لەش ، بەدەنی مرۆڤ.

ســــۆز بـــــۆ گـــــەرووی شمـــــشاڵە
کـــــە گـــــڕ بـــــە شـــــیوەن خۆشـــــکا
بـــــاڵا بەخـــــــەڵك رەشـــــکا
هــــــەوری خەفـــــــەت بهێنـــــــێ
تـــــۆوی مەینـــــــەت بـــــچێنێ ..!
دەسمـــــان پـــــێ باتـــــە خامـــــە
کـــــام دێـــــڕ بـــــەدەردو زامـــــە
بنووســـــین بـــــۆ حەســـــەنمان
بـــــۆ لەناوچـــــووی وەتـــــەنمان
بـــــۆ گوڵـــــێ کـــــەم تەمـــــەن بـــــوو
وەك ژینـــــی یاســـــەمەن بـــــوو. [1]

***

(1) وەك ژینی یاسەمەن بوو : حەسەنی جوانەمەرگ وەك گوڵێکی تەمەن کورت وا بوو ، ژیانیشی بە شێوەی گوڵی یاسەمەن بوو هەم لە کورتی تەمەن و هەم لە رووی ژیانی پڕ لە شکۆ و بێگەردییەوە. .

# شەبەق

-١٩٥٧-

شـــەبەق رەنگەكـــەی ســـوور و خوێنینـــە
مـــوژدەی روونـــاكی رۆژگـــاری ژینـــە[1]

بـــۆ لەشـــی كـــش و مـــاتی بـــێ دەنگـــی
(دەرزی) جوولەیـــــەو ئـــــاگری تینـــــە[2]

بـــۆ جەســـتەی كفتـــی ئـــازاری مەینـــەت
مەرهـــەمی شـــەوق و دەرمـــانی بینـــە[3]

بـــۆ دنیـــای (تـــاری) دەســـتەئەژنۆیی
بـــووكی مـــرادی ســـوار بـــووی زینـــە ..![4]

---

(1) شەبەق : بەری بەیان ، كە رووناكی خۆر شەق بە تاریكی شەو ئەدا ، بەری بەیان هەمیشە ، رووناكی پەخش ئەكا ... مەگەر كاتێ خۆر هەڵدێ تیشكی ئەو خۆرە ئاڵتوونیە گزنگەكەی پەخش ئەكا... شاعیر وێنەیەكی جوانی شیعری نەخشاندووە..

(2) لەشی كش و مات : ساتێ مرۆڤ خەوی لێ ئەكەوێت و ئەنووێ ، لەشی كش و مات ئەبێ و لە جووڵە ئەكەوێت .

(3)جەستەی كفتی: لەشی ماندوو و شەكەتی.. ساتێ مرۆڤ هیلاك ئەبێ، ئەوترێ كفتە .

(4) بووكی مراد : بووكی ئاواتەخواز ... كە مرۆڤ عەشق و شەیدای شتێ ئەبێ و پێی ئەگات ئەڵێن : ئاواتی هاتەدی. .

بـــۆ گیـــانی تـــاڵ و درێـــژی شـــەوگار
شـــەکری هیـــوا و شـــانەی هەنگوینـــە

بـــۆ خانـــەی پەســـت و قـــوولّی مـــەلوولی
چـــەپکی گـــولّێکی بـــە پێکەنینـــە

بـــۆ چـــاوی قـــورس و خـــەواڵوی ســـستی
بروســـــکەی تیـــژی راچـــڵەکینە ..! [1]

شـــەبەق بـــۆ دڵـــی رەشـــی تـــاریکی
تیرێکـــی تیـــژ و ســـەخت و ژەهرینـــە

بـــۆ گیـــانی قـــورس و خوێنـــاوی ســـتەم
تیغـــی دوودەمـــی مـــشت ئاســـنینە

دە ئـــەی شـــەبەقی شـــادمانی کـــورد
هـــەڵبێ ... کوردســـتان چـــاوەڕێی تینـــە
*****

(1) ڕاچڵەکێنە : مرۆڤ کە لە خەو هەڵئەسێنرێ ، بەتایبەت بە دەنگی بەرز بانگ کرێ یا ڕاوەشێنرێ لەو ساتەدا بەو ڕاپەڕیە ئەوترێ ڕاچڵەکان .

# بەستەی دڵ[1]

بـــۆم بخوێنــــە، ئــەی بولبــولی ئــاوارە
بەستەی دڵی، سەرمەست و گەشکەدارە
بەســتەی دڵــی، پڕهەســت و پــڕ تریقــە
مەســـتی کــاتی، لەهاوینـــدا بـــەهارە
بەستەی کاتی چیمەن بەفـەڕ بەشـەوقە
ئاسمــان بــووك و ئاوێنەکــەی نــزارە.
مەســتی کــاتی، شــادی ئــاڵ و رازاوە
(گــور) کــراوەی هەڵلووشــینی ئــازارە
مەستی کاتی، چرۆی نیازی چەند ساڵە
ئێستە گوڵە و ئەو خۆی خاوەن گوفتارە
مەستی کـاتی، بـرین دەمـە و ئەجۆشـێ
نــەك بــۆ تۆڵــە، بــۆ کــرداری بــێ دارە
بـرین دەمــە و دەمـیش پــڕ لــە هــاوارە
ئــەڵێ ئــەمڕۆ گــەل کارەکــەی بــەردارە
قوربانـــت بم، ســـەرکەوتن زۆر گرنگـــە
گـــرنگتر لـــەو، (پاراســـتنی) دژوارە
با توولـەمار لـەژێر پێـدا هـەپروون بـێ
بـەرلام لەوبـەر زیتـەی چـاوی رەشمـارە

(1) ئــەم شــیعرە لــە رۆژنامــەی ژیــن وەرگیراوە،کــە لــە ژمــارە (١٤٠٤)ی ریکــەوتی ١٩٥٨/٨/١٤ بلاوکراوەتەوە.

زیتــــەی چـــاو و تیــــژکردنی ددانــــە
کلکەلـەقێ و مـڕەی مـام ئیـستیعمارە
بـۆم بخوێنـە ئـەی بولبـولی ئـاوارە
بەستەی دڵی سەرمەست و گەشکەدارە
بەستەیەك بێ پشوویەك با بەجەستە
بـە هـەر لەشـێ برینـدار و زامـارە
بیـدا بەگـەل، بـەخاك و نیـشتمانی
بەکوردستان بەم مەرزە خۆش گەوارە
بەستەیەك بێ گوێ پڕ بکا لە ورشە
بڵـێ شـادی لـەجێی نـووکی جـەخارە
بڵـێ لـەجێی پـەت و داری قـەنارە
وا ناشـتنی چـنار و دار هـەنارە
بڵێ لەجێی دەردی سەری و بێ کاری
مێرگـی ئـێش و هەڵبەسـتی روپـارە
بڵـێ لـەجێی چەرمەسـەری و بێـزاری
شـادومانی و کامـەرانی رێبـوارە
بڵـێ لـەجێی بـێ بڕوایـی و نـاکۆکی
کاروانەکـەی یەکگرتنـە قـەتارە
بەستەیەك بێ ئەم خەڵکە هەڵسەنگێنێ
دوورەپـەرێز رابگـرێ بـێ کـارە
بەستەیەك بێ بڵـێ وەتـەن سەربەستە
گـەلیش ئـاوا ئـازاد و بـەختیارە.
*****

# دەمی بەهار[1]

"بەبۆنەی هاتنەوەی قارەمانی کورد جەنەڕاڵ مستەفا بارزانییەوە وتراوە"

دەمی بەهار
بەهـــاری دیـــارە و دیـــار
مەســـت بـــەیادی زێڕی گزنگ
کاتی ئاورنگ
هەریەك نمی
لەسەر گیا
هەر حەوت ڕەنگەکە ئەنوێنێ
ڕێچکەی چیا
بەرگی بەڵـــەك ئەنەخشێنێ
هەنگ ئەفڕێ
بـــۆ مژینی هەڵاڵەی گـــوڵ
ڕێ ئەبڕێ
بۆناوبەهار
بـــەهـــاری دیـــارە و دیار
کاتێ ئاسمان

---

(1) ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (١٤١١)، ٢/١٠/١٩٥٨ بلاوکراوەتەوە

لەگەڵ نزار
بەبێ وچان
ئەکەونە بەراوردی رەنگ
نزار ئەڵێ:
بەهارسەوزە
منیش سەوزم
تۆ لە چیویتا بگەوزە
رەنگت شینە
وەکو وەنەوشە رەنگینە
ئاسمان ئەڵێ:
هەتا زووە
سەری خۆت هەڵگرە و هەڵێ
من نیگاربەخشی سروشتم
ئەوەندەی تۆسقاڵێ بۆیە
لەهەر جێیەکا رشتم
مایەی سەرنجدانی تۆیە
ئەوە کانی،
رووبار و گوڵ
باڵندە بەتاکە و پۆل پۆل
دوڕی تەماشاکردنن
گێژی ئەو دیمەنە شینەن
ئەوقی رۆژ بەسەر بردنن

دۆش دامـــاوی ئـــەو بینینەن
بۆ ناو بەهار
بـــەهـــاری دیـــارە و دیـــار
کام بەهار؟
کام جێگایە؟
هـــەلبـــەنـــی ئەم گفتوگۆیە
یا کام شوێنە
کە بەهار بەم چـــەشنـــە جوانە
یاکام نوێنەکە باسەکەم تیامیوانە؟
وەڵام: وڵات کـوردستانە
بەڵام جێـگاکـە بەرزانە
کاتێ دایـك چاوی ساوا
بەگڕی تۆپ ئەپشـکوێنێ
دەسرازەی ئارامی کۆرپە
بەبای شیلك ئـەجەڕێنێ
دڵی خستنەجووڵەوخورپە
بەگرمـەی بۆمباونارنجۆك
ئەبـــزوێنێ
دێ ئەسوتێ
دار بـــەری کـــاڵی ئەوەرێ
دووکەڵ بەری ئاسمان ئەگرێ
مەل ئەتەرێ

گوڵ، ئەگەر ڕەنگی سپی بێ
ئەبێ بەشین
بەوێنەی شاخی دەماوەن
چیای شیرین
تەمومژ تۆسقاڵی سووتان
ئەنێرێ بۆ گشت کوردستان
ناچاردایك،بۆبەخێوکردنی کوڕ
بۆ ژیانی، بۆ بەیانی
ئاواتی دەروونی بڕی
ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
بۆ هەڵسوڕان
ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
بۆ کوردستان
ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
ئەبێ کۆرپەبەخێو بکا
نەشاخ بکا نەشێو بکا
چی لێ بکا؟
ئەیێ ڕۆڵە بابەدایەن
ئەوانەی بۆساواسایەن
بە کام دایەن؟
ئەیدا بە دایەنی خەبات
بۆ ئەوەی بگاتە ئاوات

کوڕ

ئەکەوێتە مـــەیـدانی

پـاڵەوانی

لەگەڵ کـۆمەڵێ ئینسانی

نیشتــمانی

ئەبێ بەجەنگ

ئەبێ بەشـەڕ

کوڕ هەروەکو شێرێکی نەڕ

ئەڵێ کوردم

نەوەی کــــاوەی قارەمانم

من ئینسانم

ئـــەمـــەوێ وەکو ئینسانی

ئەم دنیایە

ولاّتی خۆم

چی تێدایە

لە خێر و بێــــری سامـانی

زەوی و کانی

بۆ بــــراو خـــوشکەکانم بێ

بۆ بەری رەنـــجی شانم بێ

بەلاّم دوژمن

هەر وەکو سەگێکی نەوسن

ئەکەوێتە ئێســـك خواردن

ئەڵێ مردن
ئەڵێ سوتان
ئاوارەبوون
ئەڵێ وڵات بـــەجێهێشتن
بۆ تۆ و بۆ هــاونیشتمانت
بۆ تۆ و بـــۆ خێـزانەکانت
بۆ ناو بەهار
بەهار بەهاری دوانــزەمانگ
بۆ جێیـە ئینسانـــەکـــانی
کامـــــەرانی، وەکو برژانگ
چۆن پــــەرژێـــنە بۆ گلێنە
ئا لەو شوێنە
شادمـــــانی
پەرژێنـــــی چرە بۆ ئینسان
بۆ نیشتمان
لەپڕ دەنگێ
لە نەی گەلێ خۆشتر بۆ گوێ
لە چرا روونـــاکتـــر بۆ زێ
لە ئارام نــــەرمتر بۆ جـــێ
بەبێ برانەوە هەردێ، ئەڵێ:
عێراق جمهـــــوریـــە
ئازادیە سەربەستییە

دنیایەکی پڕئاشتییە

بەڵێ، ئەوا چواردەی تەمموز

دوژمن ڕما

ناوی نەما

ئەوا کۆرپـــەی ئـاوارەبوو

ڕووکـەرە وڵاتـــی بـــاوك

بۆ میللـەتـان

کەوتوونـەڕێ

بۆ کوردستان

ئەوا شیـرین

قەندیـــل وهـــەڵگوردی

نەخشین

ئـەوا شاکـەل و شێـروانـــە

تێکڕا وا زەمـــاوەنـــدیـــانە

هەڵئەپەڕن

بەڵام هەڵپەڕکێی شێخـانــــە

*****

# جەزائیر

با رەهێڵەی دەسڕێژی تیژ
گوللەباران
بیوەرێنێ
گەلای تەمەنی لاو و کیژ
دوای بۆردومان
کە سووتا درەخت و گیا
دەشت و چیا !
کە بوو بەکۆمەڵێ ئاگر
یا بوو بەکۆمەڵێ پشکۆ
لاشەو دەست و سەر و ئەستۆ
یا بوو بەکۆمەڵێ خەڵووز
مەلۆتکەی منداڵی ساوا
لەبن خانووی هەڵوەشاوا
هیچ نابینێ
دوکەڵ نەبێ
باڵو جەستەی پەل پەل نەبێ
یا هەناسەی نووزەل نەبێ
کەچی ئەو خوێنە رژاوە
ئەو ئێسك و گۆشتە سووتاوە
ئەو قورگە نووزە تیاماوە

ئەبێ بەدەم

بەهاوارکردنێکی کەم
هێندەت زانی
قەدپاڵ و لوتکە و ئاسمانی
ئەو وڵاتە
پڕە لەچاو
پڕە لەقین
لەهەست و لەجۆش و لەتین
مەرز و بووم پڕە لە ورتە
بن دارە و پڕە لەخرتە
لەپڕ،
هێرش بۆ سەر دوژمن
تەقەوهاوار
ئەشڵەقێ گۆمێکی بێ بن
یا بەتەوژمی پەلامار
ئەپەڕێ مل، سەر و گەردن
یا تەقەی مێشکێ بەتەور
ئەگاتە ناو دووتوێی هەور
یا پەنجەی سەر مشتووی خەنجەر
ئەگاتە سەر پێستی کەمەر
یا گوللەی کوڵ

زرمەی بێدەنگی ئەدڕێ
نەک سێ، شەش و حەوتێ ئەبڕێ

***

ئـــەی گـــەلی جـــەزائری جـــێڕ
منیش وەك تۆ
لـە (سـەلماس) و (چهریـــــە) و (خـۆ)
یاخو لە(وان)
لـــە (بـــــاشقڵە) و دەشتـــی (بۆتـــان)
لـە (ئـاگری داغ) یـا لـە (دەرسیــــم)
دوژمــن، تێــر خـــوێنــــاوی مـــژیم
تێر سووتانی
تێر برژانـــی
بـــەڵام وا ئـــەو گـــەلە جـــێڕە
ئـــــــــەو ســــــــــەرسەختە
ســـــــەرنجی ئاراســـــــــتەی
چاوەڕێیە
وەك تـــــــۆی بـــــــــەكێش
ژیلـــــەمۆی ژێـــــــری خۆڵـــــەمێش
بـــەبای خەبـــــات بێتـــەوە گـــڕ
وەك تـــــــــــۆی لەپـــــــــــڕ
شەبـــــەیخوون لـــــە دوژمنـــــی كـــــا
بەیەكجـــــاری ســـــەرەوبنی كـــــا
*****

## بێکەسی خەباتکەر[1]

قوربانی تۆزی رێگەتم ئەی گردەکەی بەرین
وەیمەرزی شارەزا بەهەموو شاری ئاگرین
ئەی سروەکەت سەبارەتی هاندانی ئەم گەلە
وەی رەنگەکەت لە بەهار نیشانەی شۆڕوشین
کاتێ کە ئاڵ و سوور ئەبێ تارای ئەرخەوان
وەك خوێنی شەهیدانی رێگای راپەڕین
جۆشش ئەدا بەدڵی یارانی باوەفا
پەیمان ئەخاتەوە بیر لاوی چاو بەتین
پرسێ بکە لەوانەی لەدەور و پشتی تۆن
(بێکەس) خەیاڵی وردی کەوتۆتە هەڵفڕین
پرسێ بکە لە جووتە شەهیدی رێگەکەی
خۆشناوی کردەنای و حەمەی ئاوازی ژین
ئایا گەل کەسانی بەخسیوی گیان و سەر
ئێستێ لەکامە جێن و ئاخۆ خەریکی چین ؟!
مژدەی بەرێ بەگورجی و شاباشی لێ بکە
پێیان بڵێ بەگەرمی دەستبکەن بە هەڵپەڕین
مژدەی بەرێ کە چواردەی تەممووزی بەدشکێن

(1) ئەم شیعرە لە ١٩٥٨دا نووسراوە، لە ژمارە (١٤٢٣)ی رۆژنامەی ژین بڵاوکراوەتەوە.

ئاواتەکـــەی ئەوانـــەی گەیانـــە جێـــی یـــەقین
موژدەی بـەریٚ کـە چـواردەی تـەمموزی خـەمڕەوێن
شـــــەڕابەکەی ئـــــەوانی تـــــۆش،........
بـــۆ ئێمـــە شـــادی هێنـــا بـــۆ دوژمنانـــە شـــین
عەبدولکـــەریم لەپێـــشەوە و گـــەلی لەپـــشتەوە
هەنـدیٚ بەدەسـت وپـیٚ لـەکۆت، هەنـدیٚ بەسـەربڕین
دوژمـــن هـــەروەکو بەفرەکـــەی ســـالآن توایـــەوە
هەنـــدیٚ لـــەژێر پێـــی گـــەلا و هەنـــدیٚ بەهەڵـــدڕین
ئێستە هـەروەکو خـۆت وتـت بێکـەس بەشـیعرەکەت
کـــوردە لەگـــەڵ عەرەبـــدا وەکـــو بـــرا ئـــەژین[1] .

*****

---

(1) ئەم قەسیدەیەی شاعیر لەسەر تێزی هونەری شیعریی، شیعرە بەناوبانگەی (ناڵی) هۆنراوەتەوە

قوربانی تۆزی رێگەتم، ئەی بادی خۆش مـرور

وەی پەیکی شارەزا بەهەموو شاری شارەزوور

# شێخ مەحمودی تێکۆشەر(*)

بـــــەخولێکی تـــر ئەســـــتێرەی مرۆڤـــدار
نـــەوەی کـــاوەی گەیانـــدەوە یـــادی پـــار
کام یادی پار؟، کام مرۆڤی سەر رووی بـووم[1]
یـادی کۆچـی نـاو کـاتێکی بـەد و شـووم
یـــادی کەســـێ بــــەروبوومی پـــەیمانی
بەغـــدای رزیـــو هـــات کـــردی بـــەقوربانی
کۆچـــی کەســـێ لەتەقـــەلای بێبـــەش بـــوو
ژینـــی شـــۆڕش، مردنیـــشی شـــۆڕش بـــوو
کۆچی سـەرۆك شـێخ مـەحمودی کوردپـەروەر
رۆڵــــەی گــــەلی راپــــەڕیوی جــــەنگاوەر
کـوڕی سـاتی، مـردن بـێ نـرخ هـەرزان بـوو
خۆبەخـــشینی لـــەلا هـــیچ و ئاســـان بـــوو
هـــــەتا کـــاتی ناهـــــەمواری زەمانــــــە
تەمــــــەن زۆری فڕوفێڵـــــی بێگانـــــە
پەنجـەی تەقـەی تـا رادەیـە خـست لـەگۆ
کـــشانەوەی لاباشـــتر لەشـــەڕ و شـــۆ

---

(*) ئەم شیعرە لە ژمارە (١٤١٢)ی ٩/١٠/١٩٥٨، لە رۆژنامەی ژین وەرگیراوە

(1) بووم : زەوی.

کام یادی پار، کام مرۆڤی سەر رووی بووم
یادی کۆچی ناویادێکی بەد و شووم
کاتێ نێچیر بۆداوی دوژمن گەل بوو
کەتێ وەچەی بەدفەسالی تولوز خان
قینی کۆنی هێنابووەوە کوردستان
بەتەمابوو بەزوخاوی ناپاکی
تا تەنانەت وشەی کوردی زگماکی
قەدەغەکا لە شارێکا زنجیرەی
تێکۆشانی نەشتەرە بۆ ئەو بیرەی
ئەی شێخ مەحمود، ئەی روو لەبەرزی کوردی
تۆ نەمردی، هیچ کەسێ نالێ مردی
بەلام یەك ئاخ نەکەوتیتە ئەو کاتە
ولات باخچەی پڕی گەشەی ئاواتە
ئاسۆی هیوای نەتەوەی کورد بەیانە
برایەتی کورد و عەرەب نیشانە
***

# چواردەی تەمموز (*)

"لەبەرەبەیانی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ١٩٥٨دا دیلان ئەم شیعرەی نووسی و لە ئێستگەی کوردی بەغداخوێنرایەوە"

بریقەی شیرە یا ئاسمانە ئیمڕۆ
نەڕەی شێرە وەیا لاوانە ئیمڕۆ
چریکەی رۆژەکەی شادی ولاتە
وەیا کاتی لەخەو هەڵسانە ئیمڕۆ
تەپ و تۆزی نەبەردی راپەڕینە
وەیا خۆڵی هەرەس هێنانە ئیمڕۆ
لەبن هێنانی دەستەی گەلفرۆشە
وەیا گرمەی رمانی ژانە ئیمڕۆ
مانی ژانە وەیا زنجیرە ئەشکێ
وەرن کوردینە بنوارینە لاشەی
بەچنگی تۆڵە وا داخانە ئیمڕۆ

---

(*) ئەم شیعرە لە ژمارەی تایبەتی رۆژنامەی ژین وەرگیراوە ، کە لە ١٩٥٨/٧/١٤دا بڵاوکراوەتەوە

شکانی دارە یا زیندانە ئیمڕۆ
وەرن کوردینە بنواڕینە خانەی
سەرەوژێر و هەمووی وێرانە ئیمڕۆ
سەرەوژێرە تەلار و کۆشکی شاهی
وەیا دەشتی بەزمگێڕانە ئیمڕۆ
بەحەیران بۆی بڵێین یاخو بەلاوک
کە جەژنی بەرزی ئازادانە ئیمڕۆ.

***

# ســروود

١٩٥٨

کوردســــــتان بەهەشـــــتی زەمـــــین
جێـــــــی تێکۆشــــــان و راپـــــەڕین
مەڵبەنـــــــدی کـــــاوەی قارەمـــــــان
کوردســـــــــتان کوردســــــــــتان
ئـــــەی نەتـــــەوەی کـــــوردی دلێـــــر
رۆڵـــــەی نەبـــــەرد و بێـــــچوە شـــــێر
هەســـــته هەســـــتان دەرمانـــــە بـــــۆ
دەرد و ئـــــازاری جەســـــتەی تـــــۆ
کوردســـــــــتان کوردســــــــــتان
وا نـــــەورۆزە جـــــەژنی گەلـــــــه
ئاســـــــۆ رازاوەی دەم کەلـــــــــه
بـــــا نـــــەورۆز و بـــــەهاری کـــــورد
پێکـــــەبێنین بەدەســــــت و بـــــرد
کوردســـــــــتان کوردســــــــــتان(١)

***

---

(1) ئەم شیعرە سرودێکی بەجۆش و خروشی نەتەوەییە، دیلان خۆی ئاوازەکەی بۆ داناوە

# چــواردەی تەمــووز(*)

## ١٩٥٨

بــۆم بخوێنـــە ئــــەی بولبـــولی ئـــاوارە
بەســـتەی دڵـــێ ، سەرمەسـنت و گەشـکەدارە (١)

بەســـتەی دڵـــێ ، پـــڕ لـــە تریقـــەو هەســـتە
مەســـتی کـــاتی (لـــە هاویـنـــدا بـــەهارە) (٢)

بەســـتەی کاتـــێ ، چـیمەن بەفـــەڕ بـــە شـــۆیە
ئاسمـــــان بـــــووك و ئاوێنەکــــەی نــــزارە (٣)

---

(*) ئەم شیعرە بەبۆنـەی بـەرپابوونی شۆڕشـی چواردەی تـەمووزی سـاڵی ١٩٥٨ەوە وتـراوە، ئـەو شۆڕشـەی تـەخت و تـاراجی ئیمپریـالیزمی رۆژئـاوای رووخـان و دام و دەزگا نۆکەر و بەکرێ گیراوەکانی رژێمی کۆنەپەرستی پاشایەتی لـە رەگ و ریشە دەرهێنا و رووە و زبڵخانەی مێژوو رەوانەی کرد

(1) بۆم بخوێنە : مەبەست لە بانگەوازی بەرپابوونی کۆماری عێراقە، کە بەر لەو ساتە مرۆڤی عێراقی بە کورد و عەرەبەوە گوێی لەو دەنگ و بانگەوازە نـەبووە .. چـونکە لەبـەرە بـەیانی چـواردەی تـەمووزی ١٩٥٨ دا بـانگی برایـەتی و هاوبەشـی کـورد و عەرەب لە عێراقا بڵاو بووەوە.

- بەستەی دڵێ : گۆرانی خۆشی دڵێ.

– تریقە : بۆ پێکەنین و شادی بەکار دێت

(2) مەستی کاتی : مـرۆڤ لـە خۆشـی و شـادیا سەرمەسـت ئـەبێ چـونکە لـە هـاوین و قرچەی گەرماکەیا بەهار هات کە شۆڕشی چواردەی تەمووز بوو.

(3) چیمەن بە فەڕ بەشۆیە: واتە بەهارەکەمان هەمیـشە سـەوز و خۆشـییە بـە بۆنـەی ئەو شۆڕشەوە کە قەڵای ئیمپریالیزمی رووخان.

– بەفەر : بەپێز.

– بەشۆیە : تەڕ و برە.

بەسـتەی کاتێ .. شـادی ئـاڵ و رازاوە
(گـۆڕ) کـراوەی هەڵلووشـینی ئـازارە ..! [١]

بەسـتەی کاتێ .. چـرۆی نیـازی چـەن ساڵ
ئێـستە گوڵـە و خـۆی خـاوەنی گوفتـارە

بەسـتەی کاتێ بـرین دەمـە و ئەجۆشـێ
نـەك بـۆ تۆڵـە.. بـۆ کـرداری بێـدارە

بـرین دەمـە و دەمـیش پـڕ لـە هـاوارە
ئـەڵێ ئیمـرۆ گـەل کارەکـەی دژوارە ..!

بـا توولـەمار لـە ژێـر پێـدا هـەپروون بـێ
بەلام لەوبەر زیتەی چاوی رەش مـارە ..!! [٢]

زیتـەی چـاو و تیـژ کردنـی ددانـە
کلکەلـەقێ و مـرەی مـام ئیـستیعمارە ..!! [٣]

(1) گۆڕ : مەبەست لە زیندان و بەندیخانەیە کە راستەوخۆ دوای بـەرپابوونی شۆڕشـی چواردەی تەمووز ئەوانەیان تیا توند کرد کە لە سەردەمی رژێمی پاشـایەتیا ئـازار و ئەشکەنجەی نیشتمانپەروەر و ئازادیخوازانیان دابوو.

(2) توولە مار : زۆڵە پیاو و نۆکەر و دار دەستی ئیمپریالیزم.

– هەپروون بێ : ورد ورد بێ ، ورد و خاش بێ.

(3) زیتەی چاو : لێرەدا بـە مەبەسـتی چاوبزکردنەوەی ئیستیعمار دێت ، بـە نیـازی هەڕەشە لە دوا رۆژی کۆماری کۆرپەی عێراق لە ساڵی ١٩٥٨ دا .

بۆم بخوێنە ئەی بولبولی ئاوارە
بەستەی دڵی سەرمەست و گەشەدارە

بەستەیێك بۆ پشوو بدا بەجەستە
بە هەر لەشی بریندارە ، زامارە

بیدا بەگەل بەخاك و بەنیشتمان
بەکوردستان ، بەم مەرزە خۆش گەوارە[1]

بەستەیێك بۆ گوڵ پڕ بکا لە ورشە
بڵێ (شادی) لە جێی نووکی جەخارە ..! [2]

بڵێ لە جێی پەت و داری قەنارە
وا ناشتنی چنار و دار هەنارە ..!

---

(1) مەرز : شوێن و جێگا ، ئەو شوێنەی لەسەر سنوورە.

– گەوارە : بەجێ ، خۆش ، بێوێنە.

– بەم مەرزە خۆشگەوارە : بەواتای کوردستان ، بەم خاك و شوێنە خۆش و پیرۆزە.

(2) جەخار : درك.

بڵێ ؛ شادی لە جێی نووکی جەخارە : بڵێ کە بەزم و کەیف و خۆشی لە جێی پەستی و نا شادی واتە ناشادی و پەستی شوێنەواری نەما.

بلّـــێ لـــە جێـــی دەردی ســـەری و بێكـــاری
مێرگـــی (فرمـــان) هەڵبەســـتنی رووبـــاری

بلّـــێ لـــە جێـــی چەرمەســـەری و بـــێ زاری
شـــادمانی و كامـــەرانی بـــە بـــارە ...

بلّـــێ لـــە جـــێی بـــێ بڕوایـــی و نـــاكۆكی
كاروانەكـــەی (یەككگرتنـــە) قـــەتارە ..!

بەســـتەییێك بـــێ ئـــەم خەڵكـــە هەڵـــسەنگێنێ
دوورەپـــەرێزی رابگـــرێ .. بێكـــارە

بەســـتەییێك بـــێ بلّـــێ هانـــێ سەربەســـتی
گـــەلیش ئـــەوا ئـــازاد و بـــەختیارە ..!

***

# نێرگس(١)

١٩٥٩

ئـــەی پـــرچ پەڕەی سپـــی و نەرم
ڕوومـــــــــەت بـــلـــــــــوور(٢)

چاو … سەرچاوەی مەستی و شـەرم
بریسکــــەی دێ
وەك كــۆمەڵــــــە ئــــاڵتوونێکی
زاخــــاودراو
دەمــی زەردت
ئــەڕوانێتــــە بــــــریقەی بــــەرد
لەقــەدپاڵ و گردۆڵکە و هەرد ..!
تــۆ پرســیارت لــە بـــای وەشتــە
کــاتێ گۆپکە

(1) نێرگس یا نێرگز : گوڵێکی بەهاریی خاکی کوردستانە و نیشانەی سەرەتای بەهار و مژدەی نەورۆز ئەهێنێ.

(2) نێرگز : گوڵێکە پەڕەی سپی و چاو زەردە بۆنێکی یەجگار خۆشی هەیە …. تەمەنی کورتەو لە چەند هەفتەیەك تێناپەڕێ.

لێــــوی گـــــرژی ئـــــەبزوێنێ[1]

کاتێ چرۆ

چـاوی نووســتووی ئــەترووکێنێ[2]

یا ئەرخەوان

خونــچە لێــوی ئەنەخــشێنێ ...

تــۆ پرســارت لــە بــای وەشــتە

کەی ئەفڕێ

پەپوولــەی وێڵــی ئــەو دەشــتە ..!

کەی ئەگاتە

بەهەشـــــتی مێـــــرگ ..؟![3]

وەڵام نی یە

وەك تەمــــەنی گوڵاڵـــەی ســــوور

تیــژ دێــت و گــورج تێئەپــەڕێ ..!

یــــا وەك

بــــەفرێکی ســــاڵ درەنــــگ

کە بباریێ

---

(1) کاتی گۆپکە لێوی گرژی ئەبزوێنێ : بەواتا کاتی گۆپکەی دەمنووقا و ئەپشکوێ و دەم ئەکاتەوە.

(2) ئەتروکێنێ : چاو ئەکاتەوەو دائەخات .... یان پرتە پرتی چاو.

(3)مێرگ : بژوێن و سەوزایەکی جوان و قەشەنگ.(٥) گـوێ بـۆ یـەکتر رایـەڵ ئەکـەن : گوێ لە یەکتر ئەگرن.

چــۆن نـــاگـــــاته دەم ئێــوارێ
ئا بەو جۆرە
بـا ، چـرۆ ، لەگــــەڵ گۆپکـەی دار
دێن و ئەڕۆن
بـە فرمێـسکی ئـــاورنـــگی شـەو
لاشــەی لەناوچــوونیان ئەشــۆن ..!
ئـەی سـۆاخی پەپــــوولـــەی وێـڵ
وەڵام نی یە ...!
ناچـار روو ئـــەکەنە یــەکــــتر
ئەی پـرچ سپــــی چــاو پـڕ شـەرم
دەم هـەر وەکـو گـــەنجینەی زێــڕ
بـــەدەم شنــــەی شەمـــاڵــــەوە
تـا ... ئـاژەڵ دێتــــە مـــاڵـــەوە
مـــــل بۆیەکترئەلـــــــەقێنن
وەکـــو دوو پیــری ساڵ خوردە
دوو ریش سپی سەر گۆنا زەرد ..!
چۆن راز بۆ یەکتر گــەرم ئەکەن
رابردوویان
ئـــەهێنن ، بەبــــای ئـــــەدەن
ئــــــا..بـــــەو درەنگــــــە
گــوێ بـــۆ یـــەکتر رایــەڵ ئەکــەن
تـا زەردە ســەر کێـوان ئەبـەن ..!

کەچی وەلام..
یــا ســۆراخی پــــەپوولەی وێــڵ
ناگاتــە گوێـچکەی بــەق و چـێڵ[1] !
لــە پــڕ هــەور ئــەگــــرمێنێ
چـــــەخماخەی ســــوور
دڵـــــی چـــیا ئەهــــەژێنێ
تــاوی لێزمــەی بــارانـــی خــۆڕ
پــەڕەی نــەرمت ئــەوەرێنێ ...!
چی ناو ئــەنێــی
هێرش ... گریان،
هــــەتـــاو
زەرکــــەفتــــــی پـــــرشنگی[2]
ئەنیـــشێتە ســــــەر رووی زەوی
باڵنـــدە دێتـــــە جـــم و جـــۆڵ
ئەچــریکێنن لەگـــــەڵ نــــزار[3]

---

(1) بەق : کورتکراوەی وشەی بۆق.
- چێڵ : بە واتای مانگا دێت.
(2) زەرکەفتی : جۆرە رەنگێکە لە نێوان رەنگی ئاڵتوونی و رەنگی زەردا، زەرکـەفتی ئاڵتوونی پیێ ئەلێن.
(3) ئەچریکێنن: مـەل و باڵنـدەی دەنگخـۆش کـە بـە دەنـگ و ئـاوازێکی خۆشـخوانی بەرزەوە ئەخوێنن ، پیێ ئەوترێ : چریکاندن .... یا ئەچریکێنێ

ئەکەونە جۆش و کەف و کۆڵ ...!
ئەو نێرگسی ئاواتی کورد
چاوەڕێی (پەپوولەی) (جوولەی)
بەیان بێنێ؟
دڵی ئەم کوردە ئازایە راچڵەکێنێ.!
ئەوەندەت زانی
سامالّی سەرفرازی
هەوری دڕی
بەبای هێزی تێکۆشان
سایەقەی ئازادی کڕی

*****

# لۆمۆمبا(*)

١٩٦٠

چۆن ئەژیام ...؟
ژیـــانێکی بـــێ دەنـــگ و کـــپ
بێـــشکەی ئـــارام و ئـــامانم
دارستان بوو
بـــێ ســـنوور و زەبـــەنگ و چـــڕ[١]
جەنگـــەڵێکی پـــڕ سامـــان بـــوو
بە فرمان بوو..![٢]
جـــار جـــارێ رەشـــەبـــای بـــەهێز
هەڵی ئەکرد
زریکـــەی تۆقێنـــەرتر لـــەوێز[٣]...!
نـــەك دار ... رێکانیـــشی ئـــەبرد

---

(*) لۆمۆمبا : باتریس لۆمۆمبا لە ساڵی ١٩٢٥ لە ناوچەی (کاسای)لە کۆنغۆ لەدایك بووە .. لەدوا رۆژی تەمەنی ژیانیا وەك سەرکردەیەکی سیاسی و کەڵە پیاوێکی نیشتمان پەروەر دەرکەوتووە ... یەکێکە لەو سەرکردانەی (حیزبی نیشتمانی کۆنغۆ) یان دەمەزراندووە .... لە ١٩٦١\١\١٧ بە دەستی چەپەڵی نۆکەرانی ئیمپریالیزم لە بەرازافیل شەهید کرا.

(1) زەبەنگ و چڕ : چڕ و پڕ .... بە خەستی بەیەکا چووە .

(2) جەنگەڵ : دارستان ، جەنگەڵستان ، دارستان

(3) وێز : (دیلان) ئەڵێ : وێز جۆرە حەیوانێکی کوشندەیە لە خێزانی پڵنگە زریکەی زۆر سامناکە.

کۆرپەی ئەکوشت
خوێنی ئەڕشت..!
یا ... جار جارێ دڕندەیێك
لە برسانا .... کوشندەیێك
لەناو جەرگەی دارستانێك
دەرئەپەڕی
سکی ساوایانی ئەدڕی ...!
دوای تێر خواردن
لمۆزی بە مێشك ئەسڕی ...!
وا ئەژیاین
گەورە ... بریتی بوو لە هێز
ئەیخستینە جێی بەرز ورێز..!
لەپاشا رۆژێ لە رۆژان
دارستان سەیر گۆڕا بوو
بێ چرکە بوو ، بێ سرکە بوو[1]
پڵنگی برسی و بەلەسە
بێ نرکە بوو..[2]
بێشکەی زەبەنگی دارستان
دوور بوو لە تۆف ...!
لە جەنگی سەختی با و باران

(1) بێ چرکە : بێ جوولە. – بێ سرکە : بێ دەنگ و سەنگ.
(2) بەلەسە : شێتگیر ، یاخی. بێ نرکە : بێ ناڵەو بێ دەنگ

لە هەرەشەی تیژی ئاسمان...!
لە پڕ زنجیر
لەجێی نینۆکی دڕندە
تۆپ و شەستیر
لە جێی لافاوی کوشندە
زنج سووتاندن
مل پەڕاندن
دوو وشە هات
( یا نۆکەری یاخود مردن) ..!
دوو وشە هات زۆر بە کپی
(رەش بوو بەنۆکەری سپی) ...!
گەردن خرایە ژێرنیڵە
پەل ... پاچە و گاسنەو بێڵە[1]
سپی ... راوکا
نێچیری مرۆڤی قەڵەو
پێ لەداوکا
بۆ سەربڕین
تۆسقاڵێکیش
نەفرەت ، بێزاری دەربڕین

---

(1) بێڵە : ئامێری کێڵانی زەویە ... هەر وەك چۆن پاچ و گاسن و بێڵ بۆ هەڵکەندنی زەوی بەکاردێن.

رق تەواو کا ...!!

قامچی ئاراستەی هەستاو کا

پەت بخاتە گەردن و مل

لەسەر ئاوازەی هەڵپەڕین

(دڵ) بکەوێ لە جووڵە و پل ... !! [1]

بیخنکێنێ .. بیسوتێنێ

لەبەر ئەوەی (خودای ئاڵتوون) [2]

لێچی لێ هەڵنەقورتێنێ

وا ئەژیاین

لەگەڵ ئەم ناهەمواریيەش

نەئەگریاین ...!!

هەتا ڕۆژێ

تەپ و دوو کەوتە سەر ملە

دەنگی تەپڵ

جۆشی ئەسەن پەلە پەلە

---

(1) جووڵەو پل : جووڵە و لێدان ... خوێنەکەی پل ئەدا واتە لەگەڵ لێدانی دڵا ئەجوڵێ و ئەبزوێ.

(2) خوای ئاڵتوون : ئاڵتوون پەرست – نەوت خۆرەکان ... ئاڵتونی رەش : مەبەست لە داگیرکەر و ئیمپریالیزمی رۆژئاوایە کە بە مەبەستی کڵاویان و بۆ ئەوەی دەست بەسەر زێڕ و زیوی وڵاتانا بگرن و داگیریان ئەکەن.

شێر نەپراندی.

پڵـــنگ بـــــازرەقەی لێ بەســـت و[1]

زریکانـــدی.

دارستـــــان دەنـــگی دایـــەوە.

ئـــاگـــر

لـــەملاو لـــەولای وڵات کرایـــەوە..!!

پۆلـــە مـــەلی (تـــەرەی) کـــوشتـــار

گەرایەوە..!!

وتـــی ... بـــە دەنـــگێـــکی زوڵاڵ

ئەی گەورەکان

پیـــــاو خۆرەکـــــان ...!!

ئـــەم ئەســـتێرەی مرۆڤـــداره

جێگـای گـشته ... هـی هـەر چـواره[2] ...

وتـــی ئـــا ئـــەم دەشـــت و کێـــوه

تـــەرخان نـــەکراوه بـــۆ ئێـــوه

دروســت نـــەکرا بـۆ سوپاتـــان ...!

بـبین بـــە خـۆڵی بـــەر پاتـــان ..!

(1) پڵنگ بازرەقـەی لێ بەست : بازرەقـە ، زاراوەیەکـە کـاتی خـوێن دێـراو ئەبەستێ ئەڵێن : بازرەقەی بەست ، بەڵام لێرەدا بە مەبەستی ئەوە دێ : پڵنگ بەنیازی ئامباز بوون ، گوڕ ئەخواتەوە.

(2) هـی هـەر چـواره : مەبەست لەوەیـە کـە ئـەم زەویـە هـی : هـەر چـوار جـنس و توخمەکەیە (مرۆڤ ، ئاژەڵ ، پەلەوەر ، درەخت و سەوزایی).

بۆیێ ئاگر ، گوللە و بۆمبا[1]
رووی کردە مەرزی (لۆمۆمبا)
بۆیێ لۆمۆمبا ئەکوژێ
ئەزانێ ( رێگا و رێبازی)
ئەبێ بە چەك
لە بەرامبەری ئەو دەستەی
خوێن ئەمژێ ..!
بۆیێ(کەڵبەی) وەکو چۆمی
ئاراستەی سووچێکی لەشە[2]
دوژمن وتی ... وەك تۆم هەبێ
ئاواتیان ... پەرت و دابەشە[3]
بۆیێ (مۆبۆتۆ) ئەهێنێ
ئەزانێ و باشیش ئەزانێ[4]

---

(1) بۆیێ ئاگر: دوکەڵی ئاگر، زیاتر بەواتای رۆژگاری رەش و ناهەموار دێت.

(2) چۆمی نۆکەر و بەکرێ گیراوی ئەمەریکا بوو ، دژی ئازادی، وڵات و نەتەوەکەی خۆی بوو.

(3) وەك تۆم هەبی : وەك چۆم بی.

(4) مۆبۆتۆ: یەکێکە لە پیاوە دەرکەوتوەکانی کۆنغۆ (زائیر)، لەسەردەمی شۆڕشەکەی (لۆمۆمبا)دا سەرپەرشتی ئەنجومەنی شۆڕشگێڕانی کۆنغۆی لە (برۆکسل) ئەکرد ، لە ١٩٦٠\٧\٨ کودەتایەکی خیانەتکارانەی دژی باتریس لۆمۆمبا بەرپا کردو لە ١٩٦٥\١١\٢٤ دا وەك سەرۆك کۆماری کۆنغۆ بەزۆر خۆی بەسەر حوکما سەپاند.

کە سەگ بەزەبری کلکێتی
لوولاق و ئێسقان ئەشکێنێ ...! [١]
وایە ژیان...
ئەی لۆمۆمبای هەموو گەلان.
ئێمەش لەخاکی کوردستان.
ئەتکەین بە بەستەی سەر زمان
ئەتکەین
بە پەیکەرێکی بەرز بۆ تێکۆشان..!
بۆ..رزگار بوون
بۆ ... بەگژ داگیرکەرا چوون ...!
تۆ ...نەمردووی
وای لەدڵا
لە دڵی هەزاران گوڵا
وای لە رۆژا لەناو مانگا
وای لەناو تیری برژانگا
ئیمڕۆ سبەی
برژانگمان ئەکەین بە خەنجەر
ئەیدەین لەپشتی داگیرکەر

*****

---

(1) لوولاق : بەو ئێسکانە ئەوترێ لەپی پێ بە کلاّ و ئەژنۆ ئەگەیەنێ.

# من ئینسانم

١٩٦٠

پێـــستم رەشـــە وەك شـــەوەزەنگ
لێـــوم ئەســـتوور لـــچم زەقـــە[١]
نیگـــام ماتـــە وەك گـــۆمی مـــەنگ
بـــزەم نـــەرم و ســـەرم رەقـــە
مـــن ئێـــستاش لـــە هەنـــدێ جێگـــا
رەشـــیم مایـــەی تێـــز و بێـــزە[٢]
لـــەم کـــۆڵان بـــێ و لـــە ئـــەو رێگـــا
ســـپی لـــێم دوورە پـــەرێزە ...!
بـــەڵام مـــن ئیمـــڕۆ شـــێرانە
پـــێم لـــە زەوی گیرکـــردووە
ئەنـــــــەڕێنم دلێرانـــــــە
زراوی ســـــپیم بـــــردووە[٣]...
مـــن لـــە کۆنغـــۆ یـــا لـــە کینیـــا

---

(1) لچم زەقە : لچم دیار و دەرپەڕیوە ، لچم ئەستوورە. .

(2) قێز و بێز : نەویستن و نەفرەت لێکردن. .

(3) زراوی سپیم بردووە : واتە ئەو پێست سپیانەی رقیان لە مرۆڤی رەشە و دژی ئازادی ئەوەستنەوە من وام تۆقاندون لە ترسا زراویان چووە. .

ئـــــــەڵێم وەك ســــــپی ئینـــــــسانم[١]
دەنگـــــم چـــــوو بـــــۆ بنـــــی دونیـــــا
ئـــــیتر خـــــۆم خـــــاوەن فـــــەرمانم[٢]... !
مـــــن رەنگـــــم زەرد و لـــــووت پـــــانم
رووم پڕبـــــوو لـــــە لـــــۆچ و چرچـــــی
تفـــــت و تـــــاڵ بـــــوو گـــــوزەرانم
بـــــەری ژیـــــنم هـــــەر بـــــە کرچـــــی[٣]
دوژمـــــن ئـــــەیبرد منـــــی نـــــەخۆش
جێـــــی زۆربـــــەم بەندیخانـــــە بـــــوو
دیلـــــی رژێمـــــی خـــــۆ فـــــرۆش

بەشـــم هـــەر تـــوانج و تانـــە بـــوو .... ! [٤]
بـــــەڵام ئیمـــــڕۆ منـــــی رەنـــــگ زەرد
خـــــۆم خـــــاوەنی کـــــارو بـــــارم
ســـــکم تێـــــرە و دوورم لـــــە دەرد

---

(1) کۆنغـۆ : و کینیـا : دوو خـاك و وڵاتـی دوو گـەلی راپـەڕیو و شۆڕشـگێڕن ، دژی ئیمپریالیزم ئەو دوو وڵاتە کەوتۆنەتە کیشوەری ئەفریقاوە. .

(2) دەنگم چوو بۆ بنی دەریا : واتە دەنگم لەو پەڕ و ئەو پەڕی دونیادەنگی داوەتـەوە و گەیشتۆتە هەموو لایەك. .

(3) گوزەرانم : حاڵ و بارم، ژیانم ـ کرچ: بە میوەی کاڵ و نەگەییو ئەوترێ. .

(4) توانج و تانە : تیر و توانج ، عەیب و تانە و لەکە دۆزینەوە. .

سەرفرازە لادێ و شارم ...!
من بووم لە شەش یەکی جیهان
ئاواتم گرتە باوەشم
رەگی دوژمنم هەڵتەکان
بەزەبری شۆر و شۆڕشم ..!
منم لە (چین)، من ئینسانم
منم رێکخەری ژیانم
فێرکردنە تێکۆشانم
خۆم گەورەی نیشتمانم ...!
منم بە تەنیاو بە تاکی
لێم قەدەغەیەو تاوانە
(دوان) بە وشەی زگماکی
ئەنجامی کۆت و زیندانە ....!![1]
منم لە کوێ؟ .... لە تورکیا
سەیر گۆڕا ناونیشانم
بە (من) ئەڵێن تورکی چیا
وەک روو چووبێ کوردستانم ....!
بەڵام ... منی کورد ئینسانم
وەکو تۆ ئەی برای رەشم
خاوەنی نرکەو هەستانم

---

(١) دوان بەوشەی زگماکی : زمانی شیرینی کوردی. .

هـــەر چـــەندە ئێـــستا دابەشـــم[1]
منـــیش وەکـــو تـــۆ ئینـــسانم
ئـــەی (کاکـــە)، ئـــەی بـــرای زەردم
دۆســـــتی گـــــەلانی جیهـــــانم
رۆڵـــەی مەیـــدان و نەبـــەردم ...!
ســـا ئیمـــڕۆ بـــێ یـــاخۆ ســـبەی
ئەگەمـــــە ســـــەوداو مەبەســـــتم[2]
هەڵئەکێـــــشم پـــــشووی ئۆخـــــەی
تێـــر لـــەو بایـــەی کـــە پێـــی مەســـتم

*****

---

(1)خاوەنی نرکە و هەستانم: خاوەنی دەنگ و رەنگی خۆمم و هەر ئەبێ رووبەڕووی دوژمن ببمەوە.

(2) ئەگەمە سەوداو مەبەستم :

سەودا: لە کوردیا ئەوترێ سەوداسەر واتە ئەو هەوا و ئارەزووەی لە کەللەدایە، یان ئەو عەشقە پیرۆزەی ..... لێرەدا بە واتای عەشق و خولیای سەر دێ کە هیوا و مەبەست ئەگرێتەوە.

# بۆ گیانی غەنی بلووریان(*)

**١٩٦٠**

لەو دیو دیوار
کە تاسە ئەیبەستێ قەتار
بۆ دەرەوەی زیندانی تار
هەنگی گیان ئەفڕێ بۆ دوور
بۆ ناو بەهار
وەنەشە، نێرگس ، گوڵی سوور
چریکەی سۆز ناڵینی نەی
هاژە ، خوڕەی ئاوی بێ پەی(١)
زەوی سەوز ، ئاسمانی شین

---

(*) غەنی بلووریان لە ساڵی ١٩٥٩ یا حوکمی خنکاندنی بەسەرا درا و دوای کرابە حوکمی هەمیشەیی (موئەبەد) .. ساڵی ١٩٧٩ لە ئەنجامی راپەڕینی گەلی ئێرانا ئازاد کرا.

غەنی بلووریان : ئەندامێکی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو ، لە ساڵی ١٩٥٩ دا خۆی و چەند هاوڕێیەکی کۆمیتەی ناوەندی هەمان حیزب لە لایەن شالاوێکی ناهەمواری رژێمی کۆنە پەرستی حەمە رەزا شاوە گیران و حوکمی خنکاندنیان بەسەردا درا ، هەرکە دەنگ گەیشتە شاری سولەیمانی لەلایەن رۆڵەکانی شارەوە دەنگی نارەزایی بڵند بووەوە و لە شێوەی بیرخەرەوە و یادداشتا ئیمزا کۆکرایەوە و رەوانەی رژێمی سەر بە ئیمپریالیزمی ئێرانی و دەزگا رەسمی و دەوڵەتییەکان کرا

(1) ئاوی بێ پەی : ئاوێکی لەبن نەهاتوو .

## لــــوتکه ســـــپی ، دامێن ڕەنگین[1]

***

لەودیو دیوار

کـە ســـــەرنــــج ـــئەکـــەوێتە کـار

لــە شـێوەی بـــەهـــــاری نـــازدار

ژیان خۆشە

هیـواو هـــــــەست و نەســـت و هۆشـە

کێ بۆ ژیـــان بـــــەپـــەڕۆشـــــە

کـــام چـــاو برسی گەشـەی گوڵـە ؟

کـــام گیـان سـەودای ورشـەی دڵـە ؟[2]

کـــام گـــوێ قـــولاغـــی ئاوازە ؟

پـــڕە لە هەڵبـــەستی تـــازە ..؟

ژیان خۆشە ...!

بۆ یـــەکـــێ جـــەستـــەو ئەندامی..

کفتـــی دارکـــــاری کـــــردن بـێ

قـــەتماغەی کـــولاوەی زامــــی[3]

---

(1).دامێن ڕەنگین : داوێن ڕەنگین ، قەدپاڵی ڕەنگین.

(2)سەودای ورشەی چڵە : عەشقی ورشەی چڵە.

(3).قەتماغەی کولاوەی زامی : کە برین کەمێك سارێژ ئەبێتـەوە خوێنەکەی سەری ئەبیەستێ و پێی ئەوترێ قەتماغەی برین و زام جا کە ئەو قەتماغەیە بریندار یا لێبکرێتەوە خوێنی لێدێت و ئەڵێن : کولایەوە. .

سستـــــی قەپـــاڵ لێگرتن بێ ..!

بۆ یەکێ .. پێـــست و ئێـــسقانی

شەکەتی .. داغ و سووتـــان بێ[1]

چـــەرمی ئەستۆ و مل و شـــانی

لەتـــی زنـــجیری گــران بـــێ ..

بۆ یـــەکـێ نیـــنـــۆکـــی مـردن

نـــزیـــك دڵـــی راوەستـــابــێ

دانـــی جێـــگــــەر پـارچە کـردن

بەگۆشـت خـۆی لـە هەسـت دابـــێ

ئەوەندەی خوێن لێ تکا بـــێ ...![2]

ژیان خۆشە ...

بۆ ژیـــان چـــی بەپـــەرۆشـــە

یـــاچـــی لـە هـــەمـــوویان زیـاتر

ئـــەسووتێ وەك گـــڕی ئـــاگـــر

قاچـە ، دەستـــە ، لەشـی ختـــاوە

دڵ و سـییە یاخـــود چـــاوە ...؟؟

---

(1).شەکەتی .. داغ و سووتان بێ: واتە هیلاك و ماندوی سووتان و داغکردن بـێ : داغ
به واتای سووتان دێت ئەڵێن گوێچکەی مەڕەکەی داغکرد واتە بۆ نیشانە گوێچکەی
سووتاندوە.

(2).بە گۆشت خۆی لە هەستا دابێ

- ئەوەندەی خوێن لێ تکابێ : ئەوەندەی خوێن لێ هاتبێ.

یا مێشکە ..؟

کامیـان لـەپاش جوڵـــە نەمـــان

پـــاش بـــوون بـــە خـــۆڵ

بـــڵێســـەیـە بەبـــێ وچـــان

لـــەگـــەڵ چـــەرخا لەگـەڵ زەمـان

ئەگـەڕێ هـــەرگیـــزاو هـــەرگـــیز

مەشخـــەڵ بـۆ هیـــوای ئازیـــز..؟

***

ئەڵێن پیرە ..

ئەڵێن مێشـــك تێیا چەسپیوەو گیرە

بـە چـەکـــوش بیقلیـــشـــێنێ

ئەم رەگ ئەو رەگـــی دەربێنـــێ[1]

بیـــســـووتێنێ ، بـــسیـمـــرێنـــێ

بـی پـڕێنێ ... بـێ هـــوودەیە..! [2]

لـەم سەرتـــدا ئـــەو دیـــارە

لە جێگـەی یەکـــێ هـــەزارە!...

---

(1).بە چەکوش بیقلیشێنێ : بە چەکوش لێدان درز و دەلاقەی تێبخا. .

(2).بیپڕێنێ : زیاتر بۆ مێشك ورد و خاش بوون بەکار دێت وەك ئەڵێن : مێشکی پڕا.

- بێ هوودەیە : بێ قازانجە ، بێ کەڵکە ، بێ سوودە یا هیچ و پووچە. .

***

ئەی چوار سەری ناو زیندانی

کۆنەپەرستی ئێرانی

سەر زۆر پژا

خوێن زۆر رژا

کەچی لە جێگەی هەر سەرێ

سەد سەری تر دێتە دەرێ

لە جێی هەر دڵۆپە خوێنێ

سەد گوڵ سەری دەرئەهێنێ!!...

ئاسوودە بن ، زەبری زیندان

هەڵواسین و پەت بۆ خنکان

تەوژمی خەبات لەق ناکا

هێزی تێکۆشان شەق ناکا[1]

ئاسودەبن،بە کوشتن بێ وەیامردن

ریشەی کورد قەد نایە لێ[illegible]ن[2]

***

---

(1) هێزی تێکۆشان شەق ناکا : واتە هێزی خەباتگێڕان دووکەرت ناکا و دووبەرەکی دروست ناکات. .

(2) ئاسوو دەبن : هێمن و ئارام و لەسەر خۆبن .

# رەشەبا

۱۹٦۰

رەشەبای تیژ[۱]

دەمـــــــەو بـــــــەهار کەوتۆتـــــــە دووی

کـــلاوی ( تـــۆفی ) بـــابردووی[۲]

لـــــە دەم چـــیا بـــــەرە و پێدەشـــــت

رووەو خـــوار و بـــەرەو بـــای وەشـــت[۳] !

تونـــــــد و بـــــــەتاو ئـــــــەنرکێنیّ..

ئـــــــەلوورێنیّ ... ئـــــــەگرمێنیّ

ئـــــەڵیّ ... بـــــەهار بـــــەهاری پـــار

نـــــەورۆز لەگـــەڵ شـــەش رۆژی تـــازە

---

(1) رەشەبا : زاراوەیەکی تایبەتە ، لەشاری سولەیمانیا بۆ ئەو (( با )) بەهێز و توندە بەکاردێت ، کە وێنەی ئەو جۆرە بایە لەهیچ شوێنێکی کوردستانا نییە و جیاوازە لە زریان ، گەلێ جار با رەشیشی پێ ئەڵێن و گەلێ جار کات و ماوەی هەفتە یا دە رۆژ ئەخایێنێ .

(2) تۆف : بە ( کزە با یەکی ) ساردی دەم رەهێڵە باران ئەوترێ .

(3) بای وەشت : بایەکی فێکە لە رۆژانی هاوینا هەڵئەکا .

مەل ئەی خوێن بەستە و ئاوازە
پڕ بوو لە هەڵبەستی تاوەچەم .. هاژەی
هێجگار بە خوڕ بوو

گۆرانی بۆ مێرگی پڕ بوو
لە بریقەی نێرگزی شەنگ
یا وەنەوشەی چاوشینی مەنگ
* * *
بەڵام ئیمسالّ ئەلووریّنیّ
ڕەشەبای تیژ ... ئەگرمێنێ‌ووردە ( مێرو )
ئەبزوێیّ
ئەهاژێنیّ .. ئەناڵێنیّ
ئەڵیّ ئیمسالّ...
نە ورشە .. نە لوتکەی خالّ خالّ
نە پەڵەی گوڵاڵەی قەدپالّ
نە نێرگسی مەستی چاوکالّ
نە سۆزی دەروونی شمشالّ..
نایەڵم هیچیان دەرکەون

ئەوەنـــــدەی تـــۆزێ ســـــەرکەون..!
ئـــــەڵێ ئیمـــــساڵ منـــــی بـــــەفیز
بـــــە وژە یـــــا بـــــە گیـــــزە گیـــــز
ڕێ لـــــــە ( درەوشـــــــە ) ئەتـــــــەنم
چـــاڵ بـــــۆ (گەشـــــە) هەڵئەکـــــەنم[1]!

* * *

کەچی هەیهوو
هەڕەشـــــەی ڕەشـــــەبا وەك (فـــــوو)
یـــــا وەك (کـــــەفی) کـــــوڵی هەڵـــــچوو
وەك (ســـــەرابی) دەشـــــتی خـــــواروو[2]
هەرچـی بڵـێ .. بـە وێنـەی بڵقـی سـابوونە

---

(1) درەوشە : بەدوو واتا دێت : درەوشەدان و شـەوق یـا درەوشـە ئـەو سـووژنە نـووك تیژە ساتی حۆی کەوشدروو بە کاریان ئەهێنا ، لەهـەردوو حاڵەتەکـەدا واتاکـەی بـە جوانی لەگەڵ شیعرەکەدا ئەگونجێ

- ( گەشە) : لێرەدا بەواتای نەش و نما ، گەشە کردن و پێگەیشتن دێت .

(2)وەك ((سەرابی)) دەشتی خواروو :

- سەراب : تەڕاویلکە

- دەشتی خواروو : سارای خواروو – نوگرە سەلمان بـەواتا ، وەك تەڕاویلکـەی بیابـانی نوگرە سەلمان .

( خێرا بوون ) زوو لە ناوچوونە[1]!

* * *

بەڵێ.. ئەم کۆمەڵی خەڵکی ئەم وڵاتە
دەمێکە چاوەڕەێی گەیین بە ئاواتە[2]

کە سەری دەرهێنا چووزی ئازاد کردن
کەوتە گۆپکە داری (هیوا) بۆ بەرگرتن[3]
هێز نییە لەناوەڕاستا بیوەستێنێ
با هەزار هەوری رەش بێت و بگرمێنێ

*****

---

(1)یەکێ لە سیفەتەکانی بلّقی سابوون کە کەفەکەی دروست ئەکرێ ، زوو پەیا ئەبێ و هەر خێراش لەناو ئەچێ و تەمەنی ساتە وەختێکی زۆر کورتە

(2) دەمێکە چاوڕێی گەیین بە ئاواتە: دەمێکە چاوەڕێیە کە بە ئاوات بگات.

(3) کەسەری دەرهێنا چووزی ئازار کردن :

چووز بەدوو واتا دێت واتە دەمێ گۆپکە کە دەرکەوت یان سەرەتای سەرەتاتکێی دەمی گۆپە و چرۆ، واتای دووەم چووز گەر لە چووزانەوەی ئازارەوە هاتبێ ئەوا واتاکەی بە هەر دوو بارا جوانە.

# تــــاوان

١٩٦٠

تـــــاوان ســــــەختە ، تـــــاوان بـــــاری گرانــــــە
بــــــاركردنی لـــــــە ئەســـــــتۆدا هەرزانـــــــە[1]
كــــام ســــەرگەورە ، كــــام مــــل بـــــەرز و بڵنــــدە
كــــام دەمولێـــــو مەســــــت و پـــــڕە لــــــە خەنـــدە
ئــــــەتوانرێ بــــــە يــــــەك بـــــزەی ژەهـــــــراوی
تــــیری تـــوانج ، بــــەردی تانــــەی بــــۆ هــــاوی..
وەك چـــۆن پووشـــێ بـــای تيـــژ ئــــەيبا بەپەلــــە
بــــەو شــــێوەيە ناوبــــانگ بخەيتـــــە مەلـــــە!..
يـــا ئـــــەتوانی ســــــەر لـــــــە ســــــەرين بــــسێنی
تــــۆوی ( نــــەفرەت ، بێـــز كردنــــەوەی بـــچێنی)
ئـــــەی نــــازەنين.. ئــــەی بــــەرگ ئەرخـــــەوانی

(1) باركردنی لە ئەستۆدا هەرزانە : واتە پياوەتی و چاكە و خزمەت گوزاری كارێكی گرانە كەچی نامەردی و تاوانكردن لەدەست هەموو كەسێكی دەروون سوك دێت.

وتـــەی گـــەرمم لەگـــەڵ تۆیـــە و ئـــەیزانی
سەوداســـــەری ئـــــەو گفتوگـــــۆ دێرینــــــەم
لـــەپ ســـووتاوی ئـــەو یەکـــەم دەسگوشـــینەم[١]..
لـــــەو دەمـــــەوە تـــــۆم کـــــردووە بـــــە تاســـــە
بـــێ مەودایـــە کـــۆی دووکـــەڵی هەناســـــە[٢]
بێ دوایيە ئەشـك بـا سـوور و سـوێر بێتـایێ لـەبن
ئەگـــــــەر چـــــــی دیـــــــدە کـــــــوێربێ[٣]
ئـــیتر بۆچـــی ئەمدەیتـــە بـــەر تیغـــی دەم
هـــیچ ناترســـــی بتـــــسوتێنێ هەناســــــەم..؟

* * *

ئـــەی نـــازەنین.. ئـــەی روو جـــوانتر لـــە شەســـتپەڕ
ئەی گوێچکەی دڵ هیچ نەبیستووە تەمەن شـەڕ[٤]

(1) لەپ سووتاوی ئەو یەکەم دەست گوشینەم : واتە گروتینی یەکەم دەست گوشینت لەپی دەستی وەك ئاگر لێکردوە و تا ئێستاش هەر گەرمە.
(2) بێ مەودایە کۆی دوکەڵی هەناسەم : واتـە دوکـەڵی هەناسـەکەم ماوەیـەکی دیـاری کراوی نی یە
(3) ئەشك : بە فرمێسك ئەوترێ
(4) شەست پەڕ: بەجۆرە گوڵێ ئەوترێ کە گوڵێکی زەردی هاوینە و پایزانە.

هێجگار سەیرە ، هەر وەك تەرازوو وایە
هەڵسەنگاندن لەلای ئا ئەم دونیایە
دونیا سەیرە و سەیر شێواوە پۆی کێشانقورس بۆ
زەوی سووك ئەچێ بۆ ئاسمان!
زەهر شیرە ، مار ئەهێنن . بۆ بێرە

(گا) لەشۆخی و خاوەن خەرمان بۆ گێرە ..[1]!
گورگ پاسەوان ، شوان دانی لەگۆشت جیرە
مر.. بۆ چەقەڵ مل درێژە بێ قیرە!.

* * *

ئەی نازەنین ئەی بەرگ ئەرخەوانی
وتەی گەرمم لەگەڵ تۆیە و ئەیزانیلەگەڵ ئەوەی
(دڵ) پەرۆشی رووی ئاڵە
دەروون سەودای لوتکەی بەرز و خاڵ خاڵە!
خەیاڵ وڕی بینینێکی چیایە

(1) گا لەشۆخی و خاوەن خەرمان بۆ گێرە : واتە دنیا بە جۆرێکی ئەوتۆ لنگەوقووچ بۆتەوە لە بری (گا) بۆ گێرەبەرن کەچی خاوەن خەرمان ئەبرێ

لەبەر دووری لەمێرگ و سەوزە گیایە[1]

ڕەنگی گەلایی تێکەڵ بە شۆی نزاران

ئەکسیرێکە بۆ دڵی دەردەداران[2]

بەکورتی... فەڕ لەگەڵ جوانی وڵاتم

هۆی... تروسکەی ئامانجمە و ئاواتم

کە نەتەوەم گەیشتە دووا مەبەستی

نامەی کردار هەچ کەمی درایە دەستی

ئەوسا ئەگەی لە خەبات بۆ تێکۆشان

کە بۆ کوردە و بۆ ڕزگاری کوردستان

*****

---

(1) خەیاڵ وڕی بینینێکی چیایە: دیارە کەسێك ژیاوی شاخ وداخ بێت کە دوورکەوتەوە، سەری کاس و وڕی بینینی دیمەنی ئەو چیایانەیە کە لەگەڵیان ژیاوە.

(2) شۆی نزاران : تەڕ و تووشی گوڵ و گوڵزار و سەوزەگیا ئەکسیر: ئیکسیر: لای کیما گەرەکان وا باوە کە مادەیەك تێکەڵ بە مادەیەکی دی ئەکرێ نرخەکەی بەرز ئەکاتەوە وەك ئەوەی تێزابی ئاڵتون تێکەڵ بە زەرد بکرێ نرخی مادەتێکەڵەکە بەرزترە لە پێشوی یا زەرکەفت بکرێ بەو مادەیەی کە مەبەستە.

دیارە مادەیەك ئەوەندە بە نرخ بێت وەك مادەی ئیکسیر دەردی دەردەداران تیمار ئەکا

# کەی

١٩٦٠

ئـــەی هەنـــسك و ســـۆزی بلـــوێر
کـــــەی بـــــێ مـــــن... تێـــــر

قـوم بـدەم لـەو (گـۆی) شـەتاوە
دەم بخەمـــە دەمـــی چـــاوە... ؟[1]

دەس بکەمـــــە ملـــــی چـــــیا
وەك شـــەونمی ســـەر ســـەوزە گیـــا

وەکـــو هـــەنگی ســـەر هەڵاڵـــە
ســـەر بکەمـــە ســـەر گوڵاڵـــە

ســـــنگی نێـــــرگس هەڵبمـــــژم
کەمـەری ( تاڤگـە ) بگوشـم... ؟

ئـــەزانی کـــەی... ئـــەزانی کـــەی ؟
هـــەناو و دڵ ئـــەڵێ ئۆخـــەی .. ؟

گەشـــەی بـۆ مـــن بـۆ چـاوی کـوێر
ئـــەی هەنـــسك و ســـۆزی بلـــوێر!

---

(1) گۆی شەتاو : گۆی تاڤگەی ئاو ، گۆی سەر قەڵبەز و دابەزی ئاوەکە کە وەك شەت لە شوێنی بەرز و بڵند ئەڕژێتە خوارێ.

- دەمی چاوە : سەرچاوەی ئاو.

# ڕەنگ

١٩٦٢

کـــام ڕەنـــگ جوانـــە کـــام ڕەنـــگ جوانـــە
بـــۆ لەچـــك یـــا دەسمـــاڵی شـــان یـــا کوڵوانـــە

ئـــەڵێن لەهـــەموو ڕەنگێکـــا.. ڕەنگـــی پـــشکۆ
ئەچـــێتە ســـەر ئـــاوا بـــوونی ڕۆژ لـــە ئاســـۆ

هەنـــدێ ئـــەڵێن.. شـــەبەق بـــدا لـــەو کێوانـــە
لـــە هـــەموو ڕەنگـــێ نـــزیکتر ئەرخەوانـــە

هەشـــن ئـــەڵێن ڕەنگـــی ســـووری وەك گوڵاڵـــە
ئەچێ لە شـێوەی ئـەو خوێنـە قـاڵ و ئاڵـە.. [1]!

کـــەوا بـــوو.. لـــە پـــشکۆی ئـــاڵی تێکۆشـــانا
لـــە ئاســـۆی ســـوور و پەمـــەیی کوردســـتانا

لـــە جۆگـــەی خـــوێنی ڕژاوی شـــەهیدانا
لـــە دوو تـــوێی گـــردی ســـەیوان و بەهـــدینانا

---

(1) ئەو خوێنە قاڵ و ئاڵە : مەبەست لە خوێنی قاڵبوونی تێکۆشانی سەرسەختە.

لـــــــــەو ڕەنگانـــــــــە.. ڕەنگانـــــــــە
بـــــۆ ئـــــەو مـــــل و بـــــاڵ و شـــــانە

بـــۆ کیژۆڵـــەی بـــاڵا بـــەرز لـــە مـــردن
پـــرچ گرژتـــر لـــە ئەڵقـــەی زنجـــیری گـــەردن

چاوڕەشـــتر لـــە شـــەوی ئێـــستەی کـــوردەواری
بـــــرژانگ درێـــــژتر لەچـــــەکی گوناهکـــــاری

بـــۆ تـــۆ.. لـــە چـــکێ دەسمـــاڵێ کۆڵوانەیـــە
ئـــەم ڕەنگانـــە شـــیاوی ئـــەو جێگایانەیـــە

بـــــۆ تـــــۆ.. تـــــۆ ئـــــەی کیژۆڵـــــەی..
تـــۆ هـــەتاکو گـــەردوون مـــابێ مایـــەی مـــانی
*****

# بەستە[*]

١٩٦٢

لەپەڕەی نێرگسی بزەی وەریوی لێو
گاڵتەکەر بەدان و چنگی خوێناوی دێو
لە خونچەی سوور و پەمەیی لێو هەڵقورتان
بێزکەرەوە لە دوو دڵی و ترس و گومان
لە زەریای بێ بن و مەنگ و قووڵی سەرنج
خنکێنەری دوا هەناسەی خێو و درنج
لەو شێوانە هەڵبەست بۆ بەستە رست ئەکەم
کە بوو بە دەنگ (سمفۆنیایەك) دروست ئەکەم[1]

بەستە ئەڵێم وەکو نێرگس گەشەدار بێ
وێنەی شەپۆلی زەریا هەرەشەدار بێ
وەکو خونچەی نەپشکووتوو تورت و ئاڵ بێ
هەروەك ئەنجامی سەرکەوتن قسەی زاڵ بێ[2]

بۆ تۆ کێژۆڵەی..
تۆ هەتاکو گەردوون مابێ بەستەی مانی

******

---

(*)(بەستە) : بەزۆری دوای (مقام) دێت گۆرانیەکی پڕ لە جۆش و خرۆشەی بەزم و ڕەزمێکی گەرم و گوڕی لە ئامێز گرتووە.

(1)لەو شێوانە : لەو جۆرانە ، لەو بابەتانە لەو شێوەیە لەو ڕەنگانە.

(2) تورت : (پتەو)

ـ هەڵبەست بۆ بەستە رست ئەکەم: واتە هەڵبەست بۆ بەستە بەدوای یەکا هەڵئەچنم..

# رەز

## ١٩٦٢

بەهار.. ئەی مەی ئەڵوەن و سادە
نەتدیوە پەترۆی پیاڵەی بادە[١]..

جەستەکە شەنگە ، هەناسە سوارە
سەر وڕی (لەپە) ، دڵ بریندارە[٢]

هەناسە رەشە ، هەست پڵیشاوە
بانگیش لە بەربین قوڕگا خنکاوە

پێست بەسەر ئێسکا قرچ هەڵگەڕاوە
لەشە ، جنراوە .... سەرە بڕاوە[٣]

(1) رەز : باخ و باخاتی هەمە جۆر ترێ و مێو.
ئەی مەی ئەڵوەن و سادە : سادە : ئاسایی
پەترۆی پیاڵەی بادە : بادە : مەی
(2) سەر وڕی (لەپە) : واتە سەر لە ئەنجامی زللە و لێدانا وڕ و کاسە .
لەپ : لەپی دەست .
(3) پێست بەسەر ئێسکا قرچ هەڵگەڕاوە : واتە وشک و رەق بۆتەوە ، بە جۆرێ پێستەکەی بەسەر ئێسکیا هەڵقرچاوە.

لەکوێیـــە شـــەراب لـــە کوێیـــە شـــەراب
بۆ لـە ئێمـە بـوو بـە رێچکەی سـەراب ... ؟!

ئـــەبێ لـــە کـــوێ بـــێ بـــۆن و بەرامـــەی
ئـــەو رەنگـــە ئـــاڵ و ئـــەو تفتـــە تامـــەی

ئـــەبێ لـــە کـــوێ بـــێ درەوشـــەی ســـووری
روونـــــاکی تیـــــشك و بڵێـــــسەی دووری

وا دیـــارە هەڵپـــە و ئـــاوات و ئۆخـــەی
ئـــەبێ ببەینـــە پـــەنا شوشـــەی مـــەی

ئـــەی گـــەردن رەوان وێنـــەی نـــازداران
ســـاف هـــەر وەك نیگـــای چـاوی خومـاران[1]

بێگـــەرد هـــەر وەکـــو دەروونـــی مـــەردان
بـــێ خـــەوش وەك گـوڵی سـای پـەنا بـەردان[2]

---

(1) ئەی گەردن رەوان : ئەی گەردن رێك و پێك .

ساف : تەخت ، رێك و رەوان

(2) بێ خەوش : بێ لەکەو عەیب و عار

لەکوێیـــــە شــــەراب لەکوێیـــــە شــــەراب
بـــۆ مـــەزەی ، ئـــەوا ، گیـــان و دڵ کـــەباب!..

وا دیـــــارە هەڵپـــــە و ئـــــاوات و ئۆخـــــەی
ئـــــەبێ ببەینـــــە پـــــەنا کووپـــــەی مـــــەی

ســـەبوو .... ئـــەی کانگـــەی بـــیری ئیفلاتـــوون
پیاڵـــە و شوشـــە وا بـــوون بـــە هـــەپروون[1]

وەرن .... هـــــەروەکو ئەســــتۆی نالــــەبار
خاشــــن .... بەوێنـــــەی زنجـــیری زۆردار[2]

ونـــن ... بەوێنـــــەی تـــۆزی بـــا بـــردوو
تـــەفرن ... بەوێنـــەی تـــۆزی بـــا بـــردوو[3]

---

(1) سەبوو : لای مەی خۆر و بادە فرۆشان بە کوپەی شەراب ئەوترێ : سەبوو
ـ بیری ئیفلاتـوون : ئیفلاتـوونی فەیلەسـووفی یۆنـانی بـە خـاوەنی تیـور و بـیردۆزە سـەرەتایەکانی کۆمەڵایـەتی دائـەنرێ وە بـە بیردۆزێکـی گـەورەی (دیموکراسـی) دائەنرێ .... وەك ئەڵێن : گەر ویستبێتی بـیردۆز و تیـۆرێکی نـوێ بێنێتەکایـەوە ، ماوەیەك لەناو کۆپەی شەرابی بەتاڵ دانیشتووە و دوایی هاتۆتە دەرێ و تیورەکـەی خستۆتە روو.
(2)ئەستۆی نالەبار : ملی نالەبار : وەك ئەڵێن : ئەستۆی ئـەو پیـاو خراپـە شـکێ واتـە ملی ئەو پیاو خراپە بشکێ .
ـ خاشن : وردن ، ورد و خاش
(3) تەفرن : تەفر و تونا ، لەناوچوون و خاپور کردن

لــه کوێیــه شــەراب ئــەوا تاســەی مــەی ... ؟
هەست نوقوم ئەکا وەك زەریای بێ پەی[1] ! ...

ئـــەی داری مـــەمك پـــڕ لـــە شـــیلەی ئـــاڵ
کۆرپـــەی مێـــشکی برســـی شـــیری تـــاڵ[2]

گـــرۆزە بـــۆ یـــەك مـــژ و یـــەك دڵـــۆپ
بـــۆ شـــەوی خـــەیاڵ ببـــێ بـــە گڵـــۆپ[3]

رۆشـــنکا دونیـــای هەســـتی مـــن هـــەر وەك
چـــرایە بـــۆ نـــاو (بیرێکـــی) نووتـــەك[4]!...

ئـــای کـــێ بـــێ بـــانگ و هـــاوار و پـــەیام
بگەیێنێتـــــە گـــــوێ گـــ ـڕی خیـــــام

بڵـێ ... هـەی سـەر شێت کوشـتەی گڕی تـەڕ

---

(1) زەریای بێ پەی : دەریای بێ بن

(2)شیری تاڵ : شەرابی تفت و تاڵ

(3) گرۆزە : گرۆز ... کۆرپە و ساوا و منـاڵ کـە هەمیشە بەکـەمترین بیـانو ئـەگرین ، بەمە ئەوترێ منالی گرۆز ... یا گرۆز ئەگرێ

(4) نووتەك : تەواو تاریك ، شەوە زەنگ ، ئەنگوستە چاو

گەر تێتا ماوە یەك تۆز نرخ و فەر[١]

تۆ ... لەسەرباکەی شووشەکەی شکان
لەگەڵ خودادا کردت بە زۆران

هەڵسە بەرە و ئەم ناوە هەڵتووتێ
نەك شووشە شکا وا رەز ئەسووتێ[٢]

سروشت بەپێچە خوار و چەپ گەردە
لە جێ بێ ئاو بێ رەقەن و بەردە[٣]

لە جێیێ زەوی نەرم و هەلۆڵ بێ
ئەبێ خورەی ئاو تۆزێ دەهۆڵ بێ[٤]

---

(1) گڕی تەڕ : گڕ : رەنگی ئاڵ و سووری هەیە ... کەواتە شەرابیش بەو رەنگە ئاڵەیەوە لە گڕێکی تەڕ ئەچێ

(2) هەڵتووتێ : هەڵتووتان : واتە بە چیچکانەوە دانشتن و گەلێ جار هەڵتڕوشکانیش بەکاردێت

(3)لەجێی بێ ئاو بێ رەقەن و بەردە : لەو شوێنەی ئاو نەبێ ، ئاو دانیش نییە و زەویەکەی بە وشك و رەقەنی ئەمێنێتەوە

(4)نەرم و هەلۆڵ : نەرم و نۆڵ ، نەرم و نیان .

ئـــەگینا شـــەراب لـــە مامۆســـتای مـــاف
بــۆ ئەگەیــشتە ئـــەو پـــەڕ قولـــەی قــاف[1]

قـــاتی شـــەرابە گیـــانی ئیفلاتـــوون
ســـەردەرکە هـــەتا نـــەبووی بـــە مـــەیموون[2]

بـــەرەو مەڵبـــەنی کوردســـتان رەوتـــێ
نـــەك کووپـــە شـــکا وا رەز ئەســـووتێ
*****

تێبینی/

ئەم شیعرە بەناوبانگەی (رەز) شاعیر دیلان جگە لـە ئاستی بڵندی دارشتنی هونـەری‌و گەوهـەری بـەهێزو پێـزی واتـا فەلـسەفیەکەی.. بەڵگـەی هەستی پـاکی کوردایـەتی دیـلان بـەکردەوە ئەسـەلمێنێت مرۆڤێکی بەهەڵوێستو بوێرو ئـازا بـووەو بـێ پاکانـە ئامـادەی بـاجی تێکۆشـانەکەی بـووەو لەسـەر ئـەم شـیعرە حکومـەتی قاسـم سـزای بەندکردنی بەسەردادا .

---

(1) مامۆستای ماف : ئیفلاتوون .

- قوڵەی قـاف : لـە کۆنـا و زۆر کـۆن لای خـەڵك وا بـاوبوو کـە قولـەی قـاف لـەو پـەڕی دنیادایە و بریتییە لە ناوچەیەکی شاخاوی چۆڵ و سامناك ، هەروەها بیروڕایەکی ناو کۆمـەڵ هـەبوو کـە گوایـە لـەمانگی رەمـەزانا هەرچـی (جـن) جنۆکـە و گیانلەبـەری زیانبەخش هەیە، بەفەرمانی خوا رەوانەی قولەی قاف ئەکرێن .

(2) مەیموون : بەنموونەی پەند و عیبرەتی زەمانە ئەهێنرێتەوە.

# درەخت

**١٩٦٢**

دار بەڕوو[١]
گەڵای ئەستوور
لقی دوایی ئەبێ بە موور[٢]
ئەی پەڕێنن
ئەی شکێنن
شەتەك ئەدرێ
ئەیجەڕێنن[٣]
ئەیکەن بە بار
ئەیهێنن بۆ بازاڕی شار
ئەیفرۆشن
بەوەی بۆ ماڵ بە پەرۆشن
ئەیسووتێنن
نانی پێ هەڵئەبرژێنن

---

(1) دار بەڕوو: دارێکی رەق و پتەوە، شاخەکانی کوردستانی پێ داپۆشراوە و دێمییە و بەشێوەیەکی سروشتی ئەڕوێ ، تەمەنێکی درێژی هەیە و لە شیعری کوردیا ، نیشانەی خۆڕاگرتن و بەتەمەنی و هێز و پتەوی و رەگ داکوتانی کوردە بە ناخی مێژوودا.

(2) لقی دوایی ئەبێ بە موور : موور : بۆ نیشانە و بنە درەخت بەکاردێت . واتە لقی دوایت قەف ئەستوور خۆنەگرێ و ئەمێنێتەوە

(3) شەتەك ئەدرێ : فایم و تونگ ئەبەسرێ

ئەیجەڕێنن : دیسان بە واتای شەتەك و تونگ کردن دێت

ئەیــــکــەنـــــەوە بــــە گـــڕی ســــوور
ئەیکـــەن بــــە چـــاووگ بـــۆ تـــەنوور.. !
بەڵام ئێســـــتا
ئـــەی کتێـــــــبەکەی ئاوێـــــستـــا[1]
سێبەری تۆ
ئاخۆ .... ئاخۆ
بـــۆ چـــــەن بـــــریندار دەرمـــــانە
پـــــەنای چـــەنـــــدەها خێـــــــزانە
بەڵام ئێستا
ئـــــەی کتێبـــەکـــــەی ئاوێـــــســـــتا
سێبەری تۆ
لــەم پــەڕ ئــەو پـــــەڕ پـــــێ یــا بــڕۆ

لەو شاخانـــە
لـــەو ملـــە و لووتکـــە بـــــــــەرزانە[2]
سێبەری سەخت
جێـــگەی دەوانـــە بـــۆ مەبـــــــەست

*****

(1) کتێبی ئاوێستا : کتێبی ئاینی زەردەشتییە. کە زەردەشت لە چەرخی حەوتی پێش (( زاینا )) پێغەمبەرایەتی کردوە و لە سەردەمی حوکمی ساسانیەکانا باو و بڵاو بووە .
(2) مله : مەبەست لەکەلی شاخە

# بەهەشتی فرمێسک

**١٩٦٦**

**ئەی شەوەزەنگ ، ئەی تاریکی ، ئەی رەشایی شەو**
**دەی .. باڵی رەش بکەرەوە بۆ چاوی بێ خەو..**

**بۆ بێداری ... رۆژی روونی ... تاریک و تاڵە.**
**بۆ ناچاری ... کە رۆژ هەرگیز زیندانە لای ئەو[1]**

**کام پێکەنین پڕ لە گوڵە و گەشی ئاواتە**
**بۆ ئەو زەنگی بە (ناسوری) رێگای نەهاتە..!**

**کام ورشەی روو یا کام پرشەی ئەستێرەی**
**چاویجگەرسۆزە، سینە دۆزە، ئەبڕێ هەناوی[2]**

---

(1) بۆ بێداری : بۆ بێ خەوی ، خەو زڕاندن ، بە خەبەری بە ئاگا

(2) پرشەی ئەستێرەی چاوی : درەوشەی ئەستێرەی چاوی .

ـ سینە دۆز : سینەی کون کون ئەکا ، سنگی کون کون ئەکا .

ـ ئەبڕێ هەناوی: لە زاراوەی ناو شاری سولەیمانیا ئەوترێ جەرگی بڕی و هەناوی خستە خوارێ

لای ئــــەو .. وێنــــەی ئەســـتێرەکەی دزی کاروانــــە
خـشتەبەرە ... ڕێگـای درێـژ بـە نزیـك زانـە[١]!! ..

کام گوڵ جوانە ... کام بۆن خۆشە . کامیان بە پیتـە
لای ئـەو ... هـەمووی جادوگـەری و نەریتـە[٢]!! ..

گـوڵ ئـەبینی .. دەمـی (بـرین) دێتـە بەرچـاوی
نـەك برینــێ .. هــەزار بـرین ئەنوسـرێ نـاوی! ..

مـەل بخـوێنێ ... کـۆڕی شـیوەن پـەنگ ئەخواتـەوە
لــەناو ســەریا ئــای ڕۆڵــەڕۆ ! دەنــگ ئەداتــەوە[٣]

بـاڵای درەخـت نـەو نـەمام بـێ . یـا پـیرەدار بـێ
راسـت هەڵـچووبێ، یـا شـۆڕەبی قـەراخ کـەنار بـێ

ترسـێنەرە .. چـونکە پـاییز کــە خــەزانی کــرد
جوانەمەرگان دێنە یادی کە بە دەستە مرد[٤]!! ...

---

(1) ئەستێرەکەی دزی کاروان : ئەستێرەیەکی گەشە و واباوە گوایە سەر لە کاروانـچی تێك ئەدات، لەبەر ئەوە پێی ئەوترێ : ئەستێرەی کاروان کوژە .
ـ خشتەبەرە : تەفرەدەرە. هەڵخەڵەتێنەرە .

(2)جادوگەر : مرۆڤی فرت و فێڵاوی . ئەوانەی چاوبەست لە خـەڵکی سـادە و سـاویلکە ئەکەن و هەڵیان ئەخەڵەتێنن

(3) ئای ڕۆڵە ڕۆ : ئاوازێکی تایبەتی غەمگینی گریان یان شوێنە .

(4) چونکە پاییز کە خەزانی کرد: چونکە پایز کە گەڵا ڕێزانی دەستپێکرد

قەدی چەمی رەنگاورەنگی پەلکەزێرینە
لای ئەو یادی فوارەی خوێنی رژاوی قینە[1]

بێ درێژە ... سروشت چەندە رازاوە و جوان بێ
درەو شەدار ، دڵفڕێن و پۆپی ئاواز بێ

کوورەی خەمە ، دەسگای دەردە ، پشکۆی
سووتانەمایەی ( هەنسک) و (ئاخ )ی مەیدانی ژانە[2]

بۆ ئەوکەسەی تاقە شەوێ ، شەو لە شەوانی
نرخ و فەڕی گەرم ، گوڕی فرمێسک بزانی

ئەی شەوەزنگ ئەی تاریکی ، جێگای ئارامی
جەستەی کفتی پڕ لە خوێنی زام لەسەر زامی

ئەم ولاتە دێرینەیە.. ئەم گەلە کۆنە
تۆی ئاوات.. بۆچ رەنگ و رووت لە راستی مۆنە ؟

---

(1)پەلکە زێریینە : لەناو شاری سولەیمانیا زاراوەیەکی میللیی بەناوی پرچی ئایشی و فاتمەوە بەکار دێت.

(2)هەنسک : مرۆۋ لەکاتی خەم و پەژارەیەکی خەست و گرانا بە دەم قولپی گریانەوە هەناسە ئەداو بەوە ئەوترێ : هەنسک هەڵدان .

تۆی ئاواتی، تۆی کونجی مەنگ ( مەرزی ) سکالآی
پڕ پێستێتی ، تاریکی رەش ببڕە بەبالآی! ..

بەڵکو ... لەپاش کەوتنە ناو دەریای رەشایی
پەل ببزێوی بۆ تروسکە .. خنکا و ئاسایی

لەگەڵ تاڵی ( سەفیدەی ) سەر چیای نیشتمان
تینی ( خزمی ) تەوژمی ( کەس ) بێتەوە گیانمان[١]

بەسەریەکدا کە هاتنەوە سەر بیر و سەرفام
تێر برێژین کوڵی دەروون ، گریانی ئەنجام[٢]! ...

ئەوسا ئەڵێین ... بۆ کۆچکردوو و چاڵی پڕ ئێسک
ئای چەن خۆشە ئاو و هەوای بە هەشتی فرمێسک

***

---

(1)سەفیدە: (سپی ، سپیایی ، رۆشنایی ...) لێرەدا لە تاڵی ئەو رووناکییەیە کە لە بەفری سەر چیای نیشتمانەوە ئەبینرێ.

-(خزم )، کەس : تینی خزمایەتی و تەوژمی کەسەیاتی بە واتای پەیوەندی رۆحی نێوان خزم و خوێش و هەست بە کەسایەتی کردن دێت .

(2)هاتنەوە سەر بیر و فام : واتە هۆش و بیری هاتەوە بەر

# پەلکە زێڕینە

۱۹٦٦

بەهار .. بێ ئاو ..بێ بارانی نیسانە
شەونم زادەی قورولی پڕمەی گریانە

وەنەوشەی شین بەرگی شینی پۆشیوە
نێرگس خشڵی زەردی خەمی کڕیوە

سەرچاوەکان بێ هاڕەن و بێ هاژەن
پۆلی مەلان بێ جیوە جیو بێ قاژەن[١]

زۆر دمێکە بڕۆی پەلکە زێرینە
شاردراوەی پەچەی تەمی دێرینە[٢]

چرۆی درەخت گرژ و لێو هەڵقورتاون
ساڵ درەنگە و لە پێکەنین تۆراون

بەهار زویرە پایز ئاسایی چارە
وەکو (جوانێ) نەخۆشکەوێ دیارە[٣]

---

(1) پۆلی مەلان بێ جیوە جیو بێ قاژەن : واتە پۆلی مەل و باڵندەکان بێ جریوە جریوە و دەنگ و بێ قاژە و قیژەن.

(2) شاردراوەی : واتە شاراوەتەوە ، دا پۆشراوە.

(3) بەهار زویرە: واتە بەهارێکی وشك و برنگە ئەمەش نیشانەی پەستی و پەژارەیەتی.

- پاییز ئاسایی چارە : واتە پاییزیش بەشێوەیەکی ئاسایی و سروشتی خۆی رەنگ زەرد و ماتەمە.

ئـــەی شـــەپۆلی خەلـــەی قوتابخانـــەی ئـــەم
ئـەم سـەردەمەی لێوا و لێوی پیاڵەی خـەم[1]

ســـــەرنجی هـــۆ بــــە ئێـــوەوە بەســـتراوە
هـــۆی باوکـــەکان لـــە گـــەردنتان نـــراوە[2]

ئێـوەش لەبــەر ... گەشــەی بــەهاری ژاکــاو
لەبــەر دەنگـــی تاڤگــەی قەڵبــەزی نووســاو

لەبـــەر جـــوانی روخـــساری ئـــەم وڵاتـــە
کـــە بـــووکێکی نـــەمری رۆژ هەڵاتـــە[3]

دەیخـــوێنن .. بـــا بەخوێنـــدن.. بـــەفێربوون
بـــا بەهونــەر بەتێگــەیین لـــە گـــەردوون

هـــۆی دەرد و دووی بـــەهاری پـــێ دیارکـــەین
ســـەیرانەکەی بەهارەکـــەی جـــار جـــار کـــەین

*****

(1) خەلەی قوتابخانە: مەبەست لە خەرمانەی بیروباوەڕییکی دیاری کراوە

(2) هۆ: پەیوەستی ، بەلگەی پەیوەستی و پێویستی

(3) کە بووکێکی نەمری رۆژهەلاتە: کوردستان بەهەشتی زەمینە و بووکی رازاوەی رۆژهەلاتە.

# تـــــاوان

١٩٦٧

تـــاوان مـــەردی و تـــاوان بـــاری ئاســـانە
زۆر کردنـــی .. مایـــەی پایـــەی گرانـــە !..
کـام ســەر بـەرز و کـام مـل راسـت و بڵنـدە
بـە یـەك ( مـشت ) نـەوی کردنـی بەنـدە!
چـەن دەسپاکبێ ، چـەندەی تـر دڵ خـاوێن بـێ
پـارە ناکـا .. ئـەبێ دەسـتەوداوێن بـێ
بـۆ ئـەو کەسـەی لـە پـشتەوە ئـەتپێکێ
لەچـاوی ( ئـەو ) ئـەبێ هەڵبـدەی پێکـێ[1]
بـە رۆیینـی بـۆ پاشـەوەی سـوێندخۆر بـێ
چـەپڵەکوتی ساخـتە کـەری سـەد جـۆر بـێ
ئـەبێ بـە دز بـە خواوەنـدی فێڵبـازی
بڵێـی گـەورەم .. هـۆی سـەربەرزی و شـانازی
کـام جـێ بۆگـەن کـامی هێجگـار ناخۆشـە

---

(1) لە پشتەوە ئەتپێکێ : لە پشتەوە نیشانە ئەگرێ و تێت ئەسەرەوێنێ و نیشانەکە ئەیگرێ.

ئەبێ بڵێی ( بەه‍ـ بەه‍ـ ) لەم بۆنە خۆشە
ئەبێ بە ڕۆژ کە چەن ڕووناك و پاکە
بڵێی شەوە زۆر تاریك و سامناکە
تاوان بەرزی و تاوانبار نرخدارە
مایە یەك و دەستکەوتنی هەزارە!
ئەی نازەنین ، ئەی دوور لە دووی ئەم شارە
ساڵ لەگەڵ ساڵ هەر خۆزگە بە پێرارە
بۆ رابردوو ، لەکاتێکا بەهار بوو
جێی زەماوەن کارێزی بەربناربوو[1]
نازدارەکان جەستە بە وێنەی هەردە
رازاوە بوو وەك گوڵی ئەو لای بەردە
بۆ نازداری و روخساری شەنگی ئەوان
سووراوی کاڵ ئەڕژایە دەم ئەرخەوان
هەنگ هەڵئەفڕێ بۆ هێنانی هەلاڵە
بۆ هەنگوینی سەر لێوی وەك گولاڵە
دەنگی بلوێر، سۆزی بەستەی دڵداری
خەمرەوێن بوو بۆ شەوگاری بێداری
زێڕی نێرگس بە خەروار هەڵڕژاو بوو

(1)کارێزی بەر بنار بوو : مەبەست لە کارێزەکانی بەر بناری شاخ و گردەکانی سلیمانییە.

چـەپکی بـۆ سـەر ، تـەلی لەسـنگ درابـوو[١]
لووتکـەی بـەرزی مەشـخەڵی گـڕ لـە مـستا
چـراخان بـوو بـۆ ئاهـەنگی ئاوێـستا[٢]
ئاسمـانی شـەو پـڕ چـریکەی یـەزدانی
خـواکردە بـوو نـەورۆزی نیـشتمانی
ئـەی نـازەنین، ئـەم وڵاتـە شـیرینە
ئـەم شـاخانە، ئـەم دیمەنـە رەنگینـە
جـاری جـاران مەڵبـەنی جـوامێری بـوو
پـڕ لـە فرکـە و بازرەقـەی شـێری بـوو[٣]
کەچـی ئێـستا هـەموو شـتیێ گـۆڕاوە
رەش و سـپی لـە جێـی یـەك دانـراوە
گـوڵ بـۆ ئـاگر خونـچە بـۆ نـاو توونخانـە
درکوداڵیـان هێناوەتـە ئینجانـە[٤]
هێجگـار سـەیرە ( خـوم ) سەیر تـر شێواوە

(1) بە خەروار : بەخەربار ، لە خەرمانەیەکی زۆر فراوانەوە هاتووە.
(2) لە مستا : لە مشتا ، لەناو دەستا
(3) پڕ لە فرکە و بازرەقەی شێری بوو : واتە سەفتە شێری تیا بوو .
(4) شاعیر مەبەستی لەوەیە کە نرخ و بەهاو رێز و مـەنزڵ تێك چووە و شـێواوە هـیچ شتیێ لە شوێنی سروشتی خۆی نەماوە ئەوەتا لە بریتی ئەوەی گوڵ لەناو ئینجانـەدا دابنریێ ئەو گوڵانە فڕیدراونەتە ناو ئاگر و توونخانەوە و درك و داڵیش لەناو ئینجانە

لەش بۆ نەهەنگ ، کەشتی بۆ ناو گەرداوە[1]

ئەی نازەنین .. هەر دوو بەرگ خوێناوین

هەر دوو بە کوڵ بۆ ئەم کوردە گریاوین

گریانێکی لە داخانا.. نەك ترسان

لە بێگانە ، بۆ دوژمنی لە خۆمان!

بۆ ئازاری جەرگبڕ و بۆ ئێشی

دار پوازی لەخۆی نەبێ ناقڵێشی!

بۆ.. وەکو (کەو ) لەسای دەوەن بە خوێندن

هاو تیرەمان رابکێشین بۆ مردن!

ئای کە نەنگە ئای کە ئابڕو تکانە

کە گەورەیە ئەنجامی ئەم تاوانە[2]

*****

(1) خوم : رەنگێکی شینی تۆخی دەست کردە و جاران بۆ رەنگ کردنی جل و بەرگ بەکار ئەهێنرا و بەزۆری ( خام ) لە خوم هەڵئەکێشرا

(2) نەنگە : خەوشە . عەیب و عارە ، شوورەییە

# سلیمانی(*)

## ١٩٦٨

مـــــامزی نـــــاو قامیـــــشه‌ڵان
گوێـــچکه‌ی تـــه‌پی بـــۆ راوه‌شـــان(١)
وه‌کو (شۆخێ )

ملـــی بـــه‌رزی بـــۆ هـــه‌ڵبڕێ
نیگـــای ره‌شـــی بـــۆ دوور فـــڕێ

له‌کـــه‌ڵی بـــه‌رده‌می خـــوڕی(٢)
به‌مرقـــه‌ی ... باڵنـــده تـــه‌ڕی

---

(*)مه‌به‌ست شاری سلیمانی ئێستایه که له‌لایه‌ن ئیبراهیم پاشای بابانه‌وه به مه‌به‌ستی گواستنه‌وه‌ی پایته‌ختی بابان دامه‌زرێنراوه ... شاری سلیمانی که به یه‌کێ له هه‌ره شاره پێشه‌نگ و قه‌شه‌نگه‌کان ئه‌ژمێردرێ له‌ساڵی ١٧٨٤دا دروست کراوه ، له‌چاو کورتی ته‌مه‌نیا پێشکه‌وتنی بێ هاوتا و داهێنانی نوێی له‌تێکڕای بواره‌کانی ژیانی ئه‌ده‌بی و رۆشنبیری و سیاسی و کۆمه‌لایه‌تی و سه‌ربازی و ئابووری و ئاوه‌دانی و شارستانیه‌تی بۆ خۆیه‌وه بینیوه که جێی سه‌رنج و رامانی دۆست و نه‌یاری کورده. !!..

(1)ـ مامز = ئاسك .

ـ گوێچکه‌ی ته‌پی : گوێچکه‌ی شل و شۆڕی

(2) که‌ڵ : ئاسکی که‌ڵه ، واته ئاسکێکی نێری قه‌یره و به‌هێز

وتـــی: هەســـتە خرمـــەی ســـوارە[١]
دەســـــە جڵـــەو بـــەرەو خـــوارە

وا دیـــــارە بـــــە ســــــەدهەزارە
ڕێـــــچکەی لەشـــــکری دواییـــــە
دەنگـــــی تـــــەپڵی پاشـــــاییە[٢]

سەرچنار:
مـــــامزی نـــــاو قامیـــــشەڵان
سمـــی تیـــژی لـــە زۆنـــگ چـــەقان[٣]
لەســـــەر چـــیمەن جێپێـــی دیـــارە
لـــووتی (ڕەوەی) بـــەرەو خـــوارە[٤]
بەگوومەتـــــــە و زاق و بـــــــاز
دوورکەوتـــەوە لـــە تـــیر و بـــاز[٥]
کـــــاتێ گەیـــــشتە سەرچـــــنار

---

(1) خزمەی سوارە : واتە خرمەی ناڵی پاشنەی وڵاخەبەرزەیە .

(2) دەنگی تەپڵی شایە : جاران وا باو بووە کە پاشاکان روویان لەهەر لایەك بکردایە پێشەنگی پاشا تەپڵیان لێئەدا .. وادیارە کە لەکاتی هاتنی ئیبراهیم پاشاش بۆ دامەزراندنی شاری سولەیمانی تەپڵی پاشایانەیان لێداوە .

(3) سەرچنار : هاوینەهەوارێکی خنجیلانەی قەشەنگە و نزیکەی سێ کیلۆمەتر لەشاری سولەیمانییەوە دوورە و کەوتۆتە رۆژ ئاوای شارەوە .

- سمی تیژی : نووکی پێ ی ( ئاسك ) ە

(4) رەوە : بەکۆمەڵە ئاسك ئەوترێ .

(5)باز : ئەو باڵندەیەیە کە پاش پەروەردەکردنی بۆ راوکردن بەکار ئەهێنرێ

دی .. پەیکـــەری جـــوانی بـــەهار
جەســــتەی شـــەنگی رازایـــەوە
سروشـــــتی تیـــا حەســـایەوە!
ئیستێکی کرد ...
قۆچـی بـۆ سـەر قەپرغـەی بـرد[1]

وتی : مەڕۆن
روخساری شەو..
بـــەم ئـــاوی ژیانـــە بـــشۆن[2]
تـــازە تـــیری ســـوارەی بـــەیان
تێناپـــەڕێ لـــە کانێـــسکان[3]

تێناپـــــەڕێ ناگاتـــــە نـــــاو
رەوەی تـــەڕەی لانـــە شـــێواو!

(1)ئێستێکی کرد : هەڵوێستەیەکی بۆ کرد ، کەمێك وەستا ، راما
قۆچی : شاخی . قەپرغەی : کەلەکەی
(2) روخساری شەو : شێوەی شەو. بەم ئاوی ژیانە بشۆن : وەك دیلان خۆی ئەڵێ :
ئیشارەتە بە قەسیدە بەناو بانگەکەی نالی قوربانی تۆزی رێگـەتم ئـەی بـادی خۆش مرور .
(3) کانێسکان : لـە کـانی ی ئاسـکانەوە هـاتووە و ئێـستا گـەڕەکێکی گەورەیـە لـە ناوەڕاستی شاری سلیمانی .

شاری تازە:
بۆ بەیانی
بۆ سبەینێ .. مامز روانی
تەقەی تەورە..
ئەگرمێنێ .. ئەڵێی هەورە
ئەبارێنێ پەلی پەراو

بەبار ... بەتاو
دار بڕینە
لەهەموو لا هەڵپەڕینە[1]
گوریس لە دوولا لە دارە
وەك مێروو لە رێچکەی بارە!
ئەی کۆتری تینووی گوێی ئاو
چ باسە لە لانەی شێواو ؟
لاپەڕەیەکی شاردراوە
نیازی شەڕە یاخود راوە ؟
ئەم قیامەتە هەستاوە
ئەبێ دیسان لمۆزی
تینووبێ بۆ خوێنی ئەستۆم! بۆ

(1) دار بڕینە : سەبارەت بەم دار بڕینە ( دیلان) پەنجەی بۆ گەشتەکەی "میستەر ریچ" بردوە کەساڵی ١٨٢٠ هاتۆتە سولەیمانی وتویەتی ( لە عەزیز بەگی مەسرەفم پرسی دەور و بەری شار بۆچی دار و درەختی ئەوەندە تیانییە؟ . وتی : تا تاسلووجە هەمووی دار بوو ، بڕا و شاری سلیمانی پێ دروست کراوە .

سووتاندن بۆ خنكاندن،
بۆ درەختی زل پەڕاندن[1]
یا هەمدیسان گورگی...
برسییە بۆ لەش و جەستەم؟

ئەبێ چی بێ..
ئەبێ چەن گوڵێ هەڵوەری بێ
وا باخەوان وێنەی جاران
کەوتۆتە دەنگدانی یاران .[2]! . ؟
وەڵام:
ئەی مامزەکان .. گوێچکە هەڵخەن
شاختان لەناو شاخی کەڵخەن
شەڕە قۆچ کەن...
ئەوا پایتەخت...
گوێزرایەوە بۆ شوێنی تەخت
بۆ ئەمسدیوی قەڵاچۆلان[3]!.
بۆ تەنیشتی گردی سەیوان

---

(1) بۆ درەختی زل پەڕاند : وەك "دیلان " ئەڵێ : ئیشارەتە بۆ قەسیدەکەی "سالم " لەوڵامی "نالی" یا کە ئەڵێ : ( ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخسیش ئەدا زەرەر ).

(2) باخەوان : خاوەن باخ ، ئەوەی پەروەردەی باخ ئەکا و لە ئافات ئەیپارێزێ ، لێرە مەبەست خاوەنی ئەمارەتی بابانە، واتە حاکمی بابان .

(3) قەڵاچوالان : شارۆچکەی قەڵاچۆلان بەر لە سولەیمانی پایتەختی کۆنی ئەمارەتی بابان بووە ئەکەوێتە نێوان زنجیرە چیای ئەزمڕ و چوارتاوە نزیکەلە ژوورووی شاری سولەیمانی ..

شادی:

واشاییە

وادەی ئــــــازار رەهاییـــــــــە[1]

ئـــــــای چــــــەن خۆشــــــــە

هـــــەموو شـــتێ بـــە پەرۆشـــــە

بــۆ ئــــەم کاتـــە بـــۆ ئـــەم ســـاتە

بـــۆ ئـــەم دەوری فـــەڕ و هاتـــە[2]

وا بەڵقیـــــــسی دار ئەرخـــــــەوان

بـــەبووك بـــرا بـــۆ ســـلێمان[3]!

ناسۆرۆداخ

ئەی نازەنین

خـوای دەم و لێـو.. خـوای پێکـەنین

بەو یادەوە ، ...

دەســـت و پەنجـــە بـــە بـــادەوە

بێنـــە جـــامێ لـــەو شـــەرابە

---

(1)وادەی : کاتی ، ساتی ـ ژووان .

رەهایی : بەفراوانی ، بەربڵاوی

(2)دەوری فەڕ و هات :

دەوری : دەم و کات و زەمانە ، واتە کاتێکی لەبار و گونجاوە .

(3)بەڵقیس : "دیلان " ئەڵێ ناو هێنانی ئەم بەڵقیسە، لە شیعرەکەی پیرەمێردی نەمرەوە هاتووە کە ئەڵێ : بەیانی بوو لە خەو هەڵسام کە روانیم بەفرە باریوە سولەیمانی ئەڵێی بەڵقیسە تارای زیوی پۆشیوە .

مـــــەزەم لايـــــە .. دڵ كەبابـــــە !.
بۆ رابردوو
بـــۆ خـــەوێكی لـــەدەس دەرچـــوو!
ئەوا ئێستا ...
گيـان ناسـرەوێ لـەناو پێـستا! .
لـەكێ ........ پـرس كـەين... ... كـام
ســـــەری تــــازە وەڕس كـــــەين.؟
بۆمان باسكا ، ...
تۆســـــقاڵێ مێــــشكمان كاســـــكا
دڵـــی ( يـاقووتی ) ئـــەم شـــارە
بــــۆ وا بۆتــــە پـــــارە پـــــارە[1]
بـــــەرگی ئـــــەم مـــــەرزە رەنگينـــــە
بــــۆ وەكــــو پـــــيرۆزە شــــينە ؟[2]
*****

(1) لەهەردوو ئەو بەيتە شيعرەی "ديلان "دا پەنجە بۆ ئەو شا بەيتە شيعرەی مەحوی براوە كە ئەڵێ :

( لەكێ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە ياقووت
عەزا پۆشی چيـيە وكێيە جلی پيرۆزە بۆ شيـــــنە؟)

(2) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# پێشەکی : ( پایزی جاران )
# (دیلان )ی شاعیر

**عەبدوڵڵا ئاگرین**

**١٩٧٣/٤/٥**

بریا ئەو داواکارییەی مامۆستا (دیلان)ی شاعیر بەر لە ئێستا بوایە ، تاپێ بەپێ ی توانا هەندێ باری سەرنجم لە رووی بەهرەی داهێنانی شیعریی لەم بەرهەمە نوێیەیدا دەر ببڕیایە و لە کڵاوڕۆژنەی رێچکەی رێبازە ئەدەبیەکانەوە بەراوردێکی ورد و قووڵم بکردایە و بێلایەنانە پەنجەی راستیم بۆ ئاستی بەرەو پێشچوون و تازەکردنەوە لە شیعرەکانیا درێژبکردایە و تەنیا بە سەرنجدانێکی ئەئاوا سەرپێیی کاسە ئاردی خۆم دانەکوتایە، بەوەش ئەوەم نەگەیاندایە کە (دیلان) لەم پیاراپەرمونەیدا زەینی بەهەڵەدا چووە !.. بەرکوڵ کردنی نۆبەرەی ئەم بەرهەمە نوێیە هەربەتام و چێژی سەر زمان تەواو نابێ ، بەڵکو پێوانە و کێشانەیەکی راست و دروستی تەواوی پێویستە هەموو بەهرەدار و هەڵکەوتووەکانی ئەم جیهانە چەند ریزە وشەیەك بە خوێنەوارانیان ناناسێنێ، توانا و کارامەیی و بەهرەدارێتی شایستەی ناو هێنانیان ئەکات . با لە باسەکە دوور نەکەوینەوە و بێینەوە سەر (دیلان) کە تەرزی وشەی رەزی ناسك و نوێ لە دێرەوە هاویشتووە و جێگایەکی تایبەتی لە ئەدەبی کوردیدا گرتووە.

بە بڕوای من سەرەتای واتەی ئەدەبی زیندوو لەو دەروازە یەك والایەوە سەیر ئەکرێ کە ئەدەبەکە باوەش بکات بە سەردەمە

داهاتووەکاندا و ئازایانە خۆی ڕاپسکێنێ لە چنگ مێردەزمەی مەرگ و ژیان بۆ خۆی مسۆگەر بکات ، جۆر و بابەتی ئەدەبەکە سیاسی بێت یان کۆمەڵایەتی یان دڵداری هیچ لە پارسەنگی قورسایی ئەم تەرازوە کەم ناکاتەوە. شۆڕ بونەوە بەناخی باسێکی وا چڕو پڕ و تەنراودا پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تەڕ و پاراو و تێر و تەسەلی زانستیانەیە، بڕیاردانێکی گۆترە و کتوپڕی بێ بنچینە کارێکی پەلەی نابەجێ و ناڕەوایە، باشتر وایە لەم جۆرە شیکردنەوە و لێکۆلینەوانەدا سەرجەمی جەمسەری لایەنەکانی: بەهرەی داهێنان ، تازە کردنەوە ، قووڵ ڕوانین ، کارامەیی لە وردەکاری دارشتندا بەهێز و پێزی لەواتا و ناوەڕۆکدا فەرامۆش نەکرێ و جیا نەکرێتەوە لە ژیان و فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ، باشتر وایە بە وردی بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو لایەنانەی دانویان بەیەکەوە ناکوڵێ و شەقڵی کەم و کورتیان پێوە دیارە. کەواتە هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی هەر باسێکی ئەدەبی و هونەری و تەنانەت زانستیش تەنیا لە ئاسۆی ئەو کەلەوە سەر دەرناهێنێ کە بوترێ: بەرهەمەکە بەرهەمێکی چاکە و بەرز و بێ هاوتایە و شاخی وایە و باڵی وایە، یان بەپێچەوانەوە بەسەر و پۆتەلاکیا بێیتە خوارەوە!.

بەڵێ بەلای منەوە هەر باسێك توخنی ئەو جۆرە پیاهەڵدان و سەروپۆتەلاك شکاندنە رووت و قووتە بێ بنچینەیە بکەوێت هەر بە لێدانی بایەکی سەر رووی زەوی جوانەمەرگ و تەمەن کورت ئەبێ و بە نەزۆکیەکی زگماکییەوە ئەو تەمەنە کورتەی ئەباتە سەر . لەبەر ئەوە پێشەکی تولەڕێی هەڵکشاوی رووە و هەورازی ڕێگا بۆ خۆم پاك

ئەکەمـەوە و نامـەویٚ بکەومـە نـاو گـەردەلول و گێژەڵۆکەیـەکی وا بـیٚ ئەنجامــەوە کــە زیــان نەگەیــەنێت کــەڵکی نابێــت ، شــیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی (پایزی جاران ) و بەراورد کردنی لەگەڵ بەرهەمی ساڵانی ١٩٥٨ و ١٩٦٩ی شـاعیر لـە رووی پـەل و تـەرز هاوێـشتنی نوێـوە یـان سەبارەت باری ژیانی نەتەوەییمان شاعیر مەلی وشەی هەست و بیری بۆ کـویٚ ئـەفڕیٚ و شـیعرەکانی چ هـەنگاوێکی نـاوە ؟ ئـەم هـەنگاوە بـە سنگەخشیٚ دێت و لەبەردەممانا قوت ئەبێتەوە .

*****

# هەنگاوێك

لەشـــــــاخێكا ... دەروون و دڵكـــــــوێران
لـــە خرســـانا یـــەك و دوو هەڵئـــەدێران ..!
بـەرەو پێدەشـت ئـەڕۆیی بـێ سـەر و شـوێن .
لـــە وەردێكـــا هورمـــژی تیـــژی گوللـــە
گـــەرای مـــەرگی ئـــەنا وەك پـــۆلی كوللـــە
لـــە شـــارێكا كـــە گیـــان باســـی نـــەما بـــوو |
ســـەمای لاشـــە لـــە جێگـــای ســـینەما بـــوو .

بەڵێ ئەبوو من لەو هەوارگەیەی سەرەوە پەنجەم بۆ گوێ دڵ و خونچەی هەستی دەم و كراوی شیعرەكان درێژبكردایە ، بەڵام بەداخەوە كاتێ داوای ئـەم نووسـینەی لێكـردم كـە (پـایزی جـاران)ە بـە هەڵـەداوان روەوچاپخانە ملی ئەنا، ماوە و كاتەكەش هێنـدە كـەم بـوو كـە نـەتوانم ئەم چەند دێڕی نوویسنەم لە شێوەی روونكردنەوەیەك بـەولاوە بـترازێ ... بـەو نیـازەی رازی دڵـی پـەنگخواردوم لـەدوو تـوێی نـانێكی گەرمـدا هەڵگرم بۆ كاتێكی تر ئەگەر دەرفـەتێكی باش رەخسا لێیـان بدوێم .. بەرهەمی تازەی (پـایزی جـاران) بـێ رێ پاكردنـەوە پێشـەكی بكەوێتـە چنگ خوێنەوارانی كورد و خۆشیان سەرپشكێكی بێ لایـەن و دڵسۆزبن بۆ راستی ئەم دێڕەم .

**عەبدوڵڵا ئاگرین**
**سلیمانی ١٩٧٣/٤/٥**

# پایزی جاران

**١٩٦٨**

ئەکەوتە ڕێ هەوری پەڵەی پاراو و تێر
بەفرمێسکی بای بە پەلەی لای گەرمەسێر[1]
تیژڕێ و ڕوو بەپەرۆش بوو بۆ سەر چیا
بۆ سەر پووشی زەرد هەڵگەڕاو.. جاران گیا
جارانی سەوز ، سەر ڕازاوە بە مرواری
بە شەونمی بەهاری لای کوردەواری
جارانی مەست بەبۆنی شەرابی بەهار
پیاڵەکەی پەڵەی گوڵ بوو تا دەم نزار
سنگ کوتەر بوو ، تەکان دەر بوو وەکو لاوێ
لەڕێگای ئاواتی چەن ساڵەی جێماوێ[2]
جاران ئاژەڵ ڕووە و پەچە و بەرە و کۆز بوو

---

(1) هەوری پەڵەی پاراو و تێر: مەبەست لەو هەورەیە بارانی بەدەمەوە ئەبارێ
پەڵە: ئەو زاراوەیەیە کە بۆ بارانێکی دوو شەو و دوو ڕۆژی بەردەوام یا زیاتر بەکار دێ و بەو بارانە زەوی نەرم و تێر ئاو ئەبێت و جوتیار و وەرزێرەکان بەئاسانی ئەتوانن زەویەکانیان بکێڵن و تۆوی گەنم و جۆی پیا بوەشێنن .
گەرمەسێر : شوێن و جێگای وڵاتی گەرم: لای خۆشمان گەرمیان بەکاردێت
(2) سنگ کوتەر بوو : واتە سنگی بۆ پێشەوە ئەکرتا.. یا بۆ پێشەوە ئەچوو

ڕۆژگـار کـورت و چـاو خـەواڵووی وەنـەوز بـوو[1]
شوان کۆڕی شەو گەرمکەربوو بـە فـووی شمشاڵ
جوڵـەی ئـەدا بـە دەمـاری هەسـت و خـەیاڵ
پاشـان نـۆرەی بەسـتەی دەمـی هـەرزەکار بـوو
ئامـان ئامـان بـۆ سروشـتی کردگـار بـوو ...
بەسـتە ئـەڵێن ئـەوی ئـەیڵێن نایڵێنـەوە
تـا کـەیبانوو لـە فرمـانی شـەو ئەبنـەوە[2]
شـەوی جـاران شـەوگاری پـایزی درێـژ
تـا سـوورایی ئەپەڕییـە چـاوی گێـژ و وێـژ
بەسـتە ئـەڵێن ئـەوی ئـەیڵێن نایجوونـەوە
تـاکو بێـدار لـە گریـانی شـەو ئەبنـەوە.. !![3]

---

(1) پەچەو کۆز : چەپەرێکی تایبەتییە لە شوێنێکی بەربڵاوی بەرەڵڵادا لە قـامیش یـا درکەزیٚ وەیا دار بەڕوو دروست ئـەکرێت و مـەڕ و مـاڵات بەشـەو تیایـا ئـەپارێزریٚ و ئەحەوێنرێتەوە .

ڕۆژگار کورت و چاوی خـەواڵووی وەنـەوز بـوو : پـایز ڕۆژ ڕووەوکـورتی ئـەڕوات و شـەو درێژ.. کە ڕۆژئاوا ئەبێت شەو دادێت و چاوی خەواڵوش وەنەز ئەبیاتەوە

(2) کەیبانوو: بەو ئافرەتە ئەوتریٚ کـە کاروبـار و گـوزەرانی ناومـاڵیٚ بـەڕێوە دەبـات و رایان ئەپەڕێنیٚ هەر بۆیە کەیبانووی دەرەوە و دێهاتنیشینەکان بەهۆی کاروبـارێکی زۆرەوە تـا درەنگـەوەختیٚ لـەکاری دەرەوە نابێتـەوە و زووبـەزوو بـۆ ماڵـەوە ناگەڕێتەوە.

(3) نایجوونەوە : نایڵێنەوە ، دووبارەی ناکەنەوە .

ـ بێدار : ئەوی خەو لە چاوی ئەتاریٚ ، ئەوی بە ئاگایەو نەنووستوە .

شـەوی جـاران خۆشەویـستی دەسـتی رێـز بـوو
بـازووی مـەردی لـە مـل و گـەردن ئـاوێز بـوو
هەسـتی فرمـان رێکخـستنی رێـچکەی ژیـان
گوزەرانی ئاسودەیی و ئاڵ و گوڕی سادە و نیان[1]
یاسـایی بـە نـرخ و گرانـی ئـەم خەڵکـە بـوو
بـیٚ فرمـانیش فرمانـداری ئـەو کەڵکـە بـوو .
شـەوی جـاران شـەوگاری پـایزی درێـژ
تـا سـوورایی ئەپەڕیـە چـاوی گێـژ و وێـژ
ئـەم وڵاتـە پـڕ لـە پیـت و پـڕ سـامانە
جێگای فەڕ بوو پـڕ بـوو لـە شـەقڵی پیاوانـە ![2]
ئـەوا دیـسان پـایز هـات گـەڵا رێزانـە
هـەوری پەڵـە رووە و شـاخ بـەرەو کوێـستانە !!
بەڵام ئێستا و شـەوی ئێستا چۆن بەجۆشکەم ؟
گـڕی کـۆڕی سـاردەوە بـوو بەچـی خۆشـکەم ؟

---

(1) رێچکە : رێبار، رێڕەو .
ـ ئاسودەیی: ئارام و دڵنیایی .
ـ سادە و نیان : سووك و ئاسان .
(2) جێگای فەڕ : جێگایەکی بەنرخ ، جێگایەکی بە بەها .
شەقڵی : سیما ، مۆرك ، شێوە.. کە ئەوتریٚ .
( جێگای فەڕبوو پڕبوو لە شەقڵی پیاوانە !) مەبەست لەوەیە کە شوێنێکی بەنرخ و بە ها بوو، پڕبوو لە پیاوەتی واتە شەقڵ و مۆرك و سیمای پیاوەتی پێوە بوو

شەوگاری تاریك و نووتەك چۆن رۆشنکەم ؟
ئەم سەرە گێژ و شێواوە چۆن هۆشن کەم ؟
ئەی هەورەکە دابڕێژە سەری تشرینە
وادەی پەڵە و ناشتنی تەرمی هاوینە[1]
نۆرەی تۆیە بگری بە سەرهەمووماناا
بەسەر ئێسك و پروسکی رابردوومانا
بیشۆرەوە با سەر لەدەسی دیاری بێ
با قوڕ خەستبێ بۆ سەری شەرمەزاری بێ

*****

(1) سەری تشرینە : ئەوە ئەگەیەنێ کە لەسەری مانگی تشریندا پەڵە ئەدا، دیارە لەگەڵ بارانی پەڵەدا ئیدی تەرمی هاوین بەخۆی و گەرماکەیەوە ئەنێژێ.

ـ وادەی : کاتی هاتووە ، کاتی ئەوەیە

# جەمیلی جوانە مەرگ(*)

١٩٥٩

جەمیل جوان بوو

جـەمیل جـوان بـوو... گـوڵ وێنـەی ئـەو ئەنەخـشا
وەکـــو جەســـتەی لـــەو هەردانـــە ئەپەخـــشا[1]

وێنـــەی چـــاوی ئەســـتێرەکان لـــە ئاســمـــان
ئەیانورشـــــان ئەیانپرشـــــان ئـــــەجریوان

کـــام شـــەو رەش بـــوو کـــامی تاریـــك و تـــار بـــوو
لـــەو شـــەوەدا وەکـــو مـــۆمێ دیـــار بـــوو

بەســـتەی دەم بـــوو... هـــەوێن بـــوو بـــۆ گـــۆرانی
بـــۆ شـــەوانی بـــەهاری نەوجـــەوانی ... !

کەرەســـە بـــوو... بـــۆ هەڵبەســـتی دڵـــداری
درەختـــێ بـــوو بـــۆ جریـــوەی پاســـاری[2]

---

(*) جەمیل رۆڵەیەکی ناسراوی شاری سلیمانیو هاوڕێیەکی خۆشەویست و گیـانی بـە گیانی دیلان بوو .

(1) جەستەی : لەشی ، ئازای بەدەنی .

(2) کەرەسە بوو : بابەت بوو ، مەبەست لەوەیە بابـەتێکی شیاوبوو ، بـۆ هۆنینـەوەی هەڵبەستی دڵداری .

ـ پاساری : چۆلەکەی پاساری ، مەلێکی بچووکە

مایەی خورپەی دڵی گەرمی نازدار بوو
ساڵ دوانزە مانگ ئەو هەمیشە بەهار بوو

جەمیل پیاو بوو

جەمیل.. پیاوبوو ، مەردانە بوو ، دلێر بوو
نەترساو بوو ، ڕۆڵەیەکی جوامێربوو . !

ڕەوشتی ئەو (باخێ) بوو... بۆ تێبینی
بۆ نیگاریێ لەکەم کەسدا... ئەبینی[1]

ئەو (پێوانە)ی لای زۆر کەسی ئەم کاتە !
بۆ دونیایان ڕێگای هات و نەهاتە.. !![2]
ئەو (پێوانە)ی پێی ئەوتریێ پارە
لە هەندیێ (قات) بۆ هەندێکیش بە بارە. ![3]

---

(1) باخێ بوو : لێرەدا شاعیر ڕەوشتی جەمیلی بە باخێك چوواندوە کە هەمە جۆر میوەجاتی نایاب و بەنرخی تیایە ... بەجۆرێکی ئەوتۆ کەلە نێوە دێری دواییدا ئەڵێ : تەنانەت ئەوی لە باخی ڕەوشتی ئەودا چنگ ئەکەوت لە کەسانی دیدا بەدەگمەن ئەبینرا .

(2) (پێوانە): ئەندازە و (قیاسی) عەرەبی ئەگرێتەوە واتە پێوانە و بەراورد لە نێوان دوو شت و زیاتردا بەدی دێت .

(3) قات : واتای نەبوون و چنگ نەکەوتن ئەگرێتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی کە هەمان شت دەست ناکەوێت کەچی لای کەسانی دی بەخەرباره .

لای تـــاقمیٚ هێـــز و توانـــا و کـــەس بـــوو
کەچـی لای ئـەو بەوێنـەی چـڵکی دەس بـوو. ! [(١)]

بێجگـە لەمـەش... کـەم کـەس هـەبوو وێنـەی ئـەو
بەرامبـــەر دۆســـت بـیٚ کینـــەبوو ســـینەی ئـــەو

بـــــۆ دامـــــانی ڕۆژی ڕەشـــــی تەنگانـــــە
مـــاڵی سـپی ئـــەو خەڵکـە بـوو ئـەو جوانــە... [(٢)]

جەمیل کورد بوو

جـەمیل کـورد بـوو... ئـاڵودەی تـیٚ کۆشـان بـوو
بـۆ کوردسـتان... گـەرم چـەك لەسەرشـان بـوو[(٣)]

---

(1) چڵکی دەس بوو : خوازەیەکی ژیرییـە بـۆ ئـە. واتایـە بـەکاردێت کـە مەبەسـتێکی ڕۆشن بگەیێنی کە ئەوترێ پارە چڵکی دەستە ، واتە پارە هـەموو شـت نییـە و وەك چڵکی دەست زوو ئەڕوات و هیچ نییە تـا مـرۆڤ ئەوەنـدە کـۆڵی پێـوە بکێـشیٚ و لای هەموو شت بێت .

(2) بۆ دامانی : مرۆڤ لە ڕۆژی ڕەشدا دووچاری تەنگ و چەڵەمەو ناخۆشی ئەبێت گەلیٚ جـار کێـشەکە ئەوەنـدە سـەختە و گرانـە کـە مـرۆڤ نـاتوانیٚ شـان بداتـە بـەری و دەستەوئەژنۆ دائەمێنیٚ و هێز و دەستەڵاتی بەسەر چارەسەرکردنی ئـەو کێشەیەدا ناشکیٚ و بەو حاڵەتە ئەوترێ (دامان) .

(3)ئاڵودەی: مرۆڤ لە ئەنجامی هـەر هۆیـەکی کاریگەرانـە بێـت کـە خـو ئەداتـە شـتیٚ و هۆگری ئەبێت ، ئەوترێ : ئاڵودەی بووە

لــە کاتێکــا... زۆربــەی خــەڵکی ئــەم شــارە
لــــەناو لێـــدان ، حـــەپس کـــردن ، قــــەنارە

دەرگـــای بـــە رۆژ جـــووت و خـــڕ دا خرابـــوو
مـــاڵی ئـــەوان لەســـەر پـــشت و واڵا بـــوو..

داڵـــدەی شـــەو بـــوو بـــۆ هاوڕێگـــا و هـــاوبیری
پـــەنایێ بـــوو... بـــۆ رزگـــار بـــوو لـــە تـــیری[1]

ســـــوتێنەری ســـــەوز و وشـــــک بـــــە جـــاریێ
پڕکـــــەرەوەی قوڵـــپ و چـــاوەی بـــەهاریێ.. !

جــەمیل کــورد بــوو.. بــۆ ژینــی کــوردەواری
لەڕێـــــــدابوو نەیئـــــــەزانی بێـــــــزاری

ئـــەم دواییـــەش کـــە کەوتـــە دوا هەناســـەی
ئـــەم وشـــانەی ســـەری ئـــەکرد بـــە تاســـەی.

*****

(1) داڵدەی : پەنادەر : هەرکە یەکێ لێی ئەقەومێ و کەسێکی دی پەنای حەسانەوە و چارەی لێقەوماوەکە ئەدات بەوە ئەوترێ : داڵدەدان .

# ساخوات لەگەڵ

۱۹٦۹

سا خوات لەگەڵ... ئەی دراوسێی شیرینم
ئەی براکەم... ئەی هاورێکەی دێرینم.. !

ئەی غەمخواری ڕۆژانی بەدبەختی من
وەی بێداری شەوانی سەرسەختی من.. !

تۆ... ڕۆیشتی... با بزانین لە دوای تۆ
نووکی خامە بۆ کێی ترمان ئەڵێ... ڕۆ..

بۆ کێی ترمان هەنسکی نیوە شەومان
خرم ئەگرێ... گڕ بەربەدا لە خەومان.. !

بۆ کێی ترمان.. گەرووی بانگی تاساومان
ئەنووزێنێ بۆ چارەی هەڵاوساومان.. !

ئەکورکێنێ... بۆ ئێمە .. بۆ کورد ئەگری.. !
بۆتۆ ئیگرێ.. بۆ ئێمە.ز بۆ کورد ئەگرێ.. !

تاو تاو ئەگری.. بەکوڵ ئەگری.. پڕئەگری
بۆ ئەنجام، بۆ قسەی سارد و سڕ ئەگری .

# چیرۆکیٚ

## ١٩٦٩

شـــەوەکی بـــوو.. رێـــی گرتەبـــەر
فرۆکـــــە ئـــــەهات وەك تەتـــــەر[١]
هـــەر چـــوار ســـوقاقی ئـــەم شـــارەی
ئـــەکرد بـــۆ چـــاری ئـــەم بـــارەی[٢]
گزنگ..
ئەکەوتــە ســەر لوتکــەی پیرەمــەگرون[٣]
ئـەم ئەچـووە بـەردەم پنـەو سـەر نـانکردن
وورد وورد.. تیرۆکـــــی ئەوەشـــــان[٤]

---

(1) تەتەر : پەیامبەر ، نامەبەر... مەبەست لە تیژرۆیی ئەو کەسەیە کە وەك نامەبەر بەفرۆکە و خێرایی کارەکەی بە ئەنجام ئەگەیەنیٚ .

(2) سوقاقی: کە ئەوتریٚ هەر چوار سەقاقی شار . بەواتای هەر چوار کونج و کەلەبەر و دەوری شارە .

(3) پیرەمەگرون: مەبەست لە چیای پیرەمەگرونە کە ئەکەوێتە ژووروی رۆژئاوای شاری سلیمانییەوە و بە بەرزترین چیای پارێزگاری سولەیمانی دائەنرێت .

(4) پنە : لە کۆمەلگای کوردەواریدا و لە ناو ماڵ و خێزانەکاندا نانی تیری ئەکرێت. ئەو نانە لەسەر (پنە) ئەکرێتەوە و پنەش لە گەچ یان دار دروست ئەکرێت، لە هەندیٚ شوێن (خوانە یان فەرشە)ی پیٚ دەڵێن.

ـ تیرۆك : دارێکی باریکی لوولەییە و نانی پیٚ ئەکرێت

بەهەوای شان...
بەڵام... نانی مرۆزاوی
پێزی نەبوو
پەستا پەستا خۆی لێئەدا
هێزی نەبوو...

سەر لێ شێواو
وەك نێچیری رێ لێتەنراو.. [1]
وەك گوڵاڵەی نێرك كردوو
تەمەن بەرەو مایس بردوو..! [2]
هەرچی ئەكرد.. چارەی نەبوو
ناوشانی ئەم بارەی نەبوو.. !
چەندساڵێ بوو... ئەهات.. ئەچوو
جار جار چەن شەوێ ون ئەبوو..
جل شۆر بوو، كارەكەر پیشە
بە قوڵایی دەردی سەری

---

(1) ڕێ لێ تەنراو : رێ لێ گیراو بە جۆرێكی ئەوتۆ كە دەرفەتی دەرچوون و دەربازبوون نەبێ
(2) نێرك كردوو : گوڵاڵە لە مانگی مایسدا پەڕەكانی سیس ئەبێ و هەڵئەوەرێ ، چونكە دنیا بەرەو گەرما ئەڕوا بۆیە نێرك ئەكات و بۆ داهات خۆی دائەكوتێ

نـــاو دەروونـــی ریـــشە ریـــشە.. ! ! [1]

ئـــەم کلۆڵـــە...ئـــەنجامی شـــووی

بریتـــی بـــوو لـــە باســـك و فـــووی[2]

بیوەسـێنیٚ... گـرِی پـیٚ هەڵبگیرسـێنیٚ

تـــا شـــەو تـــاریکی دادێنـــیٚ... ! !

ئـــیتر... ئەمـــــە وردە نـــــازە

ئەمـــە شـــەوە و دەرگـــاوازە... ! ! [3]

ئەمـــــە نوقورچـــــە یـــــا گـــــازە

ئەمـــە... پـــشووی دووی هـــەورازە ! !

هـــەر وەکـــو خـــەو هـــەمووی ونـــن..

وەك بـــــەردی گـــــۆمی بـــــیٚ بـــــنن

هەروەك و خەو ..

وەك باســـــی دەســـــتە کـــــچێکی

بـە سـالاّ چـووی دوای نیـوە شـەو ... ! !

چـۆن (راز) بـۆ (بـەخت) گـەرم ئەکـەن

---

(1) ریشە ریشە : تالٚ تالٚ ، تیسك تیسك

(2) بریتی بوو لە باسك و فووی : شاعیر مەبەستی لەوەیە ئەو نانەوایە کە بە هێـزی باسـك و قـۆڵی بە تـیرۆك نـان ئـەکات و بـەفوو تەنوورەکـە دا ئەگیرسـێنیٚ... واتـە ئەنجامی شووی لە بریتی خۆشگوزەرانی هێزی بـازووی بـەخت ئـەکات و ژیـانی پـیٚ مسۆگەر ئەکا .

(3) دەرگا واز : دەرگا کەرەوە ، بە واتای دەرگاوانیش دێت .

رابووردویـــــان ئـــــەهێنن و بـــــەبای
ئەدەن ....
ئا بەو جۆرە ...
لــــەگۆ کـــەوتووی فڕکـــان فڕکـــانی[١]

دڵداری ...
هـــــەتا گـــــەرووی نـــــوقمی لیتـــاوی
هەژاری ...
ئێستێ ...
ئـــەوا کەوتۆتـــەوە ســـەر خـــەیاڵی[٢]
چـــەند شـــەوێکی لـــــە لای مێـــردی
ئاش بەتاڵی ...
کەوتۆتـــــــەوە ژێـــــــر چـــــــەپۆك و
کڵاوی تاس[٣]
بردنـــــەوەی یـــاد و هەســـتی جـــارانی

---

(1) لە گۆ فڕکان فڕکانی دڵداری : مەبەست لە نەمانی باس و خواس و قسەکردنە لە دڵداری و خۆشەویستی... بێدەنگییە لەو رووەوە .

(2) ئێستێ: ئێستا ، ئەم دەمە ، ئەم ساتە ، ئەم کاتە .

(3) کڵاوی تاس: مەبەست لە تاس گرتنەوەیە ئەوەش بریتییە لە حاڵەتێکی جادوگەرانە و کەسێك ((تاس)) دائەنێ گوایە شتە شاراوەکانی ئەودیو هەستی پێ ئاشکرا ئەکات .

- تاس : قاپێکی پەلەو قوڵپەکەی (٥) سانتیمە وەك تاسی قوڕ گواستنەوە.. تاس : بە کڵاو و فێستی ئاڵتونی ژنانەش دێت .

کاس

کاسی شەوێکی لای مێردی
بە باس و خواس
وەك بێ دەنگی
دولبێشکی لەمەڕ خالەباس... [1]

هیوای زەردە ...
هەروەك زەردەی پەرێزی جۆ
لە هاویندا خوار بەکرەجۆ ... !! [2]
جار جار رەشە ..
وەکو شەوی لێکدانەوەی گینگڵی رق.. !!
هەر وەکو رووی ئاشکرا بوو ... رووی
مونافق [3]
جارێ شینە ...
وەکو پێڵووی پشت چاوێکی بۆیە کراو....

---

(1) ناوی گوندێکە لە رێگای ماوەت و خاوەنی بەر و بەراتە و ناوی خالەهەباسە .

(2) گوندێکی خنجیلانەیە و کەوتۆتە خۆرئاوای شاری سولەیمانییەوە . زەوی و زارێکی بەراوی چاکی هەیە و هەمەجۆر کشتوکاڵ و درەختی بەرداری تیا چێنراوە، بەرێکی چاکی بووە، هەر بۆیە بە کێڵگەیەکی نموونەی دائەنرێت.

(3) گینگڵ : خۆ خواردنەوە ، پێش خواردنەوە

مونافق: دوو روویی ، قسە هێنان و بردن و ئاژاوە نانەوە .

یاجێ نوقورچی خوێن تێزاو....

جارێ سووره ...

وەکو لێوێکی پاش مژین ...

مژی تەڕایی لێبڕین ... !

بەڵام بە هیچ ..

ئاواتی کولێرەی بە میچ[1]

کە خەیاڵ بێ

با وەك سایەقەی سامال بێ ...

کەی ژیانە ... ؟

یا کەی نان و گوزەرانە ؟

جارێ ترش و پڕ لە تاڵاو ..

وەکو ئاوی ئاوە سپی[2]

نزیك سەنگاو

جارێ سوێره...

وەك خوێی سەرکەفی مەملەحەی[3]

---

(1) کولێرەی بە میچ : جاران کە نان لە ماڵان ئەکرا بۆ دەمی نیوەڕۆ لەسەر تەنوور کولێره ئەکرا بەمیچ نەخشی لێئەکێشرا و پێیی ئەوترا کولێرەی بەمیچ.

(2) ئاوی ئاوە سپی : ئەم ئاوە لە نزیك سەنگاوە و تامێکی ترشی هەیە .

(3) مەملەحە : ناوچەیەکی پڕلە خوێیە لە نزیك شاری کفرییەوە ، خوێی سپی هەیە و بە ناوبانگە بە خوێی سەرکەف .

ئەم لای کفری

سپی بەفری ... !

جـــاریّ تـــالّ و کـــرچ و کالّـــە

وەکو کارگی بن داری (بی) نزیك ژالّە[1]

بـــە ســـالّی جـــاریّکیش پـــاراو

وەك رۆنـــــی قاینـــــە و ســـــەراو[2]

قوربانـــــــت بم.. حـــــەیرانت بم

بـــۆ راکێـــشانیّ پـــاش نانـــت

هـــەر خـــۆم خـــەریکی رانـــت بم

وورد وورد مـــن لـــە شـــێلانت بم

یـــا (شـــێخ) خـــۆم بـــە میوانـــت بم

خـــۆم رابـــەری فـــەرماتن بم

نوشـــــتەیەکم بـــۆ بنووســـــە

ئـــــەم زەوی چارەنووســـــە

---

(1) کارگ : گیایەکی بەهارانەیە و لە تەڕ و تووشـی و ئـەنجامی هـەورە تریشقەی زۆر ئەهێنریّ.. تاقی کراوەتەوە کارگی نزیك گولّی ژالّە تالّە .

ـ داری ((بی)) : درەختێکی بیّ بەرە، گەلاکانی باریك و درێژکۆلّەیە و گەلیّ جۆری هەیـە ، بە ناوبانگترینیان شۆڕە(بی) یە .

(2) (٢٠) قاینەجـەو سـەراو: دوو گونـدن لـە ناوچـەی شـارەزوور و کەوتونەتـە نێـوان سەرای سوبحاناغا و سەید سادقەوە، رۆن و کەرە و ماستی کوردی باشیان هەیە.

هێندە ڕەقەنە
لامـــــەللای بــــــەرد و دەوەنــــــە..
وەکـــــو خــــەو دێنـــــەوە یـــــادم
ئـــەو چـــەن شـــەوەی لای فـــەرهادم
چـــەند ســـــاتێکی پـــڕ بۆڵــــە بـــوو
جـــــارێ جنێـــــوی تۆڵـــــە بـــــوو
جـــــارێ ئامـــــان جـــــارێ قوربـــــان
جـــــارێ بـــــەلاملا نووســـــــان[1]

کـــە دەس ئەگەییـــە ســـەر مـــەمکم
شلم ئەکرد
دەســـــتم بـــــۆ ئـــەملاولا ئـــەبرد..
بـــەڵێ قوربـــان ئـــەو چـــەن ســـاتەم
ئـــــەو گێـــــژاوی تـــــۆزە کاتـــــەم

کـــە تێکـــەڵاو بـــە لرفـــە بـــوو
بـــە هـــــاواری ژێـــــر لێفـــە بـــوو[2]
وەك (چا) وا بوو... !
بەڵێ وا بـــــوو...

---

(1) بەلاملا نووسان : مەبەست لەشڵپەی ماچی لامل و گەردنە .
(2) بەلرفە : بەلووشە، شێوەیەکە لە هەڵپەی خواردن

تــــەنیا تـــــەنیا ســـــپی و ڕەش بـــوو
جـــاریٚ تاریــــك جـــاریٚ گـــەش بـــوو
ئـــەویان شـــیرین ئـــەم یـــان تـــاڵ بـــوو
وەکـــو نـــانی گـــەنم و گـــاڵ بـــوو...

ئێستاش...
ئـــەوا کەوتوومـــەوە ســـەر ئـــەو فاکـــە[1]
تـــوو... ئـــەو کەســـەی تـــەنیا و تاکـــە
نزایەکم بۆ بنووسە
بـــۆ ئـــەم زەوی چـــارە نووســـە.. !
بەشکم :
پرشـــنگی زێڕینـــی ئـــاهرامزدا فریـــام کـــەویٚ
جێگـــای هـــاوار و ئامـــان و بریـــام کـــەویٚ

بێوەژنیٚ :
تاڕادەیـــــە تـــــەڕ و تـــــەڕ پـــــۆش

(1) فاك : فاك و فيك ، بە واتای چاو و ڕاو دێت گەڵێ جاریش بە واتـای سەوداسـەری و ئارەزوو دێت.

شینی چپوێت لە خوارەوە هەتا سەرپۆش
بەکراسی ئەم پێدراو ئەو پێدراو
یەك دو جاریٚ لەبەرکراو

زاخاو دراو... !
دەست و مەچەك خڕ و خەپان
دروست بوو بۆ گاڵتە و گەپان
بۆ هەڵگلۆفتن و گوشین
بۆ ژێر سەرو بۆ سەر سەرین
بالاّ نێوەن سنگ دەرپەڕیو
جێی سەرنجی چاوی هەتیو
کوانیٚ لەسەر گۆنا نەخشاو
بەگەردنی سپی زەردباو[1]
بەرەو خوار بە پێچ و دەورە
ئەملاو ئەولای مەمکی گەورە
زەنگوڵ زەنگوڵ ئارەق رێژە

(1) کوانیٚ : کوان : کوانی خورما لەسەر روومەت و کولّم دێت و لە شێوەی پەڵەیەکی بازنگەیی گڕناڵ گڕناڵدایە و گەلیٚ جار ئەبیٚ بە نەخش و زۆر جوان ئەنوێنیٚ .
ـ گۆنا : کولّم .

هـــۆی قاســـپەی گـــۆرانی بێـــژە... !! [1]

ئەم نیگارە ...

کـــە بـــۆ چـــاوی ئـــەو دیـــوی (شـــێخ) جێـــی

ڕێشکەیە

بۆ ئارامی ئەم دیویشی وەك بێشکەیە... !

چـــاو لێـــك ئـــەنێ ، چـــاو هەڵئـــەبڕێ

دڵـــی لەســـەر ســـەد ئـــەفڕێ... !!

بێـــــوەژنیش پـــــەیتا پـــــەیتا

وەك ئـــاگر بـــێ لـــەبن زەیتـــا [2]

بـــــەناز چـــــمکی کراســـــەکەی

ئـــــەبا بـــــۆ ژێـــــر هەیاســـــەکەی

لەســـــەر لا بـــــۆی دانیـــــشتوە

دووچـــاوی خەســـت لێڕشـــتووە.. !

چـــاو هەڵـــدێنێ جـــار و بـــارێ

شـــیرو تـــیری لـــێ ئـــەبارێ

قـــسە ئـــەکا... خونـــچەی گـــوڵێ

پێئەکـــەنێ لەســـەر چـــڵێ

---

(1) زەنگوڵ زەنگوڵ : هۆن هۆن.. واتە دڵۆپ دڵۆپ .

(2) پەیتا پەیتا : یەك بەدوای یەکدا ، یا دوا بە دوای یەك .

زەیتا : زەیت : ڕۆن.. کاتێ ئاگر لە ڕۆن بەر ئەدرێت کڵپە ئەکات .

پێئەکـــــــەنێ.... دوو ریـــــــزی وورد
مـــرواری خـــۆی ئــەکا بـــە پـــرد... !! [١]
بــــۆ ڕێبـــــازی شـــــەڕابی ئــــاڵ
برژێتـــە نـــاو شوشـــەی خــــەیاڵ.. !!!

روو مــــۆن ئــــەکا ، روو گــــرژ ئــــەکا
جگـــــەری دوو جــــار بــــرژ ئــــەکا[٢]
قـــــژی ژاکـــــاو لەســــــەر لامـــــل
بـــە دڵـــی بـــــەردیش ئــــەدا پـــل[٣]
لـــــــووتی بـــــــەرزی کۆڵەکـــــــەدار
کـــوڕە کـــــاژاو دێنێتـــــەخوار... ! [٤]

ئەم دیمەنە...
کــــە خەرمانـــــە... کـــــە گوڵــــشەنە

---

(1) دوو ریزی ورد: لێچوواندنێکی جوانە بۆ ددانەکانی مرۆڤ

(2) جگەری دوو جار برژ ئەکا : واتە دووجار جگەری ئەبرژێ

(3) بە دڵی بەردیش ئەدا پل : واتە ئەو دڵەی وەك بەرد رەقیشە ، نەرم ئەبێت و بۆی لێئەدا

(4) کوڕەکـاژاو : چـیایەکی سـەربەرزی لوتکـە بڵنـدە و کەوتۆتـە رۆژهـەڵاتی شـاری سولەیمانییەوە نزیکی بەرزنجەیە .

- کوڕەکاژاو دێنێتە خوار : واتە گەر لوتی بەقەد چیای کوڕەکاژاو بەرزبێت ، لووتی پـێ نەوی ئەکا.. لەپەندی پێشیناندا رستەی (لووتی لە کوڕەکاژاو بەرز ترە) بە تـوانج و تیر و تەشەر بەکار دێت .

تـــــەلاّیی دەســـــت ئەهریمەنـــــە[1]
بـــۆ جولاّنــــدن بـــۆ بزوانـــــدن
بـــۆ دلّـــی (کێـــو) هەلّتەکانـــدن ... ! !

کەچـــی بـــــەختی کەچـــی وایــــە
نگـــین لــــە ســـنگی حووتایـــە.. ![2]
هەرچـــی ئـــەکا بـــۆی دەرنایـــــە
حـــووت وا لـــە قـــوولّی دەریایـــە... ! !

ناچار...
واهانای هێناوە
بـــۆ ئـــەم ناوچـــەوان و چـــاوە...
دە هەمدیـــــسان... قوربانــــــت بم
دەســــــتە ســـــڕی گریانــــــت بم
باوەشـــــێنی گـــــەرمای جێــــت بم

---

(1) لەبەر رۆشنایی ئاینی زەردەشتیدا لە ژیاندا دووبەرە هەیە و دوو خوا.. خوای چاکە، خۆشی و ئاشتی کە پێ ئەوترێ ((ئەهرومزدا)) و خوای شەڕ و خراپەکاریش ((ئەهریمەنە)) ...

ـ ئەهریمەن : گەلێ جار بە واتای شەیتان دێت .

(2) کێو : چیا.. شاخ...

– کەچی بەختی کەچی وایە: کەچی یەکەم بەواتا لەگەلّ ئەوەتا بەختی

کەچی دووەم: بەختی نارێك و چەوتی

گسکدەری تۆزی ڕێت بم

دەرمانی دەردی گرانم
لەلای تۆیە خۆم قوربانم
هەردوو دێرم بۆ بنووسە
بۆ ئەم ڕەقی چارە نووسە.. !

بەڵێ قوربان..
با ڕۆشن تر بێمە دووان
لەو پشت کێوە
لەو بەهەشتی دونیای مێوە
دڵم دابوو...
بەکوڕێکی هەرزەکاری
لەش ڕازاوەی وەك بەهاری
کوێستانی ئەم شوردستانە
کە باخچەیە ، کە بێستانە.. [1]
کوڕ چ کوڕێ
شیو هەڵدڕێ
ئێسقان ئەستوورێ
لەش پڕێ

(1) کوێستان : شوێن و جێگای سارد هەیە فێنك و ئاو و هەوای سازگاری .

چـــاو پـــڕ لەچـــەکی نەترســـــان
رەوشـــت ئـــەڵوەن وەك ئەرخـــەوان[1]

بـــە ســـیما هـــێمن و بـــێ دەنـــگ
لـــەناوەوە وەك شـــێری جـــەنگ[2]
نـــە گـــوێی لـــە ئاستی هـــەق کـــەڕ بـــوو
نـــە بـــۆ کوشـــتن وەکـــو مـــەڕ بـــوو.. !!

کارامـــە بـــوو.. کـــار گـــوزار بـــوو
وێنـــەی رۆڵـــەی لادێ و شـــار بـــوو.. ![3]
تاقـــە کـــوڕ بـــوو تاقانـــە بـــوو
ســـەرداری ئـــەو خێزانـــە بـــوو... !!

(1) رەوشت ئەڵوەن : رەوشت پاك و رەوشت جەربەزەیی شۆڕشگێری و نەترس .
ـ ئەرخەوان: دارێکی جوان و رێك و پێکە گەڵاکانی بازنگەییە، بێ بەرە، تەنیا لەسەرەتای بەهاردا و بەر لەوەی گۆپکەی گەڵاکانی بکاتەوە ، گوڵێکی جوانی پەمەیی کاڵ هەڵئەپێچێ و هەر بە ناوی خۆیەوە ناوبانگی بە گوڵە ئەرخەوان دەرکردوە و درەختەکەی بەو ناوەوە نراوە شایانی باسە: ئەم درەختە تەنیا لە گردی سەیوانی شاری سولەیمانیدا هەیە و گردەکەی پێ رازاندۆتەوە .
(2) بە سیما: بە شێوە، شێوازە
(3) کارامە : مرۆڤی بەکار و لێهاتوو .

پەیمانمان بەست...
گرێماندا لە مشت و دەست

کە تا ماوین... هەتا ناو دڵ
دوو لەش ببن و یەك تەنیا دڵ

تارا سازیوو
بەهار.. پڕ ساز و ئاواز بوو
مەلی گەرمیان گەڕایەوە
گڕی (نەورۆز) کرایەوە[١]

بەفر،
لەشاخە سەختەکان توایەوە.. !
ئەو گرێیەی لە دەستا بوو
شەوی (هەینی) کرایەوە.. ! [٢]

---

(1) ئەوی بە ئاشکرا لەم رووەوە هەست پێئەکرێت هەر کە سەرما و سۆڵەی زستان خۆی پێچایەوە و بەهار هات ئیدی ئەو مەلانەی لە ترسی سەرما بەرە و گەرمیان کۆچیان کردبوو وەك باڵندەی : (پەڕەسێلکە و حاجی لەقلەق) لە سەرەتای بەهاردا لە گەرمیانەوە رووە و لای ناوچەکەی ئێمە ئەگەڕێنەوە

(2) لە شاری سلیمانی و زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا وا باوە کە ئێوارەی رۆژانی پێنج شەممە بۆ شەوی هەینی بووك ئەگوێزرێتەوە .

تا بەیانی.....

هـــەتا هـــەتاو گەیـــشتە نـــاو مـــالآن

کـــرژ تـــر بـــوو لەیـــەك ئـــالآن... !!

شەوی دوایی..

شـــــیرن و خەســـــرەو ئاســـــایی[١]

هـــەر خـــەریکی مـــژی لێـــو بـــووین

لـــە هـــەوراز و لـــە نـــشێو بـــووین.. !

بـــۆ ســـــبەینێ... بـــۆ بـــــەیانی

لـــــەناکاوا... هێنـــــدەم زانـــــی[٢]

شـــتێ لـــــە ئاسمـــــان گرمـــــانی

تـــەپ و تـــۆز و گرمـــەی هـــانی..

---

(1) شیرین و خەسرەو : مەبەست لە چیرۆکە دڵداری یەکەی شیرین و خەسرەوە، خانەی قوبادی شاعیری بە ناوبانگی کورد شاکارێکی ئەدەبی لێ پێکهێناوە. هەروەها (نیزامی گەنجەویی) یشی کە لە دایکەوە کوردە هەمان چیرۆك و بەسەرهاتی شیرین و خەسرەوی لە شێوەی بەرهەمێکی ئەدەبی بەرزدا پێشکەش کردوین .

(2) لەناکاو : لەپڕ ، کت و پڕ .

هاوارم کرد....

چەپەر سووتا

پەرژین سووتا

ئــــەها ئـــاوازی (ژیـــن) ســــووتا... !!

بەڵێ سووتا..

چوو بە قووتا... [1]

ئـــــەوەتا لـــــە گـــــەرووی حوتـــــا.. !

منیش وتم...

بـــــۆم بنوســـــن لەســــــەر پــــــشتی

ئــــەم فــــەرهادەم (بۆمبــــا) کوشــــتی

***

---

(1)چوو بە قووتا : نوقوم بوو ... دیار نەما .

- چوو بەقووتا : لەو زاراوەیەوە وەرگیراوە . کە شتێ قووت ئەدرێ – قوتـدان ـ کـە بـە گەروودا ئەچێتە خوارێ .

# هەنگاو

١٩٦٩

لــــە شـــاخێکا ... دەروون و دڵ کـــوێران
لــــە خرســـانا یــەك و دوو هەڵئـــەدێران[١]

لــــە دامێنـــیێ چـــیادا تاڤگــــەی خـــوێن
بەرەو پێدەشت ئـەڕۆیی بـێ سـەر و شـوێن[٢]

لــــە وەردێکـــا هـــوروژمی تیـــژی گوللــــە
گــەرای مــەرگی ئـەنا وەك پۆلــە کوللــە[٣]

لەشـــارێکا کـــە گیـــان باســـی نــەمابوو
ســــەمای لاشــــە لــــەجێگای ســـینەما بــوو

لــــەپڕ شـــــەوقێ .. لەشـــەوگاری ژیانـــا
بەیانیـــــدا لــــــە ئاســــــۆی نیـــــشتمانا

(1) لە خرسانا : لە قینا لە رقا ، لەبێ بەزەییا ئـەڵێن فلانـە خرسـە یـان پۆرخـسە ... واتا قیناوی و رقاوی یە .

(2) لە دامینی چیادا : لەقەدی خوارووی چیادا

(3) لە وەردێکا : لەشوێنێکا ، لەدەشتێکی بە بەرهەمدا

ئـــەوا دیـــسان لـــە زســـتانا بـــەهاریٚ
دیاریـــدا دەمـــی خونـــچەی کـــەناریٚ

لـــەناو تۆفـــا .... لەنێرینـــەی شـــەپۆلا
هـــەواریٚ هـــات بـــەبیری ســـفت و ســـۆلا[١]

کـــە ئارامگـــا ... جێگـــای بـــاس و خواســـە
کەمەریەســـتن بـــە دەســـتە نـــەك هەیاســـە .. !

بـــڕۆ دوژمـــن بـــڕۆ ئـــەم کـــوردە چـــیتر
لەیـــەك نـــابیٚ لـــە یـــەك بـــوون بەســـیە ئـــیتر

دە ئـــەی ئەســـرینی گەشـــکەی نـــاو گلێنـــە
لە دڵ خوریـــە ، لەچـــاو خـــەوتیٚ بـــسێنە ...[٢]

*****

(1) لەناو تۆفا : لەناو باران و رەهێڵەیەکی بەهێزدا . سفت و سۆلا : تـونگ و تـۆڵ .. مەبەست لە شتێکی سفت و بەهێز دارێژراوە

(2) ئەسرینی : فرمێسکی .
گەشکەی : روون ، پێکـەنینێکی خۆشی و شـادی، دە ئـەی ئەسـرینی گەشـکەی نـاو گلێنە : واتا ئەی دڵۆپە فرمێسکی روونی گلێنەی چاو هەمیشە قـەتیس بـە .. تـا دڵ ئارام بێت و هیچ هەواڵێك خوریەی پیا نادات واتە دڵ بە ئاگا بێت و چـاو خـەوی لیٚ ئەتاریٚ .

# وەرزی تازە

## ١٩٦٩

**( ڕێی بای وەرزی تازە )**

بــۆ وەرزی تــازە گــەردی ســوور گرتــوو
نــەورۆز ... نێرگــسی ئــەکرد بــە ســووتوو
ئەیپڕژانــد بەســەر چــرۆی تــازەدا
ئــەیوەران بەســەر ئــەم ڕێبــازەدا
لــەخوێنی زەردی لوتکــەی ئێــواران
ئەرخــەوان توێــژی جــەرگی ئــەباران ... [١]

ســالان ... ڕێحانــە کێویلــەی ســەیوان
هەر خۆی ئیکلیل بــوو لــەوێ و لــە کێوان.. ! [٢]
خونــچە کــراوە ... بــۆ خــوڕی فرمێــسك

---

(1) لەخوێنی زەردی لوتکەی ئێواران : جۆرە لێکچواندێکی جوانی شاعیرانەیە بە تایبەت کاتێ زەردەپەڕی هەتاو لە دار ئەرخەوان و گوڵەکانی ئەدات ، دیمەنێکی ئێکجار سەرنج ڕاکێشەر پێك ئەهێنێ لەلایەك گوڵی ئەرخەوان نیشانەیە بۆ خوێنی ڕژاوی شەهیدان و زەردەپەڕی هەتاویش لێی ئەدات . زەردی تیر بەسەر گوڵ ئەرخەوانیداپەخش ئەبێت .

(2) ڕێحانە کێویلە : جۆرە گوڵ و گەڵایەکی مۆر و ڕەشی بۆن خۆشە و لە چیا و دەشت و دۆڵ و کێوەکاندا سەرهەڵئەدەن .

ئیکلیل : چەپکە گوڵی ڕازاوەیە و وێنەی کۆچکردووی پێ ئەڕازێنرێتەوە و لە سەردانی گۆڕ و گڵکۆی کۆچ کردودا ئەبرێتە سەر گۆڕەکە .

سـك سـووتا و سـوێری ئەگەیانـە ئێـسك ...

بـــۆ مـــژی تـــاڵی شـــیلەی هەڵاڵـــە .
هـــەنگ پێکـــا ئـــەهات لەســـەر گوڵاڵـــە[١]
هـــەنگوین لـــە تفتـــی ئەهاتـــە بەرهـــەم
خۆشـــی لـــە (ئـــازار) ئـــەبوو.. بـــە ســـەرجەم[٢]

( پێویستییەکانی وەرزی تازە )
تـــا .. نەســـوتایە پـــاوەن بـــە پـــاییز
بـــەهار .. کـــەما و لـــۆی نـــەبوو مـــام بـــایز[٣]
تـــا .. نـــە بڕایـــە پـــەلکی رەز و مێـــو

---

(1) هەڵاڵە : جۆرە گوڵێکی جوانە و هەم بەو دەسکەوتە ئەوترێ کە هەنگ لەم گوڵ و ئەو گوڵ چنگی ئەکەوێ و ئەیمژێ ..دوایش ئەیباتەوە بۆ پوورەکەی و شانەی و هەنگوینی لێ پێکئەهێنێ .

(2) ئازار: لێرەدا رەگەزدۆزیەکی جوان پێك ئەهێنێ و بەم دوو واتایە دێت .

- ئازار : ژان و سوێ ، واتە بەتێکرای ئازار نە ئەماو ، خۆشی لە ئازاردا ئەتوایەوە و ئازارەکەی تەواو ئەبوو .

- ئازار : مەبەست لە مانگی ئازار یا مارتە کە یەکەم رۆژی بەهار و نەورۆز وساڵی تازە رێکەوتی ٢١- ٣ - ی هەموو ساڵێك ئەکات .. دیارە هاتنی بەهاریش مژدەیەکی خۆشە نەك هەر بۆ مرۆڤ بەڵکو بۆ سەرجەم ژیان .

بەسەرجەم : بە گشتی ، بەتێکڕایی .

(3) پاوەن : لەوەڕی وشکی پاس کراو (پووش).

کەما و لۆ : دوو گیای کێوین لە بەهاردا باشترین لەوەڕن بۆ حەیوانی وردە ... لە شاخەکانی بەرانان و گوێژە هەن .

تـەرزی نـوێی نـەبوو (باخووسـی) نـاو کێـو[١]
تـا .. نەگریایـە فریـشتەی زسـتان
پێکـەنین نـەبوو ، بـۆ کۆرپـەی بێـستان
تـا ... چـەخماخەی خـوێن نەیدایـە لـە هـەرد

لـەیلاخ بـێ دەمـاخ ، چـارە کـز و زەرد[٢]
سـەوزەی دیـاران .... وەك شـەو بێـداران
بـێ دڵـۆپ وەکـو سـاڵی بـێ بـاران[٣]

---

(1) پەلکی: لقی.. لێرەدا مەبەست لە تەرزە، واتە تەرزی رەز و مێو .

ـ مێو: داری ترێ .

ـ باخووس: لای یۆنانییـە کۆنـەکان بـە خـوای مـەی ئـەوترێ و وشـەیەکی خواسـتراوە مەبەست رەزە .

(2) لەیلاخ : کوێستان..ئەو شوێنەیە کە کۆچەرەکان واتە دەوارنـشینیەکان بـە هـاوین بۆی ئەچوون.

ـ بێ دەماخ : بێ شەوق ، بێ ئارەزوو .

واتە : کاتێ کوێستان بەرگی سەوز و گوڵی ئاڵ و والای پۆشیوە کە چەخماخە و هەورە بروسـکەیەکی گـەرم و بـەهێزی بدایـە لـە زەوی و هـەرد و بـارانێکی چـاکی بـە دوادا بهاتایـە .. ئەوسـا بـەهاری کوردسـتان رازاوە ئـەبێ و کـورد ( مەبەسـت کـوردە کۆچەرەکانە ) بە کەیف و شەوقێکی تەواوەوە ژیان بەسەر ئەبەن .

(3) سەوزەی دیاران : ئیشارەتە بۆ شیعرەکەی مەولەوی تاوەگۆزی کە ئەڵێ:

(مەهارەن سەیرەن ، سەوزەی دیارانە) .

جوولـــه ئەمـــەیی ... ئـــاوازە ئەیبەســـت
مـــەل جێگـــە چـــینەی لێ ئەچـــووە بەســـت[1]
ئەگـــەر لـــە شـــکری کرێـــوەی چـــلە
نـــە ئالایەتـــە دەم باســـك و ملـــە ... !

**( نەخۆشییەکانی وەرزی تازە )**

سروشـتی زوربـە ... سـەخت بەزسـتانان ... !
بـــە هـــاوین شـــەرا و داخ بەدەســـتانان[2]
چـــێژی شـــیرینی بـــە گـــەرمی چێـــشتوو
بـــۆ تـــاڵی نۆشـــین و بەســـەد دەم تینـــوو

بـــۆ دوو روانـــین بـــەو ســـەری دووربـــین
کۆســـپی قـــووچ و زل بـــە بـــچوك بیـــنین[3]
بـــۆ .. شـــەقاوی رێـــك بـــەردەم لێتـــەنین
ســـــزا بـــــارکردن تـــــاوان هەڵـــــچنین

---

(1) چینە : ئەو شوێنەیە کە مەل یاری تیا ئـەکات، چینە بـۆ هەنـدێ باڵنـدە و مـەل بەکاردێت کە خۆڵ بەسەر خۆیدا ئەکات .

(2) شەرا : گڕە ، گەرمایەکی سوتێنەری بەتین .

(3) بـۆ دوور روانـین بـەو سـەری دووربـین : ئەمـەش نیـشانەیە بـۆ بەیتـە شـیعرەکەی مەولەوی کە ئەڵێ : (ئەی سەرە و سەرە دوورینەکەی چەم) ... ئـەوەش واتایـەکی قووڵ ئەگەیێنێ کـە : ئێمـەش بـۆ دوور تەماشـاکردن بـەو سـەری دووربـین تەماشـا ئەکەین

چـــاوەڕێی نووچـــــێ بـــۆ هەڵــــەنگووتن
لــەجێی ژێربــاڵ و چــوون چــەپۆك هاویــشتن
لـــــە هـــــەچ گەروویــــە هەڵــــسێ هـــاوارێ
بــــۆ تاســــــاندنی گــــــورج و پلامــــــارێ
ئـــــەی وەرزی تــــازەی چـــارە خوێنـــاوی
تــا کـەی لــە راســتی گــوێ ئــاخنراوی ؟؟ ..

(هەنگاوەکانی وەرزی تازە)

ئـــــەی وەرزی تـــــازە ... تـــــازە هـــــەنگاوی
دڕکـــــاوی ئـــــەنێ بـــــۆ نـــــاو پـــــەنگاوی
دوور و درێـــــــــژی ڕێگـــــــــەی تێکۆشـــــــــان
وەچـــەی نـــە مـــردووی کـــاوەی قارەمـــان[1]
چـــاوی ژێـــر نێـــزەی ئـــەو دیـــو کـــەلیخان
ژینـــی ئـــەم دیـــوە بـــێ بـــە چـــراخان[2]

---

(1) وەچەی : نەوەی.

(2) کەلیخان: ناوچەیەکی سەختی کوێستانییە،بە ڕێواسی نایاب بەناوبانگە.

گیانی تامەزۆری شەکراو و شەکر
چاوەڕێی جامە لە دیاربەکر .... ! [1]
چەند دەس لە مل بێن کارمان بە پێزە
ئەوەندە لەو دیو بەهار ئامێزە
بۆ بارگەی تازە مێشك تێشووە

بۆ شەرابەکەی خوێن لە هێشووە
ئەی نەتەوەکەی نەبەردی کوردم
بۆ ئەم مەبەستە خۆم یەکەم پردم ... !

*****

---

(1) دیاربەکر: شارێکی گەورەی کوردییە لە کوردستانی تورکیا .

# برسیمە

**١٩٦٩**

برسیمە من دە کوڵمت بێنە وەکو تەماتە
با قاشیکەم بە تیغی دانی وەکو سمارتە
لامل لەدەم نزیکخە بۆ ماچی لێوی زبرم
توێژاڵ کرێنە هەر وەك چەقۆ بۆ سەر پەتاتە
ئای چەندە سوور و سوێرە دڵۆپی ئەشکی دیدە
وەك گۆشتی ناو قەزاتمە کەچی لەئێمە قاتە ... [١]
بەرۆژ مەمك ئەبینم ، شەو گیپەیە لە خەوما
بەیانی دەستە و ئەژنۆ درۆ هەمووی هەلاتە[٢]
کراسی کورت .. لەبەردا دوورانی گردی تێدا
سپی هەر وەك پڵاوی مەولو بە سور و ساتە[٣]
پووز چی بڵێم خڕ و پرپتەو زەرد و زۆڵی

---

(1) قەزاتمە : جۆرە خواردنێکی شلەیە و لە بنەماڵە و خانەوادە کۆنەکانی شاری سولەیمانیدا باوە و لێ ئەنرێ

(2) درۆ هەمووی هەلاتە

(3) دوو رانی گردی تێدا : واتە : دوو رانی خڕ و خەپانی تێدایە

وەك كفتە سەر شكێنە بە ئەرك و شاتە شاتە[١]
قوربانی ئەو دەمەت بم بچوك و ئاڵە هەرگیز
مزر وەكو هەڵووژە شیرین ئەڵێی نەباتە[٢]
حەیرانی باخی سینەم پڕ بۆن و پڕ بەرامە
وەك شیلەیی مورەبای بەهێیە یان كەباتە[٣]
بۆ نالەبار بەجێیە لەوەڕ لەهەر دووجێدا
بۆ ئێمەش ئاو لەدەم چووت لە ڕێگای نەهاتا[٤]

*****

---

(1) شاتە شاتە : قیژە قیژ و هاوار هاوار .

(2) مزر : تامێكی مەیلەوترش.

(3) حەیرانی: پەرۆشی، شەیدایی .. عاشقی.

(4) بۆ نالەبار بەجێیە لەوەڕ لەهەر دوو جێدا : مەبەست لە مرۆڤی هەڵپەرست و بێ باره كە هەمیشە وەك كەری ناو جۆگا لە هەر دوو بەر ئەخوات

## من و بای شەماڵ(*)

هەرچەند بەگران لەبای شەماڵ ئەگەم
ئەو شنە و منیش ناڵە ناڵ ئەکەم
بەڵام بای شەماڵ بۆی گێڕامەوە
ئەو وتی ورد ورد من گەشامەوە
وتی لەوەتەی دنیا دنیایە
کۆن ئەڕوا تازە و نوێ دێتە کایە
لەپێشان بازووی بەهێز و قایم
زاڵی لاواز بوو هەمیشە و دایم
ئینجا هەر زاڵی و دەست و پێوەندی
خۆی و نۆکەر و گورز و کەمەندی
هەڵپە و پەلامار بۆ دەور و پشتی

(*)ئەم شیعرە لە گۆڤاری رزگاری ژمارە (٥)ی ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٦٩ وەرگیراوە.

چی بەردەست ئەکەوت بۆ قۆڵی مشتی
پاشان بیری خەڵك بەرەو بەرزیەتی
بروزی ئەسەن رووەو ژیرێتی
زاڵی تازەشمان بەگوێرەی وەختی
رێ و شوێنی تازە لە دەوری تەختی

وازی لەشێوەی جاران ئەهێنا
پەت و سێدارە و گوللە لە شوێنا
نەك پێست گوروون و یاخۆ سووتاندن
بۆ ئەوەی بڵێ ژیان نەك مردن
هەر وام بیستووە وام دیوە بەچاو
سا هەر زاڵمێ هاتبێتە ناو
پاش دەرکەوتنی کردار و پیشەی
دەریان ئەهێنا دەمار و ریشەی
تۆز و ئێسقانی ئەدرا بەبا
سا خۆی و شیری با بۆ کوێی ئەبا
بڕوانە مێژوو ئەگەر ئەتەوێ
راستی و تەمت بۆ دەرئەکەوێ
ئەوە هۆلاکۆ، هیتلەر، نیرون، چار

ڕۆیین چوونەوە وەك بەفرەکەی پار
ئێستاش هەر وایە قانوونی ساکار
ئەوی خوێنخۆریێ و زاڵم و بەدکار
ئەوی بیەوێ شەڕ هەڵگیرسێنێ
ماڵ و منداڵی خەڵك بسووتێنێ
خانەی بێدەنگی خەڵکی دابێژێ
خوێنی پیرۆزی ئینسان بڕێژێ

هەر وەکو باوك و باپیری کۆنی
چی لێهات ئەویش ئەوێیە شوێنی
لەسەر کێلم بەبۆیەی سوور بنووسن خۆشەویستانم[1]
لەناو گۆڕا لەژێر خاکا، لە ریزی دەست لە ستانم
بەپەیمانێ کە من دابووم بە کورد و خاکی کوردستان
بەنەعرەی ڕاپەڕین شەرتە کە بانگ کا من لە هەستانم

***

(1) سەرچاوەی ئەم چوارینە بە دەستنووس کاك هونەر دیلانە .

# وەرزی جاران
# بەهاری جاران

گزنگــی ئــاوێز ... بــە ســەودای نەوبــەهارێ
لـە چـاوی ((گـوڵ)) دڵـۆپی سـوور ئـەبارێ .. !
لــە بــۆ وەرزێ ... کــە بــا شــانەی گەڵایــە
لەکوێــستانێ ... چــنوور پرچــیتەڵایە ... ! (١)
خــــشڵ بارانـــــە ... (نێرگـــــز) چـــاوی زەردە
کــە پــیرۆزەی وەنەوشــە شــینی هــەردە (٢)
لــــە دامێنـــا ... بریـــسك و هـــوڕی ئـــاونگ
دەواری زێـــڕ و زیوینـــە بـــە بـــێ (ســـنگ) (٣)
لـــــەدەم (لێـــوا) شـــەقایق وەك شــــەرابێ
کـــە فرمێـــسکی (گوڵاڵـــە)ی پیـــا ڕژابـــێ (٤)
وەك لێـــوی بـــە لێـــوێ چـــۆن ئەمـــژرێ
وەکـو (خـوێنێ) بـە (خـوێنێ) چـۆن ئـەکوژرێ .. !

---

(1) چنوور پرچی تەلایە .. چنوور کە جۆرە گوڵێکی کێوییە و بۆتە پرچی ئاڵتونی.

(2) خشڵ : بەو ئاڵتونانـە ئـەوترێ کـە بـۆ جوانی و رازاندنـەوە ، ئـافرەت بـەکاریان ئەهێنێ : وەك (لاگیرە و پشتێن و گۆبەرۆکی ئاڵتونی ..

(3) بریسك و هوڕ : باق و بریق ، رەنگدانەوەی رەنگی ئاڵ و واڵا .

(4)شەقایق: جۆرە گوڵێکی شێوە گوڵاڵەیی و رەنگا و رەنگی تەمەن کورتە.

لــه لێــوی (لالــه) خــوێن بــارین بــوو جــاران
لــه (دڵ) دا بــاوه پــڕ ئه‌ســرین بــوو جــاران .. !
لـــه ئاســـۆگا .. سروشـــتی تـــازه کۆرپـــه
دڵــی بـــه‌ردی ئه‌خـــسته جـــۆش و خورپـــه ... !
لـــه‌تاو .. بـــاق و بریقـــه‌ی نێـــو نـــزاران
شـــه‌واره‌ی بـــوو قـــوڵنگ و قـــاز بـــه‌هاران .. ! [1]
له‌گرمـــه‌ی هـــه‌ور و هـــاڕه‌ی تیـــژی تـــه‌رزه
شـــکۆفه هـــه‌ڵوه‌ریوی تـــرس و لـــه‌رزه [2]
لــه (ده‌شــتێکا) .. کــه ســه‌یرانگا بــوو جــاران
لـــه‌پڕ هـــه‌ورێ کـــه بـــارانی ئـــه‌باران
کـــه ئاڕایـــشت ئه‌شـــێوا بـــه‌رگ ئـــه‌گۆڕا
هـــه‌زاران (دڵ) ئه‌چـــوو .. پـــه‌یمان ئـــه‌دۆڕا .. !

**به‌هاری ئێستا ...**

ئـــه‌وا ئێـــستا ... کـــه نیـــسانه و بـــه‌هاره
ده‌مـــی خونـــچه بـــه نووقـــاوی دیـــاره

---

(1) نێو نزاران : ناو گوڵ و گوڵزار .
ـ شه‌واره : جاران باوبوو گه‌ڕاوی قاز و قوڵنگ که له جۆری باڵنده‌ی کێوین به شه‌واره ئه‌گیران .. که بریتییه له‌وه‌ی : له شه‌ودا تیشکی رووناکی له چاوی ئه‌و باڵندانه ئه‌درێ و ئه‌وانیش ئیدی توانای فڕینیان نامێنێ و ئه‌یان گرن .

(2)شکۆفه: خونچه یاگوڵی نه‌پشکووتووی دره‌ختی به‌ردار واته به‌رله‌وه‌ی دره‌ختی به‌ردار چرۆ و گه‌ڵا ده‌رکا، به‌ره‌که‌ی له‌شێوه‌ی گوڵا ده‌ر ئه‌که‌وێ ..

لــەکویٚ مێــرگ و لــە کــویٚ زۆنگــاوە ئیمــساڵ
ئــەویٚ رووتــە و ئــەویٚ ســووتاوە ئیمــساڵ ..

لــەکویٚ (راخــەر) بریتــی بــوو لــە چــیمەن
ئــەویٚ زەردە و لــەویٚ شــێواوە دیمــەن . !!|

لــە نێرگزجــاڕی ... شــوێن کۆتــەڵ ئــەبینی
درەختــی ســیس و لــق ســوتەڵ ئــەبینی(١)|

لــە کــن قــومری لــە بولبــول کــاتی خوێنــدن
هەناســەی کــورت و بــانگ نــووزەڵ ئــەبینی .. (٢)

شــەقاوی ئاســك و رەوتــی لــە رووتــەن
لەگــەڵ یــەك تێکــەڵ و پێکــەڵ ئــەبینی(٣)

---

(1) کوتــەڵ : شــوێن ســەیرانگایەکی خــۆش و رازاوەیــە و کەوتۆتــە نێــوان تاسڵۆجە و دوکان ... سەر بە پارێزگای سولەیمانییە
- لق سووتەڵ : لقی یا لکی سووتاو
(2) بانگ نووزەڵ : دەنگی نووزەڵ ، دەنگی نووساوی زیکن .
(3) شەقاوی : هەنگاوی ... شەقاوی ئاسك و بازدانی ئاسك و رۆیشتنی ..
- رەوتی: رۆیشتنی: زاراوێکە بەزۆری بۆ رۆیشتن و هەنگاونانی ئاسك بەکاردێت.

لــــه شـــــینگایان .. بـــــەدووی ســــــروەی شـــــەمالا
کـــــەمالوول و کنێـــــر تۆپـــــەڵ .. ئـــــەبینی .. [1]

کـــــەوی مـــــاڵی لـــــە شـــــاخ (هـــــێمن) .. بـــــەزیوە
حەشـــــاری شـــــاش و پـــــڕ دووکـــــەڵ ئـــــەبینی .. ! !

بـــــەهاری کـــــەم تەمـــــەن .. بـــــارانی زۆریـــــش
گـــــوڵی مـــــاڵی ئـــــەبێ (پووچـــــەڵ) ببینـــــی ..

لەگـــــەڵ بـــــەفر و لەگـــــەڵ زســـــتانی ســـــەختا
بـــــەهاری بـــــێ فـــــەڕ و پیـــــت وا لـــــە بـــــەختا[2]

***

---

(1) لە شینگایان : مێرگ : قەدپاڵکی سەوز .
کەما : گیایەکی کێوی یە .
کنێر : گیایەکی کێوی یە .
لوول : تێك ئاڵاو .

(2) بەهاری بێ فەڕ و پیت : واتە بەهارێکی وشکی بێ بەروبوم و بەرهەم .
ـ وا لە بەختا : ئەوەت بە نسیب بووە یا ئەوەت لە ناوچەوانە

# شینی فازڵ و فەهمی[1]

ئەی براگەل شیوەن کەن
پێی شادی لەپێوەن کەن
مەینەت بهێننە کایە
گریان بکەنە مایە
بالاّ شین و رەشپۆش کەن
منالّی خەم لەکۆش کەن
هەنسک بکەن بە پیشە
خۆشی بکەن لە ریشە
کوێ پڕ لە ناڵە ناڵە
جێگای فرمێسکی ئاڵە
کوێ پڕ گریە و فغانە
لە روو، لە سنگ کوتانە
کوێ پڕ لە ئاهی سەردە
پڕ لە دووکەڵ و گەردە
کوێ پڕ لە شینی خەستە
ئەو جێگەیەم مەبەستە
ئەوێ بکەن بە جێگەی

---

(1) ئەم شیعرەلە ژمارە (١٥)ی رۆژنامەی ژین لە ١٩٧١/٣/٢٥ دا بڵاوکراوەتەوە، " ئەمە بەبۆنەی شەش مانگ بەسەر تێپەڕبوونی کۆچی ماڵئاوایی" فازڵ و فەهمیدا لەدایکبووە.

گـــــڕی شـــــیوەن و ڕێگـــــەی
ڕۆیـــــین بـــۆ گـــردی ســـــەیوان
بــــۆ ســــێبەری ئەرخــــەوان
ئــــەوێ ئەکــــەین بــــە مــــەنزڵ
بـــۆ دوو گـــوڵی جـــوانی گـــڵ
بـــۆ پـــــشووی دوو هەناســــە
بـــۆ یادگـــــار و بـــۆ تاســــە
بـــۆ دەرچـــوونی پـــــشوویان
لــــە جەســــتەی هــــیلاك بوویـــان
ســـــووك بیانخەنـــــە گوڵــــدان
لەبــــەر شـــــكانی نێـــــسقان
ئـــــازار مـــــەدەن بەلەشــــیان
بەپێـــــستی ســـــوور و گەشــــیان
بــــەخوێنی ســــەر برینیــــان
بــــەقۆڵی ســــەر ســــەرینیان
بەچـــــاوی پـــــڕ لەخــــەویان
بەگۆشـــــتی پــــڕ لــــە هـــــەویان

***

ئــــەی براگــــەل شــــیوەن كــــەن
ادی پــــێ لـــــەپێوەن كــــەن
خـــــەم بەخــــەڵك بنۆشــــن
ڕەشــــی بــــەمن بپۆشــــن
بـــۆ دوو گـــوڵی وەتــــەنمان

نەسرین و یاسەمەنمان
سوور هەڵگەڕان لەبەرگا
سووتان لە دەشتی مەرگا

***

ئەی دایکی کورد زوبانم
من ڕۆڵەی کوردستانم
کوڕی ئەم شاخ و هەردەم
مەلۆتکەی ئەو بن بەردەم
پاراوی دەم بەهاریم
قاڵی شەوگاری تاریم
فێری زستانی سەختیم
چەپکە گوڵی بەدبەختیم
لە پایزی وڵاتا
لە گێژاوی خەباتا
وا بووین بە قۆچی قوربان
ئەی براگەل ئەی دۆستان
سادەی کۆمەڵێ سازکەن
بانگەوازێ ئاوازکەن
بڵێن شیوەن و شینە
بۆ فازیلە و بەتینە
بۆ فەهمییە و بەگەرمی
ئەسرین بڕژێنە تەرمی

***

# لەگەڵ تۆمە

١٩٧١

لەگـــەڵ تۆمـــە ... فریـــشتەی دوور لـــە شـــارم
لـــە هاوینـــا شـــنەی بـــاخی بـــەهارم

چـــلە و گـــەرما .. ســـەهۆڵی ناوچـــەوانم
لـــە زســـتانا گـــڕی ئەشـــکەوتەکانم .. !!!

وەرە ســـەیرانە ... ڕێـــی (دوکانـــە) ئیمـــساڵ
بەرامـــە و بـــۆن لـــەوێ پەخـــشانە ئیمـــساڵ

لەبـــەر ئێـــسك و لەبـــەر پـــەترۆی ئەوانـــە
کـــە ئاهـــەنگ بـــۆ قـــەڵای (ســـۆرانە) ئیمـــساڵ[1]

تەپـــەی پێیـــە و تەقـــەی پـــێڵاوی ئەمبـــەر
لەســـەر گـــۆڕی (ســـپی بابانـــە) .. ئیمـــساڵ[2] .. !

---

(1) ڕێی(دوکانە): مەبەست لە ڕێگای ناوچەی دوکانی سەر بە سولەیمانییە لە دوای نەورۆزەوە تا کۆتایی نیسان خەڵکی بۆسەیران سەردانی ئەکەن.

– لەبەر ئێسك و لەبەر پەترۆی ئەوانە: لەبەر ئێسك و پروسکی ئەوانە .. نیشانەی سوێندێکی گەورە و پیرۆزە .

- قەڵای ((سۆران)) مەبەست لەو قەڵایەیە کاتی خۆی محەممەد کۆر پاشای ڕەواندوز لە سنوری دەسەڵاتیدا لەوبەر قەشقۆڵی یەوە دروستی کردووە.

(2) گۆڕی (سپی بابان) گۆڕی پاشای بابان لە گردی سەیوان .

***

پەپوو بێ جێیە .. لێی قاتە کەلاوەی
ئەوێ خەندان و مەی هەڵدانە ئیمساڵ[1]

لەبەر سووری دڵۆپی ئەشکی ( زێیە )
کە شایی وا لە (سوور قاوشانە) ئیمساڵ[2] . ! !

لەبەر تیژی هەتاوی (رووتی) دوکان
کە هاوار بۆ (قەڵا چوالانە) ئیمساڵ[3]

---

(1) پەپوو : کونەپەپوو، بەووم .. مەلێکە بەتیشکی رووناکی نابینایە و وا ناسراوە کە شوومە و لەسەر وێرانە ئەخوێنێ یا لە هەر کوێیەك بخوێنێ کاول و وێران ئەبێت !
- قاتە: نییەتی ، چنگی ناکەوێ بەڵام لێرەدا بە واتای لێی قەدەغەیە. لێرەدا نیشانەیە بۆ ئەوەی، لە هەر کوێیەك خراپەکار و مرۆڤی ناپەسەند و چەوت و ناڕێك نەبوو دیارە ئەو مەنزڵگایە شادی و خۆشی لێ ئەباری و خەڵکەکەی کامەران و دەم بەپێکەنین ئەژیێ .

(2) سوورقاوشان : گوندێکە لە نزیك موغاغ و عەواڵان لای چەمی رەزانەوە

(3) هەتاوی (رووتی) دوکان : مەبەست لەوەیە کە خەڵکی شاری سولەیمانی لە سەرەتای نەورۆز و بەهاردا شایی و سەیران لە ناوچەی دوکان ئەکەن .. ئەو ساتە تینی خۆر گەرمێکی ئەوتۆ نابێت کە پێی قاری بێ .. بۆیە لەو دەشتە و لەسەر فەرشی سەوزەگیا و گوڵاڵە و نێرگز کات بەسەر ئەبەن... کەچی کە تینی هەتاو تیژ ئەبێ ناوچەکە دار و درەختێکی ئەوتۆی نییە بەشی سەیرانکەران بکات بۆیە روو لە ناوچە و دار و درەختی پایتەختی کۆنی بابان (قەڵا چوالان) ئەکەن .

لەبەر بێ ئاوییە .. سەیرانی دوورم
کە نیازی حەوزەکەی (بۆکانە) ئیمسالّ[١]

لەبەر پشکۆی کوژراوەی باخەکەی شێخ
کە (مەیدان) وا لە کانیسکانە ئیمسالّ .. ! !

بەزیوم من لە ئاستی (پیرە) (ڕێکەوت)
کە ڕێکەوت زێڕی ژێر (فنجانە) ئیمسالّ

تەلاشی بێ (تەلاّ) هەروەك تەلاّشە ... !
کە (ئایەت) (ئایەتی گیرفانە) ئیمسالّ[٢]

وەرە پێشێ .. کزی چاو و نەخۆشم
نزیکیت (دارە) هەم گۆچانە .. ئیمسالّ .. !

تروسکەی سەرفرازی و چاوی خەمخۆر
وەکو ئاوات و (ئاوی مانە) .. ئیمسالّ[٣]

*****

---

(1) (بۆکان) شارێکی خنجیلانەیە لە کوردستانی ئێراندا و دانشتوانی خۆش مەشرەبن و هونەرمەندی بە ناوبانگی وەك حەسەن زیرەکیان تیا هەڵکەوتووە

(2) تەلاّشی : بەو توێکڵە تەنکە ئەوترێ کە لە دار و تەختە ئەگیرێ .

ـ تەلاّشی : مەبەست لە هەولّ و تەقەلاّ و تێکۆشانە تەلاّ : ئالّتون . بەیتەکە وردەکاریەکی جوان و هوشیارانەی تیا چنراوە، شاعیر لایەنە ڕەوانبێژییەکانی ڕەچاوکردەوە .. مەبەستی لەوەیە کە هەولّو تەقەلاّ، بەرهەم و بەرێکی بەکەڵك و چاکی نەبێ ئەوا ئەو هەوڵە بێ بایەخ دەرئەچێت .. کەئەگەرچی هەولّی خەلّکی و ئایەتی سەر زمانیان هەر بۆ گیرفان پڕ کردنە .

(3) (ئاوی مان): ئاوی زیندەگانی، هەمیشەییە کەئەڵێن خدری زندە ئەو ئاوەی خواردۆتەوە و تەمەنی هەمیشەی پێ براوە .

# دڵی کورد

١٩٧١

یەکەم جارە ... مارو دووپشك
سوێند خۆرن...
بەرەو بەفراوی تواوەی
راستەقینە...
لەکیسفەنی بەرخۆڵەدا
رەو میچرگی خۆشەویستی
دەس لەسەرووشەکانی
یەزدان ئەکێشن..!
ئەچنە ژێرهێلانە دێرینی
بولبولە سروود خوێنە
پێشینەکە..!
لەکاتێکا چاوی دەنووکی...
پڕی .زلەفرمێسکی بڕواو لێ
بووردن..!!
لەگەڵ .. هەموورەنگێکی پیرۆزی
گۆمار
رەنگی ئاسمان
لەگەڵ هەر تروکاندنێکی

## دڵــــی پڕیخورپــــەی بولبولــــە

سروود خوێنەکەدا... بۆ ئازادی
کورد
ژەری بۆمبا...
چزووی ناپاڵم
ئەڕژێتــــە نــــاو هێلانەکــــەی
بەلام
بــــەلام.. سروســــتی جــــیڕی
کوردستان
کــــەرەقترە لەملیۆنــــەها
سمــــی ولاخــــی داگیرکــــەرە
هاتوچــــۆکەرەکان...
ئەوسروشتەی کە چووتەناو پێستی
سەرۆك (بارزانی)یەوە
هیچ تیغێک کاری لێ ناکا
چونك دڵی کوردە[1]
***

(1) چەپکێ شیعر وسۆزی سلیمانی بۆ بارزانی ، ئامادەکردنی: زانیار قرگەیی، چاپی یەکەم، چاپخانەی رۆژهەلات،هەولێر، ٢٠١٢، ل٨٦

# بەربەرەکانی (*)

## ١٩٧١

لەو دەمەوە سووتووی (ڕۆما) ی سووتاو باری
کە (با) هێنای بۆ ئەم ناوە .. بە دیاری[1] !

کە .. پزیشکی خوێنی زەردی (نەیرۆن) پڕا
کە چەرمەکەی قرچ هەڵگەڕا .. لەدەم کەژا[2]

---

(*) بەربەرەکانی – لەگۆڤاری – رۆژی کوردستانی ژمارە چواری ساڵی دووەم – حوزەیران ١٩٧٣ لە لاپەڕە (٤٤) بڵاوکراوەتەوە .

(1) لەو دەمەوە : لەو ساتەوە ، لەو کاتەوە .

- سووتوو : هەندێ شتومەك کە ئەسووتێنرێ پاشماوەکەی پێی ئەوترێ سووتوو ، وەك ئەوەی جگەرە ئەکێشرێ و ئەسوتێنرێ ، پاشماوەکەی پێ ئەوترێ : سووتوو ، سووتوی جگەرە .

باری : بۆ سووتوکە ئەگەڕێتەوە واتە سووتو دوای سووتان هەڵئەوەری و گەردەکەی بەرز ئەبێت و ئەکەوێتە خوارەوە .

رۆمای سووتاو : رۆمای پایتەختی ئیتالیا لە لایەن نەیروونی خوێنڕێژ و دکتاتۆرەوە سوتێنرا کەچی لە کاتی سووتانی شاری رۆمادا دەستی کرد بە قاقای پێکەنین .

(2) نەیرۆن : مەبەست لە نەیرۆنی ئیمپراتۆری ئیتاڵیایە و لە جەور و ستەما ناوبانگی دەرکردبوو .

- پڕا : بۆ مێشك و کەللەی سەر بەکاردێت .

- قرچ هەڵگەڕا : وشك و رەق بووەوە .

- لە دەم کەژا : روو و بەردەمی چیا و کێو .

به شیرینی هەچ (گولێ) (دەم) ئەکاتەوە
لەم .. ولاتە .. (فەرهاد)مان بیر ئەخاتەوە[1]

لەو ساتەوە .. راست یا درۆ
کە مێشك و گۆشت .. بوون بە پشکۆ[2] !

چزان .. بە چاوی (نووقاوی) ئەژدەهاکا
بوو بە (لاوك)لەسەر چیا و لە ژێر خاکا[3]
لەو ئەفسانەی (مار کوشتنە) .. راست یا درۆ
ئەم ولاتە (قوربانی) گرتۆتە ئەستۆ[4] .. !

---

(1)شیرین : پەنجە بۆ شیرنی ناو حکایەت و ئەفسانەکە، براوە .

- دەم ئەکاتەوە : خونچە کە ئەپشکوێ و دەم ئەکاتەوە (دەم) بە زمانی عەرەبی (دم) واتای خوێن ئەبەخشێ ، واتە هەر گولێ کە دەمی ئەکاتەوە رەنگە سوورەکەی نیشانەی خوێن بارینە .

- فەرهاد : مەبەست لە فەرهادی کوەهکەنە کە لە پێناوی عەشق و گەیشتی بە (شیرین) گفتی ئەوەی نیشانەی هەولێ و تەقەلا و رەنجی بێهودە لە کەلتووری کوردیا ئەبەخشێ.

(2) مێشك و گۆشت .. بوون بە پشکۆ : مەبەست لە راستی و دروستی ئەو سەرگوزشتەی کاوە و زوحاکە هەموو رۆژێك مێشکی دوو لاوی کوردی دەرخوارد دراوە .

(3) ئەژدەهاك : زوهاك .. لە ئەفسانەی یەکەم رۆژی نەورۆز و بەرپا بوونی شۆرشەکەی کاوەی کورد دژی زوهاك و کاوە بە چەکوشەکەی دەستی مێشکی ئەپرژێنێ و ئیدی لەو ساوە (لاوك)ەکان باسی جوامێری و قارەمانی ژیانی کورد ئەکەن.

(4) ئەفسانەی مار کوشتن : مەبەست لەوەیە کەوا باوە دوو مار لەسەر شانی زوهاك پەیدا بووە و هەموو رۆژی میشکی دوو لاویان دەرخوار دراوە

لـــــەو ڕۆژەوە نـــــاوی (دێهاتـــــەکان) گــــۆڕا
بـــــوو بـــــە (ڕۆمـــــی) و (شـــــەترەنج) دۆڕا[١]

دار چــــوالەکان .. هەڵپاچـــــران .. داپاچـــــران
نێرگزکــــــان (بنجکـــــەن) کـــــران دەرهێنـــــران[٢]

ئـــــەم وڵاتـــــە .. مووچـــــە و بـــــەراتی .. کوشـــــتنە
بەندکردنـــە .. ئەســتۆ لـــە نێڵەکردنـــە .. خنکاندنـــە[٣] !

---

(1) ناوی دێهاتەکان گۆڕا : واتە کـاتێ داگیرکـەرە مـەغۆل و تەتـەرەکان ڕوویـان کـردە خـاکی نیـشتمان و دەسـتیان بەسـەر ئـەو وڵاتـەیا گـرت خێـرا و دەمودەسـت نـاوی دێهاتەکانیان لە کوردییەوە بۆ ڕۆمـی گـۆڕی وەك ناونـانی دێهاتـە کوردییـەکان بـۆ : (ئووچ تەپە ، قەرەگۆل ، ئاڵتون کۆپری).

ـ شەترەنج دۆڕا : مەبەست لە وەیە ، کاتێ هێز و ئـۆردوی بێگانـە و داگیرکـەران هاتنـە خـاکی کوردسـتانەوە پـاش ئـەوەی بەرگریکـەرانی کـورد و سـەرکردایەتی یـەکانیان کوشتن و ئیدی زەویان بۆ تەخت بوو ، تا بە ئارەزووی خۆیان تەراتێنی تیا بکەن .

(2) دار چوالەکان : دار چوالە نیشانەکەی پیرۆزە لای کوردەواری .

ـ هەڵپاچـران .. داپاچـران : واتـە گـەڵا و گـوڵ و چـڵ و لقـی دار چـوالەکان بـە تـەور و تەورداس ئەبڕاو لێ ئەکرایەوە .

ـ بنجکەن : واتە بە ڕەگ و ڕیشە و بێخەوە ئەڵئەکەنرا و دەرئەهێنران .

(3)مووچە و بەرات : بە واتا ، خێر و بێر ، بەرهەم و بەروو بوومی .

ـ ئەستۆ نێڵەکردنە : مل و گەردنیان بە واتایەکی دی جەستە بـۆ نـاو نێڵـەی ئـاگر فـڕێ ئەدرێ .

لەو رۆژەوە ، لـەو ساتەوە هـەر لـەو دەقیقـە و کاتـەوە
کە خوێنـە خـۆی دێرینەکـە ((کتێبەکـەی)) ئەکاتـەوە[1]

لـــەو دەمـــەوە کـــە (ریـــچ) گەیـــشتە سەرچـــنار
تۆوی پیلان ، هی ژێردەستی بۆ ئەم کوردە هێنا بـە بـار[2]
دوژمنـــی خوێنـــە خـــۆیی ئێمـــە داگیرکـــەرە
(مـــام ئینگلیـــزە) ئیمپریـــالیزم و نۆکـــەرە[3]

***

---

(1)خوێنە خۆی دێرینەکە : مەبەست لە دوژمنی هەرە کۆن و خوێنـەخۆی کـوردە ، کـە ئینگلیزە .

(2) ریچ : مەبەست لە میستەر . (جیمی کلۆدیوس ریچ)ە کە لە کاتی گەشتەکەیا ساڵی ١٨٢٠ لە بەغاوە و رێگای پیادە کفری و سەنگاوەوە خۆی گەیانە شاری سولەیمانی کە لەو ساتەدا — ئەمارەتی بابان — لە گوڕ و هێز و شەوق و شەفافا بوو، مـەحموود پاشای بابان ئەمیری ئەمارەتەکە و پیاوە گەورەی بابان بوو، پێشوازیەکی کوردانـە و میوانداریەکی مەردانەی مستر ریـچی کـرد و لـە هاوینەهـەواری ئێستای سەرچـنار خێوەت و دەواری بۆ سازکرد و شوێنی حەوانەوەی بۆ خۆی و دەست و پێوەنەکەی ئامادەکرد، کەچـی لـە بریتـی پیـاوەتی و چاکەدانەوەی ئـەو میوانداریيـە هـەر کـە گەیشتە سەرچـنار داوی پیلانـە چـەپەڵەکەی دژی کـورد و ئـەمارەتی بابـان چـنی و پەیتا پـەیتا راپۆرتی بۆ بەریتانیا و لەرێگای ئەوانیشەوە بۆ داگیرکـەری راسـتەوخۆی ئەوسای کوردستان کە دەوڵەتی عوسمانی بوو نارد، گوایە کـورد و مـەحموود پاشـا ئەیانەوێ دەوڵەتی کوردی دروست بکەن .. بەو بیـانووەوە عوسمانیـەکان هێرشـیان هێنایە سەر ئەمارەتی بابان و زیانی گەورەیان بە شاری سولەیمانی گەیان .

(3) مام ئینگلیز: رۆژگاری پڕ لە ستـەمی کـورد و تاقیکردنـەوە مێژووییـەکان، راسـت و رەوان ئەوەیان سەلماندووە کە دوژمنی خوێنە خۆی کورد داگیرکەر و ئیمپریـالیزمی رۆژی وایە بەتایبەت ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و نۆکەرەکان .

# ڕووداوە نەبڕاوەکە[*]

- ١ -

کوێستانەکان،
دەردەداری کەمخوێنی بوو!
ورتەی شەماڵ
لەگەڵ گوێچکە نهێنی بوو!
(شەپ) زوو هات
(گڕە) سوور بوو
دۆزەخی وەرز
پڕ لە (مۆر) بوو
گەلا
وەکو (سی) سیلاوی
کوناودەربوو
کەو هەر لە (کەربەلا)ی شاخا
دەنوك و قاچ خەناوی بوو[1]

(*) بەشی یەکەمی ئەم شیعرە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (١٥)، ساڵی سێیەم، کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ وەرگیراوە.

(1) وا دەگێڕنەوە، وەکو ئەفسانەیەك کە (کەو) بۆیە پێ و دەنووکی سوورە چونکە لە خوێنی حەسەن و حوسەیندا لە کەربەلا چینەی کردووە .

(کۆڵوو) گوڵ بوو[1]

(چاوگ) چڵ بـــوو

کوێستانــــەکـــان

دەردەداری کــــەمخوێنی بــــوو

تـــرێ هــــەر زوو

(ئــــاڵ و بۆڵ) بوو

هــــەمــــوو شتـێ

لە کــوێستـــانـــا

ئــەهات بــە شــوێنی زســتانا[2]

کـــەو هەر لە کەربەلای شاخا

چیــــنــــەکەر بوو

لــــەناو تۆفــــانێکی ئاخــــا

قاسپـــە تـــاڵ بوو

تـــاقتــــاقـــکەرە

وشـــەی زاڵ بــوو

(ورچ) لاواز بـــوو[3]

قەد باریك بــــوو

تیـــشکی ڕۆژی لا تاریـــك بـــوو

---

(1) (کۆڵوو) ئەو پەراوێزی نانەیە کە دەسووتێ و دەبێ بە خەڵووز.

(2) لەبەر نەبوونی لە هاوینیشا گەرمی نەدەبووەوە وە هەموو شتێ رووت بوو.

(3) ورچ: مەبەست لە مرۆڤی ئینتیهازی و مونتەفیعە بێ ئامانجەکانە بە نیسبەت میللەتەوە.

بێ بـــۆڵە بـــوو

ئـــەوەی لـــە دەفتـــەریا نـــەبوو

ئـــەنجام ســـەندنی تۆڵـــە بـــوو

ساڵ ساڵێ بـــــوو

بۆ داگـــیرکــــەر

هێـــرش هێـــنەر

گورووی مناڵێ بوو

نـــووستووی دەرەو

قەدپــــاڵێ بـــوو

تار

پەراســـووی کاکـــە مـــەم بـــوو

دەف

سەرســـینگی خـــاتوو زیـــن بـــوو

پەرداخ

پـــڕ لـــە شـــەڕابی نەســـرین بـــوو

ئاهەنگ

ناشـــــتنی فـــــەرهاد بـــــوو

هەور

دووکــــــەڵ بـــوو

دووکـەڵ هەناسـەی کوێـستان بـوو

ســـووتاندنی کوردســـــتان بـــوو.

- - -

## بەشی دووەم(*)

- ٢ -

کوێستانـــەکـان
دەردەداربـــوون
چەند سووڕێ بوو
بێ بەهـــار بوون
بـــەو درمـــەوە گرفتـــار بـــوون

لەپڕ!،
دووچـــاری ئـــازار بـــــوون
چـاوی پـــشکۆی ئەشـــکەوتەکان
کـــــەوتنە گل
دڵـــــی لەگۆکـــــەوتووی (ملـــــە)
هاتـــــەوە (پل)
برژانگـــــی هـــــەڵوەریوی بـــــیر
کەوتەوە مشت
دەرگـــای شوورە
کرایەوە
تووتی

(*) بەشی دووەمی ئەم شیعرە لە گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە (١٦)ی شوباتی ١٩٧٤ بڵاوکراوەتەوە.

بـــــەبانگی پـــــڕ قیـــــژەی
هـــــاواریـــــکرد
برایـــەوە برایەوە
گۆی هــــونەریش
برایـــەوە
قارچـك[1]
لـــــــەپێش وادەی خۆیــــــــا
کـــــــەوتە بازاڕ
بەهێ پشـــــکووت
هـــــاوین لەگـــــەڵ زســـــتان[2]
جــووت بــوو (لــووت و بــزووت)
بەهـــــار زوو هات.
نەســــــرین لەگـــــــەڵ لاولاو
بەیـــــەك گـــــەیین
کــــــــۆتر بەبـــــــەردەمی
بازا هات
بێ گلەیی
چۆپی گیرا

---

(1)مەبەس لە بێ رەگی و بێ جێیبە کە قارچك هەڵئەتوقێ و مەبەستیش لە ئینسانە بێ ئەساسەکانە.

(2) مەبەست لە کۆبوونەوەی تەناقزاتە، کۆبوونەوەی دژەکان.

مەشـــــــخەڵ
چـــــرای ڕۆن گەرچــــەك بــــوو
ســــەر لــــە ئێــــوارێ هــــەڵكرا
كۆڕ گەرم بــــوو
چــــــەواڵ نــــەما
كتێــــب بــوو بـــە ســــووتەمەنی

شــــەو نــــــەرم بوو
تــــازە تــــــەشپی
زێــچكەی ئەبەســت بـۆ ســـەمەنی
مــــــام سمـــــۆرەش
ئــــــەو ڕەســــــــەنە
دەســــــــت و پەنجـــــــە و پــــــێ
بەخەنە
زیـــــــت زیـــــــت ئەبلــــــــەق
ئەیــــــــڕوانیـــــــــیە
ئەم دیمـــــــــــــەنە
سەرسوڕمـــــابــــــوو
تیا وەستـــــابــــــوو
سەرنـــــــج ئــــــــەدا
كــــــــوێ هێجـــــــگار

کووڕ و هەورازە

بۆ خاوەن بیر

ئەوێ ڕێڕەو و ڕێبازە

فریشتەکان

قەلفڕ کران

تەرە و رووە و دۆزەخ بران

قەڵەم

ورد بوو درشت کرا

لاپەڕە بێ برشت کرا

سەرنج ئەدا

ڕێگا زۆر سەخت و هەورازە

کەچی بێ باك

ملی شیعر

خراوەتە ژێر قەرازە

گەردنی تیپ

بەبێ کێشە و بێ چەڵەمە

خراوەتە ژێر کەڵەمە

- - -

## بەشی سێیەم[*]

- ٣ -

سەرنج ئـــەدا

درکـــــەزی و (کەڵـــــەوێ)[١]

بـەبـــــار

چـــەمـــۆڵە

لەنـارنج ئەنێ

(هـــەر گـــەروونـــە)[٢] و

قەتـار قـــەتار

مـوتـــربـــە

لـــە ترنج ئەنێ

تاجی ئاوریشمی

پەری

لـــەسەر سەری

درنـــج ئـــەنێ

دەست وبازووی

دژی بـــەهـــار

---

(*) بەشـی سـێیەمی ئـەم شـیعرە لـە گۆڤـاری رۆژی کوردسـتان، ژمـارە (١٨،١٧)، حوزەیران و تەمموزی ١٩٧٤ بلاّوکراوەتەوە.

(1) کەڵەوێ: درکێکی ئازاردەرە

(2) گەوون: درترین درکە، کەتیرەی لێ دەردێ.

(پێمەڕە) [1]وا لەبنـــج ئـــەنێ!!
ئەی فریشتە
دەرگـــــا
هـــــەمووی لەســـــەر پـــــشتە
بۆ پەلەوەر
بۆ باڵنـــدە
بـۆ سـەرکەوتوو رووە و کوێـستان
بـــۆ رافـــراو بـــەرەو گـــەرمیان
تـەنـــیـــــا
تاکەمەڵێ نەبێ
لـــەم سروشتە
دەرگای بەندی
لەســـەر پشتە
لەسـەر خوێنـدن لەسـەر (بەسـتە)
ئـــەویش بولبـــولی سەرمەســـتە.
بۆ گوڵ خوێندی
قەفـــەس کـــرا
بـــۆ ئـــەم چـــڵ و ئـــەو چـــڵ
وتـــــــی
لـــــــەم لا و ئـــــــــەو لاوە

---

(1) پێمەڕە: پاچ.

بەس کرا
بۆ باخ فەرمـــووی
بۆداخ فـــەرمـــووی
کۆت و زنـــــجیر
لە دەس کــــرا ! !
بەڵام خوێنـــــدی
هەر ئەشخـــوێنـــێ
هەتا کوێستـــــان
رەنـــــگ و رووی
جاران هــــــەڵدێنێ
هەتا کـــــوێستان
زەردی
لە چاوا نــــامێنێ
هەتـــا کوێستـــــان
دڵۆپی
فرمێسکی یاقــــووت
بەسەر
سەیوانا ئەڕژێنــــــێ
تا کوردستـــــــان
تۆڵە لە چــــــەرخ
ئـــــەستـــــێنێ.
*****

# دەردی دڵ، دڵی سەوزم* (١)

دەردی دڵ نووزە دریژێکە کە من دەیزانم
داستانێکی چ گێژێکە کە من دەیزانم
شۆری گڕ بادە و پەیمانە لە مێشك
سۆز و ئاوازی چ بوێژێکە کەمن دەیزانم
توێخی ئەژنۆ چوون و ئانیشکی نزا
مەرج و پێویستی چ نوێژێکە کە من دەیزانم
کێ تەریکە لە دڵ و پشت لە دڵە
خاوەنی رستی چ کاوێژێکە کەمن دەیزانم

* * *

دڵی سەوزم لە زەردی تۆ دەلەرزێ
لەساردی تۆ گەرم بۆ تۆ دەلەرزێ
لە دووریتا وەکو ئاهوویی گیراو
لەناو داوا بەهۆ و بێ هۆ دەلەرزێ
لەبەر دەمتا لەکاتی تێپەڕینا
وەکو مووێك نزیك پشکۆ دەلەرزێ
وەکو ئەو ئێوارەیەی مانگ کەوتە خوارێ
وەکو پەردەی دەمی ئاسۆ دەلەرزێ
دڵم خوێنە گوڵە ئەندام و جەستەت
بەخوێنی دڵ وەکو شەوبۆ دەلەرزێ

***

(*) ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٧٦ لە سلێمانی نووسراوەو لەلای کاك هونەر دیلانە.

# شەپۆل(*)

شەپۆل شەپۆل
لەگەڵ دەریای ژیانا
هاتین
ڕۆیین
بە دووتوێی
ئاسمانا(1)
هەندێ خەیاڵ
هەندێ
راستی و دروستی
گێژاومان کرد
بست بە بستی
دەریای هەستی

(*)ـ ئەم شیعرە (شەپۆل) — لە ژمارە (٣٥)ی ساڵی ١٩٧٦ ی گۆڤاری — ڕۆژی کوردستان — دا بڵاوکراوەتەوە .. شیعرەکە شێوەی هەنجن و ئازادی لە ئامێزگرتووە .

(1) توێی : ئەوترێ توێی ئاو ، مەبەست لە چینی هەرە سەرەوەی توێژاڵی ئاوەکەیە ، بەڵام لێرەدا بە مەبەستی (چین) — تەبەقە — دێت . وەك ئەوترێ حەوت تەبەقەی ئاسمان ، واتە حەوت چینە لەسەر یەکەکانی ئاسمان .

کـــــه بێنـــــــه ســـــــەر

ڕابردووی

پــــــڕ (ئەشـــــــکەنجە)[1]

گرێـــــــــــی دڵـــــــــــه

وەك برینـــــــــــــــــــــــی

(شێرپەنجە)[2]

گـــرێی چـــاوە

تـــاکە تـــاکەی

(نیـــگاری) ! !

ئـــارام بـــــەرە

تاسەی

وەکـــــو (بـــــزماری) ...[3]

کـــام تاســـــەیان یـــادێکی

با (هەوایـە)[4]

ژان هێنـەرە

---

(1) ئەشکەنجە : ئازاردان ، لێدانی بەسوێی

(2) شێرپەنجە : سەرەتان .. کە دەردێکی کوشندەیە و تائێستا چارەسەری تەواوی بۆ نەدۆزراوەتەوە و زانست لەبەردەمیا دۆش داماوە .

(3) وەکو (بزماری) : واتە وەکو بزمار ئەچەقێ و دائەکوترێ . .

(4) با (هەوایە) : ئارەز و مەندانە ، خۆش و بەچێژ . .

وەك خۆی

بـــۆ (بـــرین) وایـــە! ..

گوێزانێـــکە

بۆ قەتماغەی

زامـانـــمان

دڕکـی تیـژە

بـــۆ ســـەر هـــەتا دامانمـــان

لە بەهـــارا

هـــەر کـــویێ ئـــەچووی

زستان بوو

لەهاوینـــا

(چـــــزە)

لـــە پێست

هەســـــــتان بـــــــوو... !

کووچـــــــــە نــــــــــەما

تیـــیـــا[1]

نەگەڕێین

(1) کووچە : کۆلان ، گوزەر .

پەتیارە[١]..

شەقام نەما

نەی پشکنین

بێ چارە..!

کوننەبەبوو

ئاواز خوێنی[٢]

شەوگار بوو

(فیرنەگولە)

بولبولی[٣]

مێرغوزار بوو

قەلە رەشکە

دەنگ نووساوبوو

لە راستمان

---

(1) پەتیارە: شێت و شەیدا، ئەوەی کە لە رووی هۆش و بیرەوە تێکئەچێ..

(2) کوونەبەبوو : کونەپەپوو : باڵندەیە کە لە قەوارەی کۆترێك کەمێ گەورەترە و وا باوە کەوێڵی کاولە و شوێنی چۆڵی و وێرانەیە، هەر لەبەر ئەوە لە هەر شوێنێکدا بنیشێتەوە وا باوە کە گوایە ئەو شوێنە کاول و وێرانە ئەبێ، ئەم باڵندەیە دەنگێکی زۆر ناسازی هەیە..

(3)فیرنەگولە: مەلێکی بچوکی قێزەونە لە قەوارەی چۆلەکەیەك بچوکترە و دیمەنێکی ناشیرین و دەنگیشی ناسازە و لەم چڵ بۆ چڵ هەڵئەقونێ .

هەر (توانــــج) بـــــوو

وەلامـــــی هەســــت و

خواســــــــــــتمان

...

دەرد و دوو بـــــــــوو

بــەروبومی بێــستانمان[1]

هــــەر (شـــەرا) بـــوو[2]

شنـــــەی

شـــەنگی کوێـــستانمان

هێرۆ... [3]

زەردبوو

نۆر

---

(1) دەرد و دوو : دەرد و بەلا . ناخۆشی و پەژارەیی

- بەروبومی بێستانمان: بەرهەمی وەك کاڵەك و شووتی و ترۆزی..

(2) شـەرا: گەرمایـەکی بـەتینی قرچـەی هاوینـە، کـە لـە کاڵـەك و شـووتی ئـەدا، بـە جـۆرێکی ئـەوتۆ ئەیگـەیێنێ کـە کـەڵکی خـواردنی پێـوە نـەمێنێ و شـێوەی نیمـچە (ترشاوی) لێ ئەکات و لەو حاڵەتەدا خواردنی زیانبەخشە

(3)هێرۆ : گوڵێکی هاوینەی جوانی بالا بەرزە و رەنگی سوور و پەمـەی و سـپی هەیـە، رەنگی زەردی نییە .. رەنگی زەرد لێرەدا بە مەبەستی سیس بوون هاتوون .

زەردتر بوو

لە پـــایز

(سێبـــەڕۆی) بوو[1]

مام باپیر و

مـــــام بـــایز

ئـــــەوا ئێــــستــــا ...

وەرز

رووە و بـــــــــــەهارە

چـــووزی

نێـــرگس

گەشاوەیە

دیـــارە

بنارەکان

ســــــەوز و روونــــــاك

ئەنـــوێنن

چنارەکان ...

زەرکەفت

هەڵئەورێنن

---

(1) سێبەڕۆ: ناوی نەخۆشیەکە لە وێنەی (گرانەتا)..

# ئەوا دیسان

# تەمەن

# لە نویَ نووسراوە

# (شەوی بەرات) [1]

---

(1) شەوی بەرات: لە نەریتی ئاینیدا وا باوە لەو شەوەدا تەمەن سەرلەنویَ ئەنووسریتەوە..

لەشاری سلیمانیا وا باوە ئەو شەوە (شەوی بەرات) مالآن خواردنی باش بۆ شەو ریکئەخەن و مۆم و بوخورد و داری عوود ئامادە ئەکەن ، کە هەر یەکەیان توورەکەیەکیان پێیە کە ئەگەنە بەردەرکی هەر مالێك بە کۆمەلّ ئەلێن : شەوی شەوبەراتیّ خوا دوو کوڕ و کچێکتان باتیّ دەست لە کەنو بگێڕن بەشی منالآن بنێرن.

گەر خاوەن مالّ دوا کەوت و درەنگ دەرگای کردەوە ، یەکیّ لە منالەکان ئەلّی : دەی زووکەن بەراتیکەن .

خاوەن مالێش بۆ دلّخۆشیان ئەوەی ئامادەی کردوە ئەیانداتیّ .

ـ تا ئەدیب خۆی لەژیانا ما بێت ، وەك مافێکی سروشتی خۆی بۆی هەیە دەستکاری زادەی بیری و بەرهەمەکانی بکات .. پیابچێتەوە گولّبژێری بکات و لێی کەم یا زیاد بکات.

سەبارەت بە (دیلان)ی شاعیر کە بەلای منەوە یەکێکە لە لوتکە هەرە بەرز و سەرکەشەکانی شیعری نوێی کوردی، هەروا لە خۆوە ئەم حوکم و بریارەم نەداوە .. شارەزایی و وەستایی و خاوەن بەهرەیی و توانای لەبن نەهاتووی شاعیر ئەوەی سەلماندووە. هەر چەندە ئەبوو لە لێکۆلّینەوەکەدا راستەوخۆ پەنجەم بۆ شیعری شەپۆل ببردایە و لێهاتوویی (دیلان)م لەم بوارەدا باشتر و رونتر و بە قوولّتر دەر بخستایە.

(دیلان) عاشقێکی راستگۆی شیعری کوردییە و هەمیشە لەگەلّیا ئەسووتیّ ، ئەوەتا شیعری (شەپۆل) سیّ شێوە بەهرە و لێهاتوویی و توانا و سەلیقەی شاعیر دەرئەخات و بە شێوەی ئازاد و چراو، ئەوسا کە لە دەم یەك ئەدرێن شێوە (شیعری) موقەفا و کلاسیکی لە ئامێز گرتووە، دوا جار هەر هەمان شیعر بە شێوەی (موستەزاد) نووسراوە .. لەهەموو حالەتەکاندا نیشانەی ئەوپەڕی توانای هونەری شیعری (دیلان) دەرئەخات.

شیعری (شەپۆل) بەتەنیا خۆی ئەوەی لەباردایە کە لێکۆلّینەوەیەکی دوور و درێژی ئەدەبی لەسەر بنووسریّ و لایەنی بەرزی هونەری شیعری دەربخریّ .

له ئیمڕۆوه

به سراوه ...

مێــــــــرگ ئه‌گــــــــه‌ڕێین

له (نیسانا)

بۆ (خورپه)

کوێــــــــستان ئه‌کــــــــه‌ین

له چله‌دا

بــــــــۆ (گورپــــــــه)

دار

ئــــه‌نێژین

گــــــــوڵ ئه‌نێــــــــژین

گــــوڵاڵه ....

کام ئه‌چێژین

کــــــامی هــــــــه‌نگوین

هــــــه‌ڵاڵه

*****

# شەپۆل

شـــەپۆل شـــەپۆل لەگـــەڵ دەریـــای ژیانـــا
هـــاتین .. ڕۆیـــین بـــە دوو تـــوێی ئاسمانـــا
هەنـــدێ خـــەیاڵ هەنـــدێ ڕاســـتی و دروســـتی
گێژاومان کرد .. بست بەبست دەریای هەستی

کـــە بێنـــە ســـەر ڕابـــوردووی پـــڕ ئەشـــکەنجە
گرێـــــی دڵـــــە وەك برینـــــی شـــــێرپەنجە
گرێـــی چـــاوە تاکـــە تاکـــەی نیگـــاری
ئـــارام بـــەرە تاســـەی وەکـــو بزمـــاری

کـــام تاســـەیان یـــادێکی بـــا هەوایـــە
ژان هێنـــەرە وەك خـــوێ بـــۆ بـــرین وایـــە
گوێزانێکـــە بـــۆ قەتماغـــەی زامانمـــان
دڕکـــی تیـــژە بۆســـەر هـــەتا دامانمـــان

لـــە بـــەهارا هـــەر کـــوێ ئەچـووی زســـتان بـــوو
لـــە هاوینـــا چـــزە لـــە پێـــست هەســـتان بـــوو

کووچـــە نـــەما تیـــا نەگـــەڕێن پـــەتیارە
شـــەقام نـــەما نەیپـــشکنین بـــێ چـــارە
کوننەپـــەپوو ئـــاواز خـــوێنی شـــەوگار بـــوو
فیڕنەگولـــە بولبـــولی مێرغـــوزار بـــوو

قەلە رەشکە دەنگ نووساو بوو لە راستمان
هەر توانج بوو وەڵامی هەست و خواستمان
دەردودوو بوو بەروبوومی بێستانمان
هەر شەرا بوو شنەی شەنگی کوێستانمان

هێرۆ زەرد بوو زۆر زەرد تر بوو لە پاییز
سێبەڕۆی بوو مام باپیر و مام بابیز
ئەوا ئێستا وەرز روە و بەهارە
چووزی نێرگس گەشاوەیە دیارە

بنارەکان سەوز و رووناك ئەنوێنن
چنارەکان زەرکەفت هەڵئەوەرێنن
ئەوا دیسان تەمەن لەنوێ نووسراوە
شەوی بەرات لە ئیمڕۆوە بەسراوە

مێرگ ئەگەڕێن لە نیسانا بێ خورپە
کوێستان ئەکەین لە چلەدا بێ گورپە
دار ئەنێژین گوڵ ئەنێژین گوڵاڵە
کام ئەچێژین کامی هەنگوین هەڵاڵە ..
*****

# شەپۆل

شەپۆل شەپۆل لەگەڵ دەریای  ژیانا
هاتین ... ڕۆیین بە دوو توێی  ئاسمانا
هەندێ خەیاڵ هەندێ ڕاستی و  دروستی
گێژاومان کرد ... بست بە بستی دەریای  هەستی
کە بێنە سەر ڕابوور دووی پڕ  ئەشکەنجە
گرێ ی دڵە وەك برینی  شێرپەنجە
گرێی چاوە تاکەی  نیگاری
ئارام بەرە تاسەی وەکو  بزماری
کامتاسەیان یادێکی بە  هەوایە
ژان هێنەرە وەك خۆی بۆ برین  وایە
گوێزانێکە بۆ قەتماغەی  زامانمان
دڕکی تیژە بۆ سەر هەتا  دامانمان
لە بەهارا هەر کوێ ئەچووی  زستان بوو
لە هاوینا چزە لە پێست  هەستان بوو
کووچە نەما تیا نەگەڕێن  پەتیارە
شەقام نەما نەیپشکنین  بێ چارە
کوننەپەپوو ئاواز خوێنی  شەوگاربوو
فیڕنەگولە بولبولی  مێرغوزاربوو

| | |
|---|---|
| قەلە رەشکە دەنگ نووساو بوو | لە راستمان |
| هەر توانج بوو وەلامی هەست و | خواستمان |
| دەرد و دوو بوو بەروبوومی | بێستانمان |
| هەر شەرا بوو شنەی شەنگی | کوێستانمان |
| هێرۆ زەرد بوو زۆر زەرد تر بوو | لە پاییز |
| سێبەرۆی بوو مام باپیر و | مام بایز |
| ئەوا ئێستا وەرز روە و | بەهارە |
| چووزی نێرگس گەشاوەیە | دیارە |
| بنارەکان سەوز و روونـاك | ئەنوێنن |
| چنارەکان زەرکەفت هەڵ | ئەوەرێنن |
| ئەوا دیسان تەمەن لەنوێ | نووسراوە |
| شەوی بەرات لە ئێمڕۆوە | بەسراوە |
| مێرگ ئەگەڕێن لە نیسانا | بێ خورپە |
| کوێستان ئەکەین لە چلەدا | بێ گورپە |
| دار ئەنێژین گوڵ ئەنێژین | گوڵاڵە |
| کام ئەچێژین کامی هەنگوین | هەڵاڵە |

*****

# شیوەن[*]

ئـەو گوڵانـەی دەشـت و کێوانـە بـەرە و سـامانی دڵ
ڕەنگـی ئـاڵی هەڵمـژیوە سـەر هـەتا دامـانی دڵ[1]

ئەرخەوان سوورە ، شـەرابی کۆنی خـوێنی چێشتوە
بۆیـە (یاقوتـە) هـەموو بـەردێکی گۆڕسـتانی دڵ[2]

هێندە ((تفتـە)) کـامی لێـوی نەوشـکۆفەی خونچەیی
بۆیە سـوێرە ئەشـکی چـاوی بێ پـەیی گریـانی دڵ[3]

---

(*) (شیوەن) لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٤٠١) ڕۆژی ١٩٧٧/١٢/٨ بڵاوکراوەتەوە .

(1) سامانی دڵ : مەبەست لەهیوا و کوڵ و کۆی دڵ و دەروونە

- ڕەنگی ئاڵی هەڵمژیوە: مەبەست لە خوێنی دڵە .

(2) ئەرخـەوان : گـوڵی دار ئەرخـەوان خـۆی لـە خۆیـا ڕەنگێکـی تایبەتییـە لـەنێوان سووری جەرگی و ڕەنگی خوێنایە. ئەمـە بـە مـەجاز بەکار هـاتووە. ـ شـەرابی کۆن: ئەو شەرابەی ئەگەڕێتەوە بەنرخ ئەبێت. لێرەدا مەبەست لە خوێنی شەهیدە .

- یاقووت : بەردێکی ڕەنگ ئاڵی بە بەهایە .

(3) نەوشکۆفە : تازە پشکوتوو

- ئەشکی چاوی : فرمێسکی چاوی .

- بێپەی : لەبن نەهاتوو .

دەك نمەككگیربی بەهار وەك ئـەو گوڵـت زوو هـەڵوەران
خـۆت لەبـەر پێـدا بنێـژە كوشـتنە دەرمـانی دڵ[١]

مـەی مـەزەی بـرژاوە، برژانـە هەمیـشە كـاری ئـەو
بۆ چرووكی (مەست ئەكا) هەرگیز چزەی بۆرانی دڵ[٢]

*****

---

(1) دەك نمەك گیربی : جۆرە دوعـا و نزایەكـە بـە واتـای ئـەوەی ئـەو نـان و نمـەك و چاكەیەی بەرامبەرت كراوە ، لە چاوت گیر بێت .

(2) مەی : بادە .

- مەزە : تام و چێژی ترش ، هەروەها بەواتای پێشخۆری خواردنەوە دێت .

- بۆ چرووكی : بۆن و بەرامەی گۆشتی برژاوە .

- مەست ئەكا : خومار ئەكا ، سەرخۆش ئەكا .

- چزە : چزە چز : دەنگی گۆشت برژاندن .

- بۆران : مەبەست با و بۆرانی دەم بارانە .

- چزەی بۆرانی دڵ : چزەی برژانی دڵ .

# ئازارشکێن(*)

شـــەو دریـــژە، درێـــژایی لـــەبن نایـــە
کـــێ شـــەبەقێ ئەخاتـــە ئـــەم دەرگایـــە

کـــەی رۆشـــنایی ئەگاتـــە ئـــا ئـــەم لایـــە
شـــەو درێـــژە، درێـــژی هـــەر چـــوار لایـــە

شـــەبەق دوورە، چـــی گلۆپـــە بـــێ شـــەوقە
شـــەپۆلی شـــەو لەگەردنـــدا وەك تەوقـــە

چـــاو بڕناکـــا، گلێنـــەش لـــەمن ئەوقـــە
ئـــاخ، هاتووچـــۆی ســـێبەری رەش بەزەوقـــە

بـــۆ کـــێ بـــەرم دەســـتی چـــمك راكێـــشان؟
خـــۆ دیـــار نییـــە رێگـــای دووری كاكێـــشان!

نـــە مـــن ونـــە كـــۆڕی گـــەرمی دەروێـــشان!
كۆڕەكـــەی مـــن بـــوو بـــە كـــۆڕی دڵ ئێـــشان

---

(*) ئـەم قەسـیدە ناوازەیـەی دیـلان لەخەسـتەخانەی دڵ هۆنراوەتـەوە.. ئەمـە لـەو شوێنەی پەنجەرەکەی بەسەر چیای گوێژەو ئەزمردا ئەیڕانی.. من ئـەم قەسـیدەیەم لەخەستەخانە بەدەنگی دیلان گوێلێبووە.

ـ ئەم شیعرە بە دەنگی دیلان لەسەر شریت وەرگیراوە.

سەرم گێژە، سەرینەکەم لاخوارە
ئەو بەڕەوەم بە ئاستەمێ لێ دیارە

تەنیشتم کفت بە ورتەیە جار جارە.
هەستم خوێنە، سووك خول ئەخوا ئەمجارە

مۆتەکەیەك لەسەر سنگم وەستاوە
هەناسەم قورس بە دوو چنگاڵ گیراوە

چنگێکی تیژ لەبەر بینم خراوە
ئاخ بۆ فوویەك بچێتە قورگ لەملاوە

*****

# فریشته

ئەی فریبشتەی ئەم شەوگارە درێژە
تۆ پێم نالێی کێ خەریکی نوێژە

ورتەیەك هات وتی کاکە لەمێژە
ئا ئەم کوردە بۆ رزگاربوون بوێژە

خۆ هەر تۆ نیت تۆ تەماشای دەوەن کە
سەختی چیا، بەستەڵەك و سەهەن کە

ئەو دڵانەی لەت لەتی ناو چەمەن کە
تۆ ژان و ئێش وەکو ئەوان پەسەند کە

خۆ تۆ لای خۆی بەستەبێژی ئازاری
بولبولێکی باڵ پێکراوی کەناری

هەر دەگەڕێ باخچەی گوڵی بەهاری
تۆ ئاوازی درێژی سەرچناری

تـــۆ دەنگخۆشـــی بنـــەڕەتی ئـــەم دەردەی
شـــاخ بڕووخـــێ تـــۆ لـــەم بناغـــە بـــەردەی

لـــەبن نایـــەی، تـــۆ سەرچـــاوەی ئـــەم هـــەردەی
تـــۆ ســـروودی نەســـڕاوەی ئـــەم کـــوردەی

لێـــوی چـــیا ســـووك بنێـــرە ســـەر ســـنگت
گـــەڵای بـــەڕوو بکـــرە بەهـــەردوو چـــنگت

دڵـــۆپ دڵـــۆپ بکاتـــە خـــوێن ئاورنگـــت
تێـــر بمـــژە دەمـــی هەڵاڵـــە و شـــنگت.

***

# ئازار شكێن(*)

ئـای چـەند خۆشـە بـە ئاسـتەمێ گـوێم لێیـە
ئـا ئـەم دەنگـە دەنگـی دڵـە هـی كێیـە

ڕێگـــا چـــۆڵكەن، ئازارشـــكێنی پێیـــە
دوو ئاوانـــەی تاڤگـــەی زەڵمـــە، یـــا زێیـــە

ئـەی چارەسـەر ئـەی مەتورفـەی ئاسمـانی
تـۆ ئـەم چـارەت لـە كوێـوە بـۆمن هـانی

تـــۆ خـــەیاڵی یـــا هەناســـەی یـــەزدانی
وا لـــەپ نـــەرمی لۆكـــەی برینـــی گیـــانی

ئـەی لیـو تـەنك، ئـەی پـرچ رەشـەڕەیحانە
چـی تـۆی هێنـا بـۆ سـرەوتی ئـەم گیانـە

كـێ پێـی وتـی سـنگ برینـدار (دیـلان)ە
وەرە پێـــشێ وادەی ئـــاخ هەڵكێـــشانە

وەرە پێـــشێ بەرامبـــەرم راوەســـتە
لێـت ئەپرسـم یـەك دوو وشـەم مەبەسـتە

---

(*)ئەم شیعرە ، بۆ خوالێخۆشبوو نیهایەت عەزیز ئاغا وتراوە

تـــۆ بـــۆ دڵـــت لەگـــەڵ ئـــازار پەیوەســـتە
بەزەییـــــە، ڕێزگرتنـــــە، یـــــا هەســـــتە ؟!

پـــــەیمان بـــــێ لەگـــــەڵ فرمێـــسکی چـــاوا
لەگـــــــەڵ پرچـــــی ئاڵۆســـــکاوی تاوتـــــاوا

هـــــەتا شـــــێوەی ئـــــێش بمێنـــــێ لـــــەناوا
شـــــەرتە نـــــەڵێم، هـــــەرگیز نـــــەڵێم ماڵئـــــاوا

شـــــکۆفەی ژینـــــی عـــــومرم نەوبـــــەهار بـــــوو
وەکـــــو پـــــشکۆ لـــــە شـــــەوگارا دیـــــاربوو

تەمـــــەن کورتـــــە وەکـــــو کـــــورتی گوڵاڵـــــە
لـــــەلێو ئـــــەڕژا بـــــەخوڕ ئـــــەو خوێنـــــە ئاڵـــــە

لـــــە کـــــوێن خوشـــــکان ئێـــــوەن دەشـــــتی ژێـــــنم
دەبـــــا ســـــکتان بنێنـــــە جـــــێ ســـــەرینم

بەکۆمـــــەڵ لێـــــو بنێنـــــە ســـــەر هەناســـــەم
ئێـــــوەن کـــــردەم و ئـــــەنجام و هەناســـــەم

*****

# سێبەری پەرت

**١٩٧٨**

گڕەی چلەکەی ئیمساڵ گەرم بوو    سکڵ باران بوو
بای باوەشێنی جاران نەرم بوو[١]    شنە هێنان بوو
سێبەری خەستی ئارەق فڕێن بوو    لەو شاخ و داخە
پشووی ژێر گەلای گڕە بزێن بوو[٢]    لەو دۆڵ و باخە
هاوین تەرمەکەی ئەبرایە شوێنێ    وەرشەی گەڵا بوو
سوپای تەوژم کە خۆی ئەبینێ    لەژێر چڵا بوو
لەکوێ هەڵاتن ئەبوو بە باری    هەڕەتی گەرما

---

(1) سێبەری پەرت: یا سێبەری پەرت و بڵاو، سێبەری پچڕپچڕ، شیعری سێبەری پەرتی دیلان شیعرێکی موستەزادە و توانا و دەسەڵاتی هونەری شیعری دیلانی تیا دەرکەوتووە.

- سکڵ باران: نمە و دڵۆپی باران، پشکۆی داگیرساوەی ئاگربوو

(2) پشووی ژێر گەلای گڕە بزێن بوو

گڕە: گەرمایەکی بەهێز و تینی هاوینە.

واتە ژێر دار و درەخت کە فێنك و سێبەربوو، بەوەش گڕەی بەزانووە و نەیتوانیوە کاری خۆی بکا.

لـەو ملـە بـەرزە نیـشانەی نـاوی　　ئـەکرا بەبـەرما

سێبەری بۆ دڵ و بۆ هەناسەیە کە　　خوێنـاوی بـوو

بۆ ئاخ و ئەشکێ ، مەیلێ ، تاسەیە کە　　تـەماوی بـوو

لەکوێ دەست ئەکەوت لەکوێ ئەبینرا　　لـەو سـنوورانە

بـە چـەپك لـەوێ ئۆخـەی ئەچـنرا　　لەوچـنوورانە[1]

ئـاخ ملـە ، ئامـان شـەماڵ و شـنە　　وادۆش دامـاوم

هـارە هاژەیـە ، کامیـت لـە کنـە　　بێنـە بەرچـاوم[2]

تـۆ پیرۆزەکـەی شـینی ئاسمانـت　　پەشـێوە گیـانم

تـۆ کەفـچەڕێنی رووە و دامانـت　　فریـای ئامـانم[3]

بکـەوە بـە سـۆز یـا بـە شمـشاڵی　　گـڕەی دەروونم

لە گیان لە جەستە لـە لـەش دامـاڵێ　　شای چەند و چوونم

---

(1) چنوور : جۆرێکە لە بابەتە گیا کێویلە و لە کوردستانا زۆرە .

(2) لەنکە : لای تۆیە .

(3) کەفچەڕێنی : کەفێکی خەست و خۆڵ ، کەفێکی پڕ و چڕ .

وەڵام کــوا ؟ وەڵام لــە کوێیــە ؟ بەشەو یا بە تاریکی

کــێ بــرین پێــچی برینمــی پــێ یــە ؟ رێــی بــەتاریکی

هەردەیە ، بەردە ، جار چاڵ و چۆڵە جــارێ هــەورازە

ئــەم دەســتم پــیرە ســاوام لــە کۆڵــە ئــــاواتم رازە[1]

کێ ئەگاتە پاڵ جەستەی شکستەم ؟ لــەم رێگــا کــوورە

کێ لە گەڵمایە بۆم ئــەڵێ بەســتەم ؟ لەمــەرگ تــوورە[2]

کــێ لایــە لــە گــڕ یــا لــە دووکــەڵێ ؟ ســووك ئەکاتــەوە

ئامــان ئامــانێ بــۆ چــارەم ئــەڵێ گیــان بیباتــەوە

کــێ بــاوەش ئــەکا بــە ســێ درنجــا ؟ بــە شــەوی بــاران

کــێ دەر ئەکێشێ ستەم لــە بنجــا ؟ وەك دێوی جاران[3]

---

(1) هەردەیە : دەشت و دەر و پانتایی زەوییە.

ـ ئاواتم رازە : ئاواتم ئەو پەنهانییەی دەروونمە

(2) جەستەی شکەستەم : لەش بە بارم ، لەشی پەك كەوتەم .

ـ لەم رێگا کوورە : رێگایەکی هەوراز و بڵند و قوچ .

(3) درنج : دێو و درنج ، دەعبایەکی خەیاڵاوی و تائێستا کەس بەچاو نەیبینیوە ..
زیاتر لە حیکایەت و داستانە خەیاڵاوییە کۆنەکان ناوی براوە .

کێ فوویەکی قووڵ ئەکا بە سینگما ؟ هەناسەم سوارە

کێ باڵێ ئەکا بە باڵ و چنگما ؟ساڵم نەبارە (1)

کێ دەست ئەکاتە گەردنی چیام ؟ . رەش هەڵگەڕاوە

کێ دەم ئەخاتە کانیاوی سیام ؟ وەی تێڕژاوە (2)

کێ ئەگاتە پاڵ چاڵی ئاواتم ؟ لەو وێرانەیە

هەست وەکو شاری چۆڵی نەهاتم شانە شانەیە (3)

فریامکەوە ئەی ترووسکەی دووری بە ئاستەم دیار

بمگەێینەرە گۆشە و سنووری خەیاڵی هەوار

بمگەێینەرە لێواری چیای پێش خواردنەوە

---

(1) هەناسەم سوارە : هەناسەم دەرنایە ، هەناسەم گیراوە .

ـ ساڵم نەبارە : ساڵەکەم لەبار نییە ، ساڵە کەم بێ پیت و فەڕە ، ئەم ساڵ لە بەرژەوەندی من نییە.

(2) کانیاوی سیام : سیاە : رەش . مەبەست لەوەیە کە جەرگم زوخاوی رەشی تیایە

(3) شانە شانەیە : لە شانە شانەی هەنگەوە هاتووە ، واتە بەش بەشە و هەر بەشەشیان بۆ خۆی کون کونە .

بمبەرە لوتکەی سەرپۆپی سیای        بەرزکردنەوە

با بڵێم هاوار بەروبوومەکەی        دارم وەریوە

لەو رێچکە بەرزەت چلە شوومەکەی        تێهەڵچەقیوە[1]

ئیتر ئەی نووکی قەڵەمی راستی        دەسێ تێکۆشان

نۆرەی ئێمەیە بەستە لە ئاستێ        چووزەرەی ژیان

نۆرەی ئێمەیە .. بە کوردی دەنگێ        دەنگ بداتەوە

خونچەیێ، گوڵێ، ئاوازی زەنگێ        خۆی بکاتەوە

*****

---

(1) بەروبوومەکەی : بەرهەمەکەی .

ـ رێچکە : رێباز ، رێگا .

ـ چلە شوومەکەی : مەبەست لەوەیە کەچلەی هەردوو وەرزی هاوین و زستان زیاد لە پێویست ، و رۆژانی دی هاوین و زستان سەخترترە، چل رۆژی هاوین گەرمایەکی بەتین و چلەی زستانیش سەرمایەکی وەیشومەیی هەیە. دیارە چلەی ماتەم .. هەر لەم دیاردەیەوە وەرگیراوە و پەیڕە و ئەکرێ .

# بەستەی بیٚ دەرەتان(١)(*)

١٩٧٩

نـــــە چـــــڵ دیــــارە ..
نە بێخــــیٚ
دەســــــتی بـــــەرمیٚ ... !
لە تینوانــا
ئەخنـــــکیٚ
چاوی چارە ..
ئەخنـــــکیٚ ...

---

(*) دیلان لەرووی هونەری پەرتبوونی شوێنەوە خۆی بەستەی بیٚ دەرەتانی بەدوو جـۆر هۆنیوەتـەوە لەهـەر دووکیانـدا لەنگـەری ریـتمو و ئـاوازە مۆسـیقاکەی سەربەخۆیان پاراستووە.

شیعری بەسـتەی بـیٚ دەرەتـان دووجـار و بـە دووشـێوە بڵاوکراوەتـەوە.. یەکـەمیان ئەمەی بـەر دەسـتانە کـە لـە گۆڤـاری (رۆژی کوردسـتان) لاپـەڕە (٩٩ ، ١٠٠ ، ١٠١) ساڵی ١٩٧٧ ..

ئەم شـیعری (بەسـتەی بـیٚ دەرەتـان) جیـاوازە لـەوەی دوو ئەمـە چ لـە رووی چـنینی شیعرییەوە بێت یا لە رووی کەم و زۆری بـەیت و ئـاڵ و گـۆڕ پێکردنیـا بێـت، بـەلای منەوە ئەو دەستکاری کردنەی شاعیر بەو شێوە و جـۆرە مـافی رەوای خۆیـەتی .. بەهەر حاڵ کاتیٚ رۆشنبیر هەردوو شیعرەکە ئەخوێنێتـەوە هەسـت بـە تاموچێژێکی چـونیەکی شـیعری و هونەرەکـەی ئـەکات و لەهـەمان کاتیـشا هەسـت بـە یـەك سەرچاوەی بەهرە و خۆماندووکردن و هونەرکاری شیعری ئەکا.

ســـــــووك ئەتاســـــێ
قـــــوڕگی ((گینگـــــڵ)) ..
لە ڕۆخ[1]
دەریـــــا .. کـــــە گێـــــژاوە
لای ئـــــــەدا (لـــــــەش)
بە کۆمەڵ
(شەو)..
لـــــــــە (ترســـــــــانا)
ئەنووقێ ..
مۆر
دائەگیرســـــــــــــێ[2]
پێـــــــستی شـــــــەوگار ..
وەك ئـــــــــــــەو ڕۆژە
کـــــــــەتیا کـــــــــوژرا
(بلّێسە) [3]
وەك ئـــــــــــــەو ڕۆژەی
کە ئاسمان

---

(1) لەڕۆخ : لەقەراغ ، لەلێوار ، لەکەنار

(2) وەها مۆر دائەگیرسێ : شین و مۆر ئەبێتەوە ، ڕەنگی تۆخێکی تاریکە

(3) کە تیا کوژرا بلّێسە: واتە ڕووناکی تیا کوژێنرایەوە.. یان ڕاستی لنگەوقووچ کرایەوە.

هـــــــــەڵپڕووکا ... [1] !

وەك ئـــەو .. ئێوارەیـــەی

هــــــەتا زریکـــــــە ..

لە کۆڵنجی ..

ســــروشتی

پڕ

لەبێزوو.. [2]

بەلاشـەی

کۆمـــەڵی

(داستـــان)

مێـــــژوو ..

لە ڕۆژێــکا ..

کـــــە (دڵ)

زێـــــر و زەبـــــەر بـــــوو ..

لـــــــــەکا تێکـــــــــا ..

---

(1) هەڵپڕوکا : کاتیَ ، پەڕ و ئێسك و گۆشت ئەدرێتە بـەر ئـاگرێکی بـە تـین و گـەش ، ڕووەکەی ئەسووتیَ و پێی ئەوتریَ هەڵپڕوکاوە یا هەڵپروزان .

(2) بێزوو : تامەزرۆ ، بەپەرۆش (بیزوو ، زاراوەیەکە بۆ ئـافرەتێکی دووگیـان (سـکپڕ) بە کاردێت کاتیَ حەز و ئارەزووی لە جۆرە خواردنێکە ، بەو حـەز و ئـارەزوو کردنـە ئەوتریَ بێزوو ئەکا ) .

هـەتـــا

سەرپشتی

مـــاسی

رمـــــی

بـــــێ دەرفـــــــەتیم

نابـــوو

بەناخا ..

لە تینـــوانا ...

ئەوی وتـــراو ..

ئـــــەوتـــرێ

هەموویـــــم

جوو

تفیـــشم کـــردەوە ئەوســـا

لەداخا .. !

*****

# بەستەی بێ دەرەتان(٢)

## ١٩٧٨

نــە چــڵ دیــارە ، نــە بێخــێ دەســتی بــەرمێ
نەجێ دیارە ، نە شوێن بۆ دار و تـەرمێ . ! ! [١]

ســـەر نـــەکرۆژن مـــل ئـــەکرۆژن لـــە تـــاوا
لـــە خرمـــەی ئێـــسکی وردی تـــازە زاوا ... [٢]

نەچــڵ دیــارە نــە بێخــێ دەســتی بــەرمێ
لە کوێ ی دانێن لـە کـام لا .. دار و تـەرمێ ؟ !

---

(1) بەستەی بێ دەرەتان : گۆرانی ئـەو مرۆڤانـەی بـێ دەرەتـانن شـوێن و مەڵبەنـدی دالّدەیان نییە و بێ نەوان .

ـ نەبێخێ : واتە ئەو رەگ و ریشەی هەیەتی و بەزەویا رووچووە دار نییە.

(2) سەر نەکرۆژن: کرۆشتن: بۆ وردکردنی ئێسک بەکاردێت، بـۆ نمونـە ئێسکی بـاڵی مەلێ بەددان ئەکرۆژێ و وردی ئەکات ، ئەڵێن : ئێسکەکەی کرۆشت. دیـارە سـەریش (کەللـەی سـەر) کـە ئێـسك و رەقەنـە ئـەکرۆژرێ کەچـی بـۆ بـەختی بێوڵـەتی بـێ دەرەتانان نەك سـەر ئـەکرۆژرێ بـەڵکو مـل بریتییـە لـە برپـرە و گۆشـت و دەمـار و ماسولکە ، ئەویش ئەکرۆژرێ .

لــه ژێــر کامــه بێخــێ هەڵکــەنراوی لــسۆدا ؟
کــه مــا دانــین .. تــەپ و دوو کــەین بــه خــۆدا !

گـــەردن نەرمـــه ! ئـــەبێ دەرمـــانی ئـــازار
درِك وردکـــەین بەبایـــدەین تـــۆزێ هـــاوار .. !

ئـــەخنکێ ، ســـووك ئەتاســـی ، قـــورِگی گینگـــڵ
کـــه گێـــژاو لایبـــدا بـــۆ نێڵـــەی گـــڵ .. [1]

لـــه کاتێکـــا لـــه ترســـا شـــەو ئـــەنووقا
فریـــشتەی شـــینی دەریـــا خـــۆی ئـــەتۆقا ! ! [2]

لـــه ســـاتێکا کـــه رۆژ ژێـــر و زەبـــەر بـــوو
لـــه ئانێکـــا کـــه خـــوێن کفـــەی بەســـەر چـــوو . [3]

ســـتارەی شـــەو لـــه گـــەرما هەڵتروشـــکان

---

(1) قورِگی گینگڵ : ئەو گەرووەی گریانی تیا ئەوەستێ .
ـ نێڵەی گڵ .
(2) شـەو ئـەنووقا : تاریکـه شـەوی تـەواو . شـەوی دەیجـور کـه شـەو بـه یـەجگاری دێتەوەیەك و تاریك ئەبێ .
ـ ئەتۆقا : له ترسا زارەترەکه ئەبوو . له ترسا زراوی ئەچێ و ئەمرێ .
(3) کـه رۆژ ژێر و زەبەر بوو : کـه رۆژ سەروبن ئەبێ و دونیا ئەبێتە شـەوە زەنـگ ، یـا خود مەبەست لەوەیە کە رۆژگار تێك ئەچێ و کار و کردەوەکان لنگەوقوچ ئەبنەوە .
ـ کە خوێن کفەی بەسەرچوو :

گــڕی ئێمــه هــەتاوی ســووری ئەشــکان ! ؟ [1]
بـــەفر ســـــووتا لەگـــەڵ دەنگـــی تنۆکـــا
بـــەبێ لـــووره بـــەیانی هـــات بەچـــۆکا ! ! [2]

لـــەکاتێکا .. هـــەتا ســـەر پـــشتی ماســـی
نەمـشتێ خـۆڵ نـه بـەرد کـوردی ئەناسـی ! !

منـــی تـــەنیا .. لـــه تاوانـــا لـــه تـــاوا
ملـــم کێـــشا بـــه تیغـــی تـــازه ســـاوا ! ! [3]

منـــی تـــەنیا لـــه داخانـــا لـــه داخـــا

---

(1) ستارەی شەو : لێرەدا ستاره ، له ستاره کردنەوه هاتووه که به مانای ئارام و خامۆشی شەو دێت .

(2) که بەفر : ئەتوێنرێتەوه ، ئەبێت به ئاو ، واته که بەفر بەگڕ گەرم ئـەکرێ ، دڵۆپ و تنۆکی ئاوی لێ دێته خوارێ .

- لووره : بۆ دەنگی گورگ و سەگ و چەقەڵ .. بەکاردێت .

(3) لەتاوانا له تاوا : لەبەشی یەکەمی وشەی له تاوانا که بەم جۆرەش ئەخوێنرێتەوه

- له تاوانا : لەبەر ئەوه ؛ بەو هۆیەوه .
- له تاوان: واته له ناو تاوانا و له بەردەست تاوانبارانا .
- له تاوانا له تاوا :

تاو : به کەرت و جاریش دێت ، لێرەدا مەبەست لەوەیه لەبەر ئەوه . لەبەر ئـەو هۆیـه ، که وشەی دووەم بۆ سووربوون و دڵنیایی یه .

- تیغی تازه ساوا : ئەو تیغەی که تازه به (هەسان) تیژ ئەکرێ .
- تیغ: چەقۆ، کێرد، قەڵەمبڕ، خەنجەر و شیر. کەچی ئێستا زیاتر بۆ گوێزان بەکاردێت.
- ساوا : ئەی سووێ ، به بەردە هەسانه ئەیسوێ .

ملـــی بـــێ دەرفـــەتیم نـــا بـــوو بـــەناخا[1]

لـــــەکاتێکا .. ئـــــەوی وتـــــرا و ئـــــەوترێ
هەموویم جوو تفیشم کردەوە لـە ئاخـا ! ! [2].

وتم .. پـــەیمان .. لەگـــەڵ بێخـــی زەمینـــا
ئەکۆشـــم قـــوڕ ئەنۆشـــم هـــەر لـــەقینا .. [3]

*****

(1) ملی بێ دەرفەتیم : ملی بێ مەودا و ماوە و کاتم .
دەرفەت : مەودا ، ماوە ، سات .
ناخا : دەروونا ، کە ئەڵێن لە ناخا واتا لە دەروونا .
(2) – هـــەموویم جـــوو : مەبەســـت لـــە قـــسە جوونەوەیـــە ، یـــا قـــسە وتنـــەوە و دووبارەکردنەوەی بۆ چەند جارێك .
ـ لە ئاخا : لە ئاخ و داخ هەڵکێشانا .
(3) قوڕ ئەنۆشم : قوڕ ئەخۆم

# کەریم گوڵ بوو(*)

کەریم گوڵ بوو، برا بـوو پـشت و کـەس بـوو
لـــەتاریکایی شـــەوا فریـــادڕەس بـــوو

کەریم کەس بـوو، گوڵێـك بـوو وەك چـرا بـوو
درەختێــك بــوو، پەنایــەك بــوو، بــرا بــوو

نـــەمامێ بـــوو لەباخـــچەی ژینـــی کـــوردا
قـــەڵایێ بـــوو لـــە هەســـتان و نەبـــەردا

وەکـــو مـــۆمێ لـــە تاریکـــایی شـــەودا
ئەســـووتا بـــۆ کـــەس و کـــاری بەســـەودا

هـــەتا چـــاوی لـــە کوردســـتان بمێنـــێ
کـــەریم مـــاوە لەدڵـــدا هـــەر ئـــەمێنێ

***

(*) ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٨٣ نووسراوە

# سروودی وڵات(*)

## ١٩٨٣

### پایز :

ســــاڵ پــــایزە ، گەرمـــــەی گەڵاڕێزانـــــە
زێـــــڕ بارانـــــە ، شـــێوەی ســــاڵی جارانــــە(١)

گـــــەڵای ڕژاوی ، دارمــــازووی چـــیای بــــەرز
ملوانکەکــــــــەی ئەئاڵانـــــــە ملــــــی وەرز

هەناسەی شاخ .. کزە بـای ساردی پـێ دەشـت
تێکــەڵ ئــەبوون رووە و دامــان بــەبای وەشـت

گرمـــەی هـــەور ، لێزمـــەی خـــوڕی پەڵـــەی ســـاڵ
بــــە هـــــورووژم خـــۆی ئەگەیانـــــە ناومــــاڵ(٢)

---

(*) (سرودی ولات) لە گۆڤاری کـاروانی ژمـارە (١٦)ی کـانوونی دووەمـی سـاڵی دووەم ١٩٨٣ دا بلاوکراوەتەوە

(1) گەرمەی گەڵاڕێزانە: جۆشی گەڵاڕێزانە و وەراندنێتی .

- زێڕ بارانـە : کـاتێ لـە پـایزدا گـەڵای درەختـەکان زەردئـەبن و لەپـەوروو هەڵئـەوەرێن خۆیان بەزەویا ئەدەن وەك ئاڵتون بارین وایە .

(2) پەڵەی ساڵ : مەبەست لەو بارانە زۆرەیە کە مـاوەی زیـاد لـە دوو شـەو و دوو ڕۆژ ئـەبارێ و لـە نیومـەتر زیـاتر بـەزەویا ئەچـێتە خـوارێ و بـەوەش زەویەکـە نـەرم ئەکاتەوە و ئاسانە بۆ کێڵان .. ئا بەو بارانە ئەوترێ : بارانی پەڵە.

- بەهوورژم : بە تەوژم و تین و گوڕێکی خێراوە .

رووبـاری شـین ، سـوور هەڵگەڕاو بـە لافـاو
جـارێ بێـدەنگ جـارێ بـەهاژە و بـەتاو[1]

مۆسـیقا بـوو بـۆ شـەو ، بەسـتە بـۆ شـەوگار
شـەوی درێـژی ، هەنـسکی بـە هـاوار ... ! !

زستان :

کرێوەیـە لـەو ملانـە بـەفری شـاخ
سـپیکاری خـۆی گەیانـە پـشتی بـاخ[2]

بـەفر بـاری سەرپۆشـی کێـو نەخـشانە
لـە کلیلـە کێومـاڵ کـردن گرانـە[3]

---

(1) بەتاو : مەبەست تاوە بارانێکی بەهێز و خێرایە .

(2) کرێوە: مەبەست لەو بەفرە وردە پتەوەیە بەخێرایی دائەکات و ئەبارێ.

ـ لەو ملانە: ملە یاکەوەی شاخ ، هەندێ جار بە واتای (کەل)یش دێت و ئەڵێن : کەلی شاخەکە ئاسکێکی پێوەیە .

ـ سپیکاری : کە بەفر ئەبارێ ، ئەڵێن دنیای سپی کرد و سپی کاریش هەر بەهەمان واتا دێت

(3) کلیلە : کە بەفرێکی زۆر ئەبارێ و رێگا و بان ئەگیرێ بۆ هەندێ شوێنی بەو بەفرە زۆرە ئەڵێن : بەفر لە بەردەم دەربەندەکەیا کلیلەی بەستبوو ، واتە لەویا زیاتر باریو یا با لوولی داوە .

ـ کێومالّ : شاخ و کێو پاککردنەوە ، کاتێ لە کێو و شاخ بەفر ئەماڵن .

کـــێ ئەگاتـــە دەرەی ســـەختی پـــشتی کێـــو
رەز داپۆشـــرا ســـەهەن گەیـــشتە ســـەر مێـــو[١]

چـــلوورەیە لـــوورەی بـــای زەمهـــەریرە
چـــیا ســـپی لووســـە وەك چـــوڕی شـــیرە[٢]

لەبەردێـــدا شـــەڕە تۆپـــەڵ هـــی گەنجـــە
ســـنگ بـــۆ کوانـــوو چـــۆقە جێگـــەی ســـەرنجە[٣]

خـــۆراکی رۆژ خواردەمـــەنی کوێـــستان هـــات
بـــەفر و دۆشـــاو رەش و ســـپی زســـتان هـــات

---

(1) دەرەی تەختی پشتی کێو : دەرە: بە دەربەند یا شیو و دۆڵ دێت ، لێرەدا بە هەرد و دەشتای ئەو دیوی دەربەند هاتووە .

ـ سەهەن : سەهۆڵ بەندان ، کە با لەتەڕی بەفر ئەدات و ئەیبەستێ پێی ئەڵێن : سەهۆڵ .

(2) لووڕەی با : دەنگی بایە کە لەدەنگی گڤە گڤەکەی تیژ و باریك ترە .

ـ بای زەمهەریر : با یەکی ساردی بەهێزە .

ـ چوڕی شیر : وەکو کەفی شیر و رەنگە سپیەکەی بێ گەردە .

(3) سنگ بۆ کوانوو : سنگ گەرمە وەك ئاگردان، کوانوو : ئاگردان .

ـ چۆقە : ئەڵێن لە سەرمایا چۆقەی دانی دێت واتە لە سەرمایا دان بەیەکا ئەدا و دەنگی ئەو بەیەکادانە ئەبیسترێ .

چـــلەی جـــاران شـــێرە بەفرینـــەی جـــاران
کوایت چیت لیٚ هـات بـۆ چوویتەوە بـە بـاران ؟

**بەهار :**

شـــینی چـــلە دەســـتیپێکرد بـــە تـــەرزە
ئاوەزێیـــــە چـــــاوی زەوی ئـــــەم وەرزە[1]

قاســـپەی کـــەوە تاریـــك و روون بـــەیانی
لـــەو ملانـــە مـــوژدەی گزنگـــی هـــانی

بـــای دار ئـــاووس شـــنگ هێنـــەرە بـــۆ پیـــشۆك
گێلاخـــەی ســـەوزی لەیلاخـــە هەڵـــە كـــۆك[2]

---

(1) ئاوەزیٚ : زەوی دوای بارانێکی زۆر تێر ئاو بێت و بـە تـەڕی و ئاوداری ئەمێنێتەوە لەم حاڵەتە و بۆ واتای وشەیی شیعرەکە بـەو ئاوە ئەڵێن کە لە زەویا سەر ئەکا . دیسان بەو ئاوەش ئـەڵێن کـە لە شوێنێکی ترەوە دەردیٚ .

(2) بای دار ئاوس: ئەو بایەی ئەبێتە هۆی ئەوەی دار و درەخت گۆپکە بکا.
- شنگ و هەڵەکۆك : دووگیای بەهاری تەمەن کورتن و بۆ خواردن ئەشێن .
- گێلاخ و پیشۆك: ئەمانیش گیای بەهارین و تەمەنیان کورتە و ئەخورێن .
- لەیلاخ : هاوینە هەواری کوێستانە .

زەردەپـــــەڕە ، نێرگـــــسە چـــــاوی زەردە
تــارا پۆشــە .. وا چــارەیی نــە بــەردە .. ! !

لەشــــکری ســــوور مەشـــق کـــەرە گولاڵـــە
لوولکــــــژەنی دوای نیـــــوەڕۆ شــــــەماڵە[1]

چـــاوی شــــینی تێکـــەڵ ڕەشـــە وەنەوشـــە
نیگـــای مـــەنگی کراوەیـــە بـــێ خەوشـــە

کوای سای بەهەشت ، کوای دیمەنی یەزدانی .. ؟؟
کــوای چـیت لێهـات بـۆ کەوتیتـە نیمـانی .. ؟؟

**ئەنجام :**

ئـــەی .. وەنەوشـــەی ((شـــینی)) بـــەرگی ولاتم
کوچـك و بــەردە ژێــر پێــی ڕەوتــی نــەجاتم[2]

هـــــەر کڵۆکـــە شـــوێن بازرقـــەی بـــەهارم
پــــــڕ دووکەڵـــــە جـــــێ دەواری هـــــەوارم

---

(1) لوولکژەنی : شمشاڵ ژەن .

(2) ڕەوتی : ڕۆیشتنی ، لار و لەنجەی ڕۆیشتن .

گورچـــك بــڕە چـــنگی ئاڕاســـتەی گیـــانم
جـــــەڕێنراوە پــــــەتی دەم و زمـــــانم[1]

هـــەڵ خـــراوە بـــە ژمـــارەی تـــووکی ســـەر
تـــەنافی ســـفت بـــۆ گـــەردنی گـــوڵ و بـــەر

کەچـــی نـــووزە خەریکـــە بـــێ بـــە ئـــاواز
جووڵـــە بـــزوون ئـــەوا ئـــەبێ بـــە پـــەرواز

*****

---

(1) گورچك بڕە : گورچیلە بڕە .
ـ جەڕێنراوە : تونگ بەستراو .

# نەوبەهاری

**١٩٨٢**

ئەی گوڵی ژاڵە لەگوێی چەم پایزان
رەنگت سورمەڕێژە بۆ دیدەکزان[1]

چاوی ئاواتم ئەوەن لێ کزبووە
هەچ برینێکم هەیە ئاودز بووە[2]

تۆ بە پایز رەنگی سوورت سورمەیە
بۆیە شێوەت بۆ خەرامان هەر مەیە

من لە پایزدا بەهارم دێتە بەر
بۆیە نرخی تۆ ئەنێمە تەوقی سەر

تۆ گەلاڕێزان کە بۆ ئەوسا گوڵی
جامی بادەی لێ تکاوی سەرچڵی

---

(1) رەنگت سورمە رێژە: رەنگت (کل) رێژییە ، واتە رەشی قەترانییە .

ـ دیدەکزان : چاوی کز و بێ تین ، بینایی کزە .

(2) هەچ برینێکم هەیە ئاودز بووە : کاتی برین ئاوی بەر ئەکەوێ ، پاش ماوەیەك ، شوێن زام و برینەکە ، (کیم و جەراعەتی) تێ ئەزێ و بەمە ئەوترێ: برینەکە ئاودزی کردووە ، ئاوی دزیوە ، ئاوی تێ چووە.

بــۆ یــە هــەرگیز تــۆ لــە بــازارِا کــەمی
چــونکە ئاوێتــەی خــورِی گریــەی چــەمی

مــن نزیــك تــۆ جــامی هەڵبەســت دائــەنێم
هــەر لــەکن تــۆ کەللــەیی مەســت دائــەنێم[1]

چــونکە تــۆ دەرمــانی دەردی تــازەمی
تــۆ کتێبــی پــرِ گــرِی ئــەم رازەمــی

چــونکە تــۆ شــێوەت بــەهاری پــایزە
بۆیــە چــاوە گــوڵ رنینــت لێ بــزە

تۆنیــشانەی بــەختی ناســازی منــی
بۆیــە ئێــستا هەســت و هــامرِازی منــی[2]

مــن بــە راســتی پێــت ئــەڵێم بــادەم ئــەوێ
جــام لەســەر جــام و فــرە ســادەم ئــەوێ[3]

---

(1) کەللەی مەست : کەللەی خوماری ، سەرخۆش ..

(2) هەست و هامرِازی منی : هامرِاز هاورِاز ، هاوبەش لە راز و خەما واتە تۆ لە هەست و خەم و نهێنیەکانی منا هاوبەش و هاوکاری . .

(3) فرە سادە : تەواو ئاسایی ، تەواو سروشتی و روون هەر خۆیەتی و تێکەڵ بە شتی نەکراوە .

ـ فرە : زۆر

ـ سادە : ئاسایی . بەسیت ، پەتی ، تەنیا خۆیەتی . .

مەستی بادەی هەستی جارانم هەیە
بۆیە ئێستا (ڕێن) بە خزمانم هەیە

پیت و سامانم هەیە ، بادەم هەیە
تا بە دامانم هەیە ، سادەم هەیە[1]

(گۆشەگیرم) چۆن تریکی ژاڵەمم
بەستە بێژی ئەو شەرابە تاڵەمم[2]

بۆیە ئاڵودەی شەرابی تفت ئەبم
چونکە پاش هاوار هیلاك و کفت ئەبم[3]

هەرچی هاوارم هەیە هەر بۆ (مەیە)
کەی ئەگاتە بەر دەمم ئاخۆ کەیە[4]

---

(1) تا بە دامان : تا ئاودامان ، بە درێژای باڵا واتە بە ئارەزووی خۆم هەمە..

(2) گۆشەگیر : دوورە پەرێز ، خۆ لەکەنار گرتوو . .

(3) ئاڵودەی : هۆگری ، ئاشنا بوون ..

(4)هەر بۆ مەیە : هەر بۆ بادەیە ، هەر بۆ شەرابە

ـ ئاخۆ کەیە : ئاخۆ چ کاتێکە ؟ .

هەرچــی هەڵوێــستم هەیــە هــەر بــۆ مەیــە
چونکە (راستی) خۆی (مەیە) بۆیە هەیە !

بۆیـــە ئێـــستا شـــاخێ ســـامانم هەیـــە[1]
بۆیـــە ســـەرووم لا پەســـندە و زینـــدوە

چـونکە راسـتە و بـێ گـرێ راسـت هەڵـچووە
بۆیـــە شـــیرینی بـــە ژاڵـــەی تـــاڵ ئـــەدەم

چـونکە روو زەردی بـە رەنگـی (ئـاڵ) ئـەدەم
مــن لــەناو (جامــا) بــە (دیــدار) شــاد ئــەبم

هــــەر بــــەبۆنی گیـــان و دڵ ئـــازاد ئـــەبم[2]
مـەی لـەبۆ مـن چـاکە نـەك بـۆ دوور لـە مـەی

---

(1) شاخێ سامانم هەیە : بە ئەندازەی بەرزی چیایەك سامانم هەیە ، واتە زۆر بووە و دەوڵەمەنم . .

(2) بە دیدار شاد ئەبم : واتە بە بینین و تەماشا کردنت ئەگەشێمەوە و دڵخۆش ئەبم..

(گریه) بۆ من باشه نەك بۆ دوور لە (وەی) [1]
کام خوڕی گریان لەسەرخۆ و (هێمنە)

پیشەیی خۆمە و لە خەودا (هی منە)
زۆر دەمێکە (گریەکاری) ڕێگەمم .

زۆر دەمێکە بێ بەهاری جێگەمم
داخی سەد ساڵەی وەها پێڕشتووم

چی ئەمن خۆشم ئەوێت جێی هێشتووم [2]
دەست درێژم بۆ کەلەپچەی مەینەتی

مل درێژم بۆ (قومێ) ژەهری پەتی [3]
چاو لە ڕێگام بۆ چەقۆی سەر گەردنم

---

(1) گریە : گریان ... / وەی : زیان ، بەڵا .

(2)داخی سەد ساڵەی وەها پێ رشتووم : واتە داخ و رقی دەرونی سەد ساڵە و کۆنی خۆی ئاوا لێ کردمەوە پێی رشتم.

(3) قومێ : فرێ .

- ژەهری پەتی : ژەهری بێ فرت و فێڵ ، ژەهری بێگەرد کە هیچ مادەیەکی دی تێکەڵ نەکراوە و ژەهرێکی پاکە و گەردی تیا نییە و ژەهری رووت . .

گـــوێ قـــوڵاغم بـــۆ هەناســـەی مـــردنم[١]
(گریـــە) لای مـــن هـــی دەروونـــی مەردییـــە

چـــێژی فرمێـــسك شـــەربەتێکی کوردییـــە
مـــەی کـــە تێکـــەڵ بـــوو فرمێـــسك (شـــادییە)

(نـــەی) لـــە پـــاڵ بێـــت ، ئـــەوە (ئابادییـــە) [٢]
(نـــەی) نیـــشانەی ئـــاوەدانی دڵمـــە مـــن

(مـــەی) نیـــشانەی نەوشـــکۆفەی گوڵمـــە مـــن
(أی ی محـــزون نـــوای ســـاز کـــن

نالـــــە دلـــــسوژ اغـــــاز کـــــن
گـــر ز دوریهمـــا شـــکایت مـــی کنـــی

بـــشنو أز نـــی چـــون حکایـــت میکنـــد
واز حـــدای مـــا شـــکایت میکنـــد)

***

---

(1) گوێی قولاغ: گوێی ئامادەی بیستنە، هۆش و گۆشی لەلای بیستنەکەیە. .

(2) ئەوە (ئابادییە): ئابادی لێرەدا بەواتای دڵخۆشی و ئاوەدانی دڵ و دەروون دێ.

## تروسکە(*)

١٩٨٢/٧/١١

ئەی تروسکە :

بەرە و کۆ دێین بـــۆ رێی ژیـــــن(١)
بەچوار وەرزە پەل ئەگێڕین : بتبـینن
دەور و پشتـــــــمان پـــەیکوڵە ... !

پەل ئەگێڕین :

پێمان رووتە ... تێشووی رێمان سکڵە(٢)

هەنا راوە :

ســـــوور بوونەوەی سەر سنــــگمـــان
دام و داوە ، جێگەی چینەی ناوچنــگمان

قوڵیی نزیك :

گـــــەردنـــی داپـــۆشـــــراومـــان
مەیـــــلە و ئاڵە ، تکەی دڵی گوشراومان

زەردی دوکەڵ :

تـــــوێــــی .. سەرپـــۆش قوڕاوی

---

(*) تروسکە : لە گۆڤاری ((کاژاو)) ی ژمارە (١) ساڵی ١٩٨٤ دا لە لەلایەن قوتابخانەی ناوەندی کاژاو لە سولەیمانی بڵاوکراوەتەوە

(1)تروسکە : تیشکی شەوقی رووناکی کز و بێ هێزە .

(2) دەور و پشتمان پەیکۆڵە : پەیکۆڵ : گژ و گیایەکی بەهارییە واتە دەور و پشتمان بە گیا پەیکۆڵی بەهاری تەنراوە.

یەخەی ونجڕ کراس شیــــتـــــاڵ بڕاوی

بەفر و خوێنە:

بـــەفر و خوێنـــە خـــۆراکی بەســـتەڵەکمان
بـــۆ مانـــەوەی رەگێکـــی رەچـــەڵەکمان[1]

بۆ مانەوە :

زەرد و ســــــووره ... قـــــوریــــــانی
پەڵکــە زێڕینـــەی سنـــــووره گــــــۆڕانی

هانا گڕە :

گـــــــڕ چـــاوگــــــــە .. خــــــرمانە
دانەوێڵـــەی قـــەد پاڵـــەکـــان فرمانـــــــە

فرمان دارە :

دار بـــــەری مـــــــن و تــــــۆیـــــــــە
گـــەر نـــەگرپین لـــــوتمان لەســـەر ئەژنۆیـــە

کورنووش بردن :

یـــاســــــای دەوری کـــــــەوانـــــــــە
کـــەی دیلێتـــی .. ئـــەنجامی کـــورد زمانــە .. !

کەی دیلێتی :

بـــۆ میـــــللـــــەتـــــان .. رەوایـــە ..؟
لــە کـوێ زەهـــر بـــۆ نـــەخۆشی دەوایـــــە؟.

ئەی تروسکە :

---

(1) بەستەڵەك : شەختە ، سەهۆڵ بەندان .

- رەچەڵەك: بنچینە و بنەوانی رەگەزی خێزانی و نەتەوە . ئەسڵ و فەسڵ

رووه و تـــــۆ دێیـــــن بـــــۆ شــــادی
ئینجیــل مانــه سووتـــــاندن یــا ئـــازادی

## عەزیزم(*)

بڕایـــان .. خـــوێش و کـــەس فرزەنـــدی جـــەرگم
دڵــم ئاڵــە .. لــە خاکیـشا بــە ڕەنگــم ... ! ! (1)

هەناســــەم بـــۆنی ڕووی ئێـــوە ئـــەهێنێ

---

(*) (دیلان) شاعیرێکی هەست ناسکە ، وەك سیمایەکی هەرە زەقی زیندوو و ڕەسەن شاعیر ڕووداوە هەست بزوێنەرەکان ناخی ئەهەژێنن ، خولیا و شەیدایی پەیوەندی هۆگری نێوان خۆیی و دەروبەر ڕۆڵێکی کاریگەری سروشتی لە شیعرەکانیا ئەبینێ، لەدایکبوونێکی داهێنەرانەی نوێ ئەهێنێتە کایەوە .. من پێم وایە هەر لەو ڕوانگەیەوە (دیلان) ئەو عەشق و خۆشەویستییەی لە ناخیا پەنگی خواردۆتەوە لە شێوەی شیعرێکی زیندوو و ڕەسەنا دەریئەبڕێ ، گۆرانی و شیوەن بۆ ئەو دۆست و جگەرسۆزانەی ئەکا کادەستی قەدر و زەمانە بۆ ژێر گڵ ڕاپێچی کردن و هیوا گەشەکەشیانی زیندەبەچاڵکرد .. دیلان بۆ (حەسەنی هاوڕێ)ی هەنسك هەڵئەدا و (جەمیلی جوانەمەرگ) ئەلاوێنێتەوە .. ئەمجارەشیان بۆ دۆستی دێرینی کۆڕی عەشق و بەزم گورانی ئەڵێ .. هەستی خۆی بۆ کۆچی دوایی .. دوا کوڕەزای (مەحوی) دەر ئەبڕێ . عەزیزی مەلا خالیدی مەحوی ساڵی ١٩١١ لەشاری سلیمانی لە دایك بووە .. پیاوێکی خۆش مەشرەب و قسەزان بووە ، دۆستی شیعر و هونەرمەند و ئەدەبدۆستان بووە .. سنگی کەشکۆڵێکی شیعری بووە زانیاری سەبارەت دروستبوونی شاری سلیمانی هەبووە ڕۆژی ٢٥ — ٩ — ١٩٨٤ لە شاری سلیمانی مەرگ ژیانی بۆ خاکی سەیوان پێچایەوە .

(1) خوێش و کەس : خزم و خوێش ، کەس و کار
ـ فرزەندی جەرگم : فرزەند : ڕۆڵە ، بەچە .
ـ جەرگم : ڕۆڵەکەم ، جگەر گۆشەکەم .
دڵم ئاڵە : واتە دڵم خوێنی هەر تیایە و بە واتای ئەوە دێت : نەمردوم زیندوم .

بــە باقــە گــوڵ لەســـەر ســینەم ئەچــێنیٚ .. [١]

لـــەناو گـــۆڕا .. بــــەیادی جــــەرگی بــــرژاو

لــە دوای سەدســاڵ خــوڕەی دیٚ پــیرە خوێنــاو[٢]

ئــــەهاژیٚ .. قـــوڵپی ســــووری چـــاو و ســـینەم

کــە مــن ڕۆڵــەی نــە مــردووی ئــەو نگینــەم ..! [٣]

---

(1) بە باقە گوڵ : بە چەپک گوڵ، بە دەسك گوڵ

- لەسەر سینەم ئەچێنیٚ : لەسەر سنگم ئەروێنیٚ .

(2)قوڵپی سووری چاو و سینەم : قوڵپی گریانی چاوەکانم .

- کە من ڕۆڵەی نەمردووی ئەو نگینەم: مەبەست لەشاعیری کورد (مەحوی)یە.

- نگین : بەشتی زۆر بە نرخ و بەهادار ئەوتریٚ .

(3) (دیلان) لەم بەیتەی دواییەدا وردەکاریەکی یـەجگار شـارەزایانەی بـەکار هێنـاوە و زیرەکانە لایەنەکانی ڕەوانبێژی و جوانکاری و گوزارە بێژی بەکار هێناوە .. دەستی هونەروەریەکی بەرز بەم بەیتەوە دیارە و تا لێی ورد و قـووڵ ببیتــەوە تـام و چێژی شیعری و هونەری لیٚ هەڵئەهێنجی و گەشە بە زاخاوی دڵ و دەروون و مێشك ئەدا .. ئەوەتا .

- (عەزیز): وشەیەکە جوانکارییەکی ئاسایی و سروشتی بە واتا و گوزارەی وشــەکە داوە و لـەناخا هێزێکـی دەرونـی پـیٚ بەخـشیوە و لایەنـەکانی خواسـتن و خـوازە و لێـك چواندنی تەنیا لە وشەکەیا کۆکردۆتەوە، عەزیزم بەم واتایە دیٚ : =

= - عەزیزم : واتای بانگ کردنی خۆشەویستەکەم، ئەبەخشیٚ و زیـاتر بـۆ خۆشەویـستی پیاو دێت .

- عەزیزم : واتا من عەزیزم .. یا من خۆشەویستم ، خۆشەویستی تۆم .

- عەزیزم : واتا ناوم عەزیزە .. کە بەکوردی خۆشەویست ئەگرێتەوە ..

- لێرەدا (دیلان) بـەتیریٚ دوو نیـشانەی پێکـاوە لەلایـەك وەك ئـامرازی بـانگ کـردن ڕوو ئەکاتە ئەوەی شیعرەکەی بـۆ وتـووە و ئـەڵیٚ (عـەزیزم) ئـەو کەسـەی کـە لـە دڵمـا شوێنی خۆشەویستیت هەیە ، دووەم بە نـاوی ئـەو کەسـەی شـیعرەکەی بـۆ وتـووە ئەڵیٚ: من ناوم عەزیزە کە مەبەستی لە مەلا خالدی مەحوی یە. ←

(عـەزیزم) .. ! (خالیـدی) دەرگـای (مـەحویم) ! !

ئەسووتێم .. ، هەڵئەقرچێم .. خۆڵی (مەشویم) ! ! (1)

***

- خالدی : دیسان ئەم وشەیە جوانكاری وگوزاربێژی لە رووی لایەنـەكانی رەوانبێـژی : ( خواستن ، خوازە و لێكچوونە)ەوە تیا كۆبۆتەوە و لێرەدا بە واتای .
- خالدی : واتـا : عـەزیز خالـدی .. عـەزیز كـوڕی خالـد لـە لایـەكی تـرەوە بـە واتـای : عـەزیزی خالـدم یـان خۆشەویـستی خالـدم ، یـا خۆشەویـستی ئـەو نـەمردوەم كـە بەواتایەكی سادە و ساكار و لە رووی مەبەست لەوەیە كە عەزیزم و كوڕی خالـدم .. یا باوكی ناوی خالدە .
- (خالـدی) دەرگـای (مـەحوی)م: ئـەم دوو وشـەیەش لـە رووی رەوانبێژییـەوە هـەمان لایەنەكانی (خواستن و خوازە و لێكچوون) بە ئاوێتەیی لە ئـامێز ئـەگرێ و ئـەم واتـا زەق و ئاشكرایانە ئەدا بەدەستەوە.
- خالدی دەرگای مەحویم : واتا زینـد و نـەمردوی بـەردەرگای مـەحویم .. هـەروەها بـە واتای خالدی مەحوی یا خالیدی كوڕی مەحوی دێت .

ئەسوتێم ، هەڵئەچرقێم .. خۆڵی مەشویم :

— مەشـوێ : نازنـاوی شـیعری (مـەحوی)یـە، واتـە بەرلـەوەی شـیعرەكانی بـەناوی مەحوییەوە بڵاو بكاتەوە ، بە ناوی مەشوییەوە ناسراوە .

دیـارە بـەكارهێنانی ئـەو لەقەبـە، پەیوەنـدی بـەژیانی تایبـەتی و لایـەنی سۆفیگەری مەحوی یەوە هەیە، بەتایبەت دوای ئەوەی پلە لە دوای پلە ژیانی بەسوفیگەرییەوە بەستراوە.

(دیلان) راستی وتـوە كـە ئـەڵێ ئەسـوتێم و هەڵئەچـرقێم .. ئـەوە ئەبەخشێ كـە دوای سـووتاندن و هەڵقرچـانن پاشمـاوەی ئـەمێنێ و لـەویا زۆر ئاسـاییە كـە بـوترێ : (مەشـویم) واتـە بـرژاوم ، نـەك (مـەحوی) كەشتێ بـە تـەواوی مـەحوبووەوە هـیچ شوێنەوارێكی نامێنێ .. (دیلان) زۆر جوان و هۆشیارانە مەبەستی ناوەڕۆكی شیعری و لایەنی هونەری بەكارهێناوە، كە هەردوو لایان پڕ بەپێستی یەكن و كـاڵای بەقـەد باڵایەتی و ئافەرین و دەست و دەم خۆشی ئەوێ.

(1) جەرگی برژاو : مەبەست لە رۆڵە كوژرا و سووتاوە كە لێرەیا مەبەست عـەزیز مـەلا خالدی مەحوییە.

# بۆ هەڵەبجە(*)

١٩٨٨-٤-٢٢

ئەی گوڵاڵەی خوێن لێ تکاوی نیسان
ئاودراوی بەجۆگەی خوێنی گریان
لەناو گۆڕا چریسکەی دێت برینم
مەشخەڵێکە بۆ ڕۆژگاری ژینم
لەگەڵتان بووم نەسووتام، ئێستە پشکۆم
خەمی ئێوە و خەمی خۆم گرتە ئەستۆم
ئەگەر دووکەڵ هەناسەم بێت بەخوێناو
ئەچنم تۆڕی ئازاری خۆم بە دێراو
هەتا ئەپوێت دەمار و ئێسقانم
بەقوربانی بچوك و گەورەتانم.

*****

(*) ئەم شیعرە بەبۆنەی تاوانی نامرۆڤانەو کارەساتی گورجکبڕی کیمیابارانی خەڵکی شاری هەڵەبجەی خۆشەویستەوە هۆنراوەتەوە کەرژێمی تاوتبارانی بەعس و سەدامی دیکتاتۆر بەرانبەر کورد ئەنجامیاندا ئەم شیعرە بە دەستنووس لە کاك هونەر دیلان وەرگیراوە. سەرچاوەی ئەم شیعرە کاك هونەر دیلانە.

## بۆ نەهرۆی حەسەن فەرەج(*)

من تنۆکی سووری ئەو شاخەم
پەڕەی گوڵی هەڵوەریوی ئەم باخەم
من سووراوی لێوی ئاڵی سەیوانم
ئەو گوڵاڵەی هەتاوگازی کوێستانم
من توێژاڵی برینی ئەم وڵاتەم
ئەرخەوانی تازەچرۆی ئەم کاتەم
(من ڕێبواری ڕێگایەکی گڕاویم)
تەمەن کورتی ژیانێکی خوێناویم
خوێن ڕژاوی بەستەی سووری ژیانم
زوو هەڵفڕی مەلی جەستەی گیانم.
شینی بەستەی بەسەرهاتی گوڵباخم
هەڵوەریوی بێ ڕەشەبام لە باخم
ئازاردیون کەس و کارم بە کۆمەڵ
ئاخ بۆ ئەسرین بەخوڕ بڕژێ بە تۆپەڵ

*****

(*) سەرچاوەی ئەم شیعرە کاک هونەر دیلانە.

## بۆ شەهید نوری حەمە عەلی (*)

برینم ئاگرە شالاوە خوێنم
سەرینم پڕ لە پشکۆیە.. شوێنم
لەڕووی ڕۆژا بەبەرگی ئەرخەوانی
لە توێی نووسراوە نووریم هەر ئەمێنم
ئەمێنم چونکە ڕۆڵەی سووری پشکۆم
بروسکەی ئاڵ و والای دەوری ئاسۆم
لەناو دڵدام، لەناو خوێن و دەمارام
هەتا کوردێ بمێنێ من لە شارام [1]

*****

(*) سەرچاوەی ئەم شیعرە کاک هونەر دیلانە

(1) پێشمەرگەی دڵسۆزو چاونەترسی نەتەوەیی کاکە نوری حەمە عەلی لەڕووداوێکی جەرگبڕدا شەهید کرا.. شەهید کردنی شەپۆلی نیگەرانی بەسەر خەڵکی شاری سلێمانیدا باران.

# زستانی ئاڵ(*)

١٩٨٨

دڵ ئەسووتێ، مەشخەڵێکە گڕگرتوو
وەکو پووشی خەرمانی بەربا کەتوو
پاشماوەکەی چەواڵێکە بێ سووتوو
کانی خوێنە، لەبن نایە وەك مردوو

***

روو لە کوێ کەین؟، کوێ بەرینە بۆ راوێژ
بێ کرمەیە، بێ خرمەیە، کاتی چێژ
هیچ نایگاتێ نەك تفەنگی تۆپ هاوێژ
چاو خۆڵ ئەخوا بەچوار لایا گێژ و وێژ
بەرەو کۆتەڵ رازی تازەی زستانە
لێو رەنگکردن جامخانەکەی دوکانە
هەنار لقی بەسەر سنگا پەخشانە
ئاخ شاخەکان دەست و پەنجەی سەر شانە

***

دەنکی هەنار وەك دڵۆپی گریانە
لەرەی سنگە زڕەی دەست و فنجانە

(*) ئەم شیعرە بەدەنگی دیلان خۆی تۆمار کراوە ولای هونەر دیلانە

دڵ ئەسمرێ، تیر هاوێژیش چاوانە
روو لە کوێ کەین؟، تێشووی ڕێمان فرمێسکە
توێشەبەرەی جەوالێکی پڕ ئێسکە
دڵ هەڵگیرسا پشکۆی زێری تامێکە
گورج لێ ئەدا، خێرا خێرا وەك نێکە

***

زستانی ئاڵ، کێ هاوڕاز و هاوڕێیە؟
کێ بەرهەمی جێچنگی کۆنی پێیە؟
کێ دەماری نەك خلیچکە وەك زێیە؟
ڕێگابڕە کەمەر توندە بەپێیە

***

کێ هاوڕازە، هاونیازە، هاودەردە؟
کوڕی شەوە، ڕۆڵەی ڕۆژە نەبەردە؟
گڕگرتووە نەك سووتاوە وەك بەردە
پشکۆخۆرە، ئاگر هارە، هام فەردە.

***

کێ شینپۆشە، شەوەبەرگە، داماوە؟
جگەر ونە، ئێسقانی داکرماوە؟
سپێنەی چاو جۆگەی خوێنی تێزاوە؟
هاوڕێی منە، پێستە پێشی بەملاوە.

***

کـــێ هاوشـــانه، هاوشـــەقاوە، ســـنگ پانـــه؟
پێـــست ئەســـتووره بـــۆ لێقـــەومان قەڵغانـــه
بـــیری تیـــژه وەك نەشـــتەری دەبانـــه
هـــاوڕێی منـــه، دەم بنێتـــه ئـــەم گیانـــه.

***

زســـتانی ئـــاڵ، زســـتانی ئـــاڵ، کرێـــوه
دایپۆشـــیوە ئـــەو بەردانـــه، ئـــەو کێـــوه
بـــەفرماڵ کـــوا؟، بـــۆ ڕێ بـــڕان لـــەو چـــێوه
کـــوێ بەرزیـــه، ئامێتەیـــه، نـــشێوه؟

***

ســـەردەرکردن لـــەلای هەنـــدێ پرســـیاره
ســـەربەرزێتی ژان هێنـــەره جـــەخاره
گـــوێ ئـــاخنین بـــارانی ژێـــر دەواره
لـــرف لێـــدان، کراوەیـــه بـــەباره.

***

ئـــەی تیـــشکی ڕۆژ، وەی زەردەی شـــاخەکانم
خـــۆ مـــن کـــوردم، هـــەر هـــیچ نـــەبێ ئینـــسانم
چـــاوکراوەی گوڵاڵـــەی گردەکـــانم
پـــەیمانبێ، یـــان گیـــان یـــا نیـــشتمانم.
***

# کورتەیەکی بەسەرهات و ژیانی (دیلان)

- ناوی: (محەممەد ساڵح، کوڕی مەلا ئەحمەدی دیلان ، کوڕی مەلا ساڵح، کوڕی مەلا قادری شەو خوێن)ە .
- بنەماڵەی (دیلان) لە شاری قەڵاچوالان پایتەختی پێشوی ئەمارەتی بابانەوە هاتوون و هەوارگەی نوێی لە پایتەختی تازەی ئەمارەتی بابان (شاری سلیمانی) ئێستا هەڵداوە .
- ساڵی ١٩٢٧ لە گەڕەکی گوێژەی شاری سلیمانی هاتۆتە دنیاوە .
- سەرەتای خوێندنی لەمزگەوتی باباعەلی بووە و دوای ئەوە لە قوتابخانەی خالیدیيە خوێندویەتی .
- خوێندنی تا پۆلی سێی قوتابخانەی ناوەندیی ئەوسا بووە .
- ساڵی ١٩٤٧ بە مووچەخۆر و بە ناونیشانی مەئمور مەخزەن لە دایەرەی توتن (ئینحصار)ی سلیمانی دامەزراوە .
- دوا کاری موچەخۆریی، بەڕێوەبەری ناوخۆی پارێزگای سلیمانی بووە.
- سەرەتایی وەرز و تەمەنی شیعری لەساڵی ١٩٤٨ەوە دەستپێئەکا، ئەو دەمە تەمەنی نزیکەی بیست ساڵێك بووە .

- له ساڵی ١٩٤٧ و له سەردەمی رژێمی پاشایەتی چەپەڵا، لەسەر هاوبەشیکردنی ئەو سەیرانە سیاسییە بەناوبانگەی کورِ و کاڵانی شاری سلیمانی له قەڵاچوالان سازیان کرد بەند کراوە.
- ساڵی ١٩٤٨ بەهۆی هاوبەشیکردن لە خۆپیشاندان و نارەزایی دەربرِین دژی پەیمانی پۆرتسموسی ئیمپریالیزمانە، لەلایەن رژێمی پاشایەتیەوە ئەگیرێ و راپێچی دادگای (مەجلیسی عورفی) ئەکرێ و لەسەر فرمان لائەبرێ و مووچەکەی ئەبرِێ.
- دیسان لە ساڵانی ١٩٤٩ – ١٩٥٠ بەهۆی چالاکی سیاسی و بەشداری له بزوتنەوەی نیشتمانیا له لایەن کاربەدەستانی رژێمی پاشایەتییەوە دراوە بە دادگای (مەجلیسی عورفی) لە بەغا و ساڵێك حوکمی چاودێری بەسەرا دراوە.
- ساڵی ١٩٥٢ لەسەر مۆرکردنی بەیانی (ئاشتیخوازان) گیراوە.
- ساڵانی ١٩٥٣ – ١٩٥٤ دیسان لەسەر ئەوەی ئەندامی وەفدی عیراق و نوێنەری کورد بووە لە کۆنگرەی (میللەتان لە پێناوی پارێزگاری ئاشتی) لەشاری – ڤینا – لە لایەن کاربەدەستانەوە گیراوە و له کونی زیندان تونگ کراوە.
- ساڵانی ١٩٥٥ – ١٩٥٦ لەسەر چالاکی ئاشتیخوازی بۆ ماوەی دووساڵ له بەندیخانەی نوگرەسەلمان گیراوە و دوور خراوەتەوە.
- ساڵانی ١٩٥٦ – ١٩٥٧ دیسان لەلایەن کاربەدەستانی رژێمی پاشایەتییەوە، بەو تاوانەی پشتگیری و لایەنی گەلی عەرەبی میسری کردووە و دژی هێرش و پەلاماردانە سێ قۆڵیەکەی

(ئیسرائیل و بەریتانیا و فەڕەنسا)ی کۆنەپەرست و ئیمپریالیزم بۆ سەرخاکی میسر .. ئەگیرێ و خۆی لەبەردەم دادگای (عورفی کەرکوك)دا ئەبینێتەوە.

- ساڵی ١٩٦٠ دیسان بە تاوانی ئەوەی خەڵکی هانداوە دژی رژێمی دکتاتۆری (قاسم) خۆپیشاندان ساز بکەن .. گیراوە .
- لە ساڵانی ١٩٦٢ – ١٩٦٣ رژێمی قاسم دیسان ئەیگرێت و لەتۆڵەی شیعری رەز حوکمی ئەدات، لە بەندیخانەی (کوت – واسط)) توندی ئەکا .
- لە ساڵی ١٩٦٦ و لە سات و سەردەمی حوکمڕانی رژێمی (عارف)دا گیراوە و راپێچی دادگای (ئاشتی دەوڵەتی) لە کەرکوك کراوە .
- بەخواستی خۆی خۆی(دیلان) خانەنشینەکرد .. لە گەڕەکی تووی مەلیك لە شاری سلیمانی دانیشتووە.

دیلانی شاعیری بەهرەدارو نوێخواز تەمەنی گوڵگەشی زۆریبەدەمەوە مابووە چاوەڕوانی بەخشی تاوازەو داهێنانی هونەری نوێی شیعریی لێئەکرا.. داخی گرانم چنگی تیژی مەرگ بێ بەزەییانەی هەناسەبڕی کردوە لە رۆژی یەکشەممە ١٩٩٠/١١/٢٨ ئەجەلی نەخوازراو رۆحیانەتە پاکەکەی چاوە مەنگ و گەورەکەی سووك لەسەریەکدا ناو بەیەکجاری پێڵوی چاوە مەنگ و گەورەکەی سووك لەسەریەکدا ناو بەیەجگاری ماڵئاوایی لەژیان و شیعرو یارو دۆستەکانی کرد.

***

## نـــاوەڕۆك




# Diwany Şî'r

# Muhemed Salih DÎLAN

Prof . Dr. Ebdulla Agirîn



ساڵی 1987دوای چاپی ( دیوانی شیعر ) برای هێژا و دڵسۆزم کاکە مستەفا ساڵح کەریم دیدارێکی ئەدەبی بۆ ئێستگەی رادیۆی کوردی لە بەغدا لەگەڵ شاعیری مەزن دیلان دا سازکرد... سەبارەت بە بیرورای خودی خۆی بەرانبەر ( دیوانی شیعرەکەی ) پرسیاری لێکرد فەرمووی : (( تا ئێستا کەس وەك عەبدوڵڵا ئاگرین لە ناوەرۆك و لایەنی هونەری شیعری و جوانی بنیاتنانی شیعرەکانم تێ نەگەیشتووە ئا بەو جۆرە جوانە لێکنەدراوەتەوە )).

دیلان / ١٩٨٧

هەروەها مامۆستای هونەرمەندی هەڵکەوتووی کورد کاك ئەنوەر قەرەداغی پاش چاپی ( دیوانی شیعر ) بەخودی عەبدوڵڵا ئاگرینی راگەیاند : (( فەرمووی بەراستی بەشێوەیەکی جوان و سەرسورهێنەر و بە زمانێکی تەڕ و پاراو و هێنانەکایەی وشەی نوێوە لێکدانەوەت بۆ پێشەکییەکە کردووەو پیرۆزە )).

ئەنوەر قەرەداغی/ ١٩٨٧

نرخی هەشت هەزار دینارە